# کورد لە گەمەی دەوڵەتانی زلهێز و حکوومەتانی ناوچەدا

کەریمی حسامی

ستوکهولم ١٩٩٩

***The kurds in political games of the superpowers and regional states***
Av / By:
***Hisami Karim***
Utgivare / Publisher: ***MaediaTech Sweden***

Printerd in Sweden by ***MediaTech Sweden***

**ISBN** 91-88682-10-2

**Beställning / Order:**
MediaTech, Box 138, 631 03 Eskilstuna
Tel. 016-183918 • Fax. 016-183919
E-mail: mediatech@telia.com

**پێناسی کتێب**

ناوی کتێب :

کورد لە گەمەی دەوڵەتانی زلهێزو حکومەتانی ناوچە دا

لە نووسین و ئامادە کردنی : کەریمی حسامی

مۆنتاژ : ناسر ئیبراهیمی

سوید ١٩٩٨

# ناوەرۆک

# سەرەتا

بۆ ڕوونکردنەوە و پشت قایمکردنی ناو ونیشانی ئەوکتیبە کە لە گەڵ چارەنووسی کورد گرێی خواردوە و تائێستاش دەستێک نەبوە ئەم گرێبوچکەیە بکاتەوە، ڕەنگە زۆر پێویست نەبێ بگەڕێینەوە بۆ سەردەم ودەورانی کەونارا و بە شاخ وباڵی ئەمیر و حاکم وئەمارانی کوردی بێدەسەلات وبندەستی ئیمپراتورییەکانی رەسمانی و قاجار هەڵابڵێین و بەو قسانەش خۆ سەرخۆش بکەین کە ئێمەش پاشا ومیر و بەگ و خان و بابە قەولی هێندێ نووسەر و ڕوشنبیری دڵسۆزی کورد(دەوڵەت و حکوومەت و تەنانەت ئیمپراتوری) یشمان هەبوە. چونکە ئەم باسانە هەرچەندی بێژی نووسراون و وەک حکایەت دوویات و چەندپات کراونەوە و شاخ و باڵیان بە بەر داکراوە، بەلام نە هیچ قازانجیان بۆ کورد هەبوە و نە کوردیش هیچیان لێ فێربوە و نە دەرسیان لێ وەرگیراوە. گریمان ئەگەر ئەوانەش هەبووبن، نەک هەر هیچ شوێنەوارێکی کولتوری و نەریتێکی ئاوایان بەجێ نەهێشتوە کە بۆ کورد جێگای شانازی بێ و نموونەی شارستانەتی کورد لە سەر لاپەرەی مێژوو تۆمار بکات، بەڵکوو ڕچەیەکی ئەوتۆی براکوژی و خۆخۆری ونۆکەری بێگانە یان بۆ شکاندووین کە تائێستاش هەروا لە ئاخری سەدەی بیستەمدا، ڕێبەرانی حیزب و بزووتنەوە و ڕێکخراوانی کورد بەسەریدا دەڕۆن و خوێنی لاوانی کورد بۆ ویستی دوژمنانی کورد و بەرژەوەندی تەسکی دەستەیی و حیزبایەتی دەرێژن. کورد تائێستاش بڕیاری بە دەستی خۆی نەبۆە و وەک مۆرەی شەترنج و داشی دامە

کایەی پێکراوە و ئامرازێک بوە بە دەست دوژمنانی نەتەوەکەی خۆیەوە.

ئەم رووداو وبەڵگانەی نووسەرانی کورد بۆ ئیسباتی هوویەت و ناو ونیشانی خۆ لە مەیدانی سیاسەتی نێونەتەوەیی و هاتنە نێوناوان دوای جەنگی یەکەمی دنیاگر پشتی پێ دەبەستن وباسی دەکەن، پەیمانی سیڤر و چەند مادەی ئەو پەیمانەیە کە بە چەشنێکی شل و شەویق و بێ بنەمایەکی پتەو باسی کوردی کردوە و لە ئاکامدا هیچی بۆ کورد لێ پەیدا نەبوە.

هەربۆیەش ئێمە لەم نووسراوەیە دا کە زۆریش روون نیە بە چی حیساب دەکرێ و لە کام خانەی نووسیندا جێدەگرێ، باسەکەمان لە سەردەمی شەڕی یەکەمی دنیاگرەوە دەست پێدەکەین و ئەوەندەی لە تواناندا هەبێ و بەڵگە و دوکومێنتەکان یارمەتی بدەن، روونی دەکەینەوە کە چۆن کورد و مەسەلە نەتەوەییەکەی بۆتە گەمەی نێوان حکوومەتانی داگیرکەری کوردستان و دەوڵەتانی زلهێزیش هەمیشە ویستوویانە مەسەلەی کورد بکەنە ئامرازی پێشکەوتنی سیاسەت و بەرژەوەندی ئابووری خۆیان. رێبەرانی کوردیش قەت لەو سیاسەتە تێنەگەیشتوون و هەمیشە بەرژەوەندی نەتەوەیی خۆیان کردۆتە فیدای قازانجی بێگانە و بەرژەوەندی کاتی حزب و دەستە و تاقمی خۆیان و بە گشتی بەرژەوەندی بالای نەتەوەیی لە بەر چاو نەگیراوە و ستراتیژی رزگاریی نەتەوەیی دانەرێژراوە.

نەگەربڵێین و زۆریش گوتراوە کە بەرلە شەڕی یەکەمی دنیاگر سەرکردایەتی بزووتنەوەکانی کورد بە دەست شێخ و مەلاو سەرۆک عەشیرەتانەوە بوە، دەزگای راگەیاندنی نێونەتەوەیی و زانست و تەکنیک لە رادەی ئیمرۆی جیهاندا نەبوە ، بورژوازی کورد پێ نەگەیشتوە و بازرگانی و ئابووری کوردستان لەو پەری دواکەوتوویی دابوە ، ئەوانە و گەلێک بەڵگە و بیانووی دیکە بکەینە هۆی سەرنەگەوتنی بزووتنەوەکانی کورد لە رابردوودا، خۆ دوای شەڕی دووەمی دنیاگر ئیتر ئەم هۆیانە بایەخێکی ئەوتۆیان نامێنێ کە پشتیان پێببەستین. جامەگەر بۆ خۆ پەراندنەوە و یاخۆ خاپاندن دیسان هەموو سەر و بنی بۆ چوونەکانمان هەر بێنینەوە سەر ئەم بەیت و باوانە و ماوەیەکی دیکەش کۆمەلانی خەڵکی پێ هێور و

ئارام بکەین و ڕووناکبیرانی کوردیش ئەرکی خۆیان هەرلەم چوارچێوەیەدا تەنگە بەربکەن و چاولە واقعیەت بپۆشن و لە ئاست ڕوونکردنەوەی ڕاستییەکان نوکی قەڵەمیان هەڵنگوێ و جار و بار ڕاستیەکانیش ئاوازوو بکەنەوە. ئەگەر وانەبێ گۆڕانێکی ئەوەندە گرنگ و قوڵ بەسەر هەموو بەشەکانی ژیانی ئادەمیزاد وپێوەندیەکانی نێونەتەوەیی و ئامراز و تەکنیکدا هاتوە، هەموو حیسابات و بۆچوونەکانی ڕابردووی تێکداوە. کوردەواریش تاڕادەیەکی زۆر لە پریشکی ئەم گۆڕانکاریانە دوور نەبوە. بزووتنەوەی کورد لە دەست شێخ و سەرۆک عەشیرەت ودەرەبەگ هاتۆتە دەر و کەوتۆتە دەست ڕووناکبیر و حیزبی بە ڕواڵەت شۆڕشگێڕ و ڕێکخراوی سیاسی، خوێندەواریی خەڵکیش پەرەی سەندوە و بیر و هزر و تێگەیشتنی کۆمەڵانی گەل تاڕادەیەکی زۆر گۆڕانی بە سەردا هاتوە.

بەڵام لە گەڵ ئەم گۆڕانکاریە و لە ئاخری سەدەی بیستەمیشدا، مەسەلەی کورد دیسان هەر لە جەغزی گەمەی نێودەوڵەتاندا ماوەتەوە و هەر وەک خۆی لە چوارچێوەی بەرژەوەندی سیاسەتی زلهێزەکاندا ئەمبەرئەوبەر و دەستاودەستی پێدەکرێ. ڕێبەرایەتی حیزبەکان و ڕوشنبیرانی سەردەمیش نەیانتوانیوە ڕازی ئەم مەتەڵ و تەلیسمە بدۆزنەوە و هەوساری مەسەلەی کورد لە دەست داگیرکەران بێننەدەر و بیگرنە دەست خۆیان و بەپشت ئەستوری کۆمەڵانی خەڵکی کورد بەرە و قۆناخی سەرکەوتن هەنگاو بنێن.

بۆ ئەوەی درێژە بە دەربڕینی زیاتری ئەم دەرد وداخە نەدەین کە زۆر لە نووسەر و ڕوناکبیر و کەسایەتی نیشتمانی و دڵسۆزانی گەل زیاتر و بە پەرۆشترە وە دەریان بڕیوە و دووپاتیان کردۆتەوە و نەگەیشتوونەتە ئاکامیش، دێینە سەرئەسڵی ئەم مەبەستە کە وا لەسەری داوم خۆی پێوە خەریک بکەم و بەڵکوو بتوانم چەند دێڕێک لەم نووسراوانە زیادبکەم کەتائێستا هاتوونەتە سەرکاغەز و بڵاوکراونە وە و هیچ دەرسێکشیان لێ وەرنەگیراوە. وەک لە بەراییدا باسکرا ج حەوجێتیش نیە مرۆڤ بگەڕێتەوە بۆ باسی خەبات و ڕاپەڕینەکانی سەدەی ١٨و ١٩ و ئەنجامەکانیان و وەک حکایەتیش بیانگێڕێتەوە. بۆیە وام دانا لە شەڕی یەکەمی

دنیاگرەوە سەرپێیی بەسەرکارەسات و ڕووداوەکاندا بێم و خۆ بگەیەنمە قۆناخی ئێستای بزووتنەوەی کورد کە فەرمانی کەشتی یەکەی بە دەست حیزب و ڕێبەرانی ژیر و خوێندەوار و ڕووناک بیرەوە لە گێژاوی خۆ خۆری و خۆبە زلزانی و گەل نەویستیدا دەخولێتەوە و بەرە وتوقم بوونی یەکجاری دەبەن.

بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، واتە شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی بە سەرهاتەکان بەرلە هەموو شت بەڵگە و دوکۆمێنتی بڕواپێکراو پێویست بوون. ئەوانەش زیاترلە ئەرشیڤی وەزارەتخانەکانی ئێران و تورکیا و تەنانەت عیراقیشدا دەست دەکەون کە بە داخەوە نووسەری کورد کەمتردەستی پێیان ڕادەگات . هەر بۆیەش توێژینەوەکان ناتوانن ڕوو داوەکان بە ڕاستی و بابەتی بخرێنە بەر دەستی خوێنەرانی کورد.

بەخۆشییەوە لەم دواییا نە دا کتێبێکم دەست کەوت بەناوی(شۆڕشی کوردەکانی،تورکیا و تەئسیری لە سەر پێوەندی یەکانی دەرەوەی ئێران)لە نووسینی ئاغای **«کاوە بەیات»**. ئاغای بەیات کە نووسەر و لێکۆڵەرێکی ناسراوی ئێرانیە، دەستی کەوتە کەلێک بەڵگە و نووسراوەی بڵاونەکراوەی وەزارەتی دەرەوەی ئێران و هێندێ بەڵگە و دوکومێنتی ئەوتۆ کە تاڕووخانی ڕێژیمی پاشایەتی لە دەفتەری تایبەتی شای ئێراندا ڕاگیراون وکەس نەیتوانیوە دەستیان بگەیێنێ. دوای شۆڕشی گەلانی ئێران ساڵی ۱۹۷۹ ئەم بەڵگە و نووسراوانە بۆ یەکێ لە بنیادەکانی ئەرشیوی کیشوەری گوێزراونەوە . وەک ئاغای بەیات دەنووسێ، ئەم بەڵگانەی لە۲٥٤دەوسیەدا دوزیومەتەوە و« لە بواری شارەزابوونی مەسەلەکانی ئێران لە سەردەمی ڕەزاشادا گرنگی تایبەتیان هەیە.»

پاش خوێندنەوەی ئەم کتێبە گەیشتمە ئەو بڕوایە کە وەرگێران و بڵاوکردنەوەی ئەم بەشانەی کە ڕاستە وخۆ پێوەندیان بە مەسەلەی کوردەوە هەیە و سیاسەتی حکوومەتەکانی ئێران و تورکیا و هەڵوێست و سیاسەتی دەوڵەتانی ئینگلیز وسۆڤیەتی پێشوو سەبارەت بەکێشەی کورد دەر دەخەن، بۆخوێنەرانی کورد ڕەنگە زۆرلەوە بە نرخترو سود هێنەر تر بێ تاباسێکی ڕەمەکی و بێ بەڵگە و دوکومێنت

وەک حکایەت بەناوی مێژوو بنووسرێ و بڵاو بکرێتەوە وەک هێندێ لە فەریکە سیاسی کورد دەستیان داوەتێ.

دەڵێم :(ئەم بەشانەی کتێبەکە). چونکە گەلێک لاپەڕە و شوێنی ئەوتو لە کتێبەکەدا هاتوون، پێوەندیان بەمەسەلەی کوردەوە نیە و تەنیاباسی پێوەندی نێوان ئێران و تورکیادەکەن و زۆریش بە کەلک و سەرنج ڕاکێشن، بەلاّم هێنانیان بۆ نێو ئەم باسە دەبێتە درێژ دادڕی و زیاد بوونی لاپەڕە و ڕەنگە بۆ خوێنەری کوردیش سوێکی ئەو تۆیان نەبێ

لە وەرگێڕان و ئامادە کردنی نووسراوەکانی ئاغای کاوە بەیات دا ، وەرگێڕ توشی هێندێ نووسراو و مەبەستی ئەوتۆ دەبێ کە دەربڕینی بیر و ڕای خۆی لە سەریان بە پێویست دەزانێ، ئەمانەلە پەراوێز دا جێکراوونەوە بە ڕاشکاوی دەڵێم کە نووسراوەکانی ئاغای کاوە بەیات بە ئەمانەتێکی تەواو و( ئازاد) کراون بەکوردی( نەک وەرگێڕان)، لە بەر ئەوەی نووسینەکەی ئاغای کاوە بەیات لە ڕاپەڕینی شێخ سەعیدی پیرانەوە دەست پێدەکا، وایە باش زانرا بەر لە وەی بگەینە سەر وەرگێڕانی نووسراوەکەی ئاغای بەیات، بە کەلک وەر گرتن لە نووسراوە و بۆچوونی هێندێ زانا و شارەزای کورد و بێگانە، بەرکولێک لە بزووتنەوە و ڕاپەڕینی کوردەکان دوای پەیمانی سێڤر هەڵبێنجین و پاشان بچینە سەر نووسراوەکەی ئاغای بەیات و بە دوای ئەویشدا باسەکەمان بە کورتەی توانا تا کۆتایی شەڕی دووهەمی دنیا کر درێژە پێدەدەین،

# پەیمانی سێڤر و چارە نووسی کورد

ڕەنگە بتوانین بڵێین کە دوای شەڕی یەکەمی دنیاگر، پەیمانی سیڤرخاڵێکی وەرچەرخانە لە مێژووی سیاسی و دیپلۆماسی نەتەوەی کورددا. بەم ئیعتبارە بۆ هەوەڵجار مەسەلەی کورد وەک مەسەلەی نەتەوەیەکی هەبوو، بەلام بێبەش لە مافی نەتەوایەتی دێتە نێوکۆبوونەوە و کۆنفرانسی دەوڵەتان و دەبێتە مەسەلەیەکی نێونەتەوەیی و باسی لە سەردەکرێ و لە چەند بەندی پەیمانی ناوبراودا جێی دەکرێتەوە. بەلام بە داخەوە هیچ دەستکەوتێکی بۆکورد بە دواوە نیە و هەرلە ڕێوە مەسەلەی کورد دەبێتە گەمەی دەوڵەتانی زلهێز و لە چوارچێوەی بەرژەوەندی سیاسی و ئابوری ئەم دەولەتانەدا دەخولێتەوە و یاری پێدەکرێت.

لە سەر چۆنیەتی پێکهاتن و ئامانج و نێوەرۆکی ئەم پەیمانە و بەرهەم و ئاکامی بۆکورد زۆرنووسراوە. ڕەنگە هیچ مێژوو نووس و یاتوێژەرێکی کورد نەبێ کە هاتبێتە سەرنووسینی گۆشەیەکی مێژووی خەباتی گەلی کورد، ئاوڕێکی وەسەر پەیمانی سێڤر نەدابێتەوە و بە گوێرەی بۆچوونی خۆی لێکی نە دابێتەوە و باسی نەکرد بێ. هەربۆیە لەم نووسراوەیەدا هیچ شتێکی زیادی و تازەی ئەوتۆنایەتە بەر چاو کە خرابێتە سەرنووسراوەی نووسەرانی دیکە و وەک هێندێ نووسراوە بێ بەڵگە و دۆکۆمێنت کرا بێتە حکایەت. هەر چۆنێک بێ هاتمە سەر ئەو بڕوایە بۆ

خاڵی نە بوونی شوێنی پەیمانی ناوبراو لە نێو باسەکەی ئێستادا. لە بۆچوون و نووسراوەی چەند نووسەرێکی کورد و بێگانە کەلک وەرگرم بەڵکوو ڕووناکیەکی زیاتر بخرێتە سەر نێوەرۆک و مەبەستەکانی پەیمانی سیڤر و بۆ چوونی هێندێ نووسەری کورد کە زیاتر لە پێویست بایەخی پێدەدەن..

دوکتورعبدالرحمانی قاسملو لە باسی پەیمانی سیڤردا پاش هێنانی بەندەکانی (٦٢و٦٣و٦٤)ی پەیمانی ناوبراو دەنووسێ:

«.... لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە پێش کە بەریتانیا و فەرانسە ئەو دوو دەوڵەتە ئیمپریالیستە کە سەرۆکایەتی پەیمانی سیڤریان دەکرد، چۆن بەوە ڕازی بوون کە کوردستانێکی خودموختار دابمەزرێ، کە لە وانە بوو پاشان سەربەخۆییش وەربگرێ. ئایا بەریتانیا و فەرانسە وەک بە ڕواڵەت دەیانگوت، بە ڕاستیش دەیانویست گەلی کورد بە پێی چاردە بەندەکەی پێشنیاری ویلسون مافی دیاریکردنی چارەنووسی خۆی وەدەست بێنێ.؟

نیازی ڕاستەقینەی ئەو دوو دەوڵەتە ئەوە بوو کە بەرگری لە بڵاوبوونەوەی شۆڕشی مەزنی سۆسیالیستی ئوکتۆبر بکەن. دەیانویست دەوڵەتێکی پاشکەوتووی دەرەبەگایەتی دروست بکەن، کە تورکیا و ڕووسیای سۆسیالیستی لێک جیابکەنەوە وببێتە نوختەیەکی ستراتیژی دژی یەکێتی سۆڤێتی لە نیزیک کانگاکانی نەوتی قەفقاز. لە لایەکی تریشەوە ئیمپریالیستەکان لە هاوکاری نێوان کوردەکان و کەمالیستەکان تۆقی بوون، و بە و نەخشەیە دەیانویست ئەنادۆلی ڕۆژهەڵات(یانی کوردستان)کەخەڵکەکەی پشتیوانی کەمالیستەکان بوو، جیابکەنەوە، و بەو جورە جێگایان پێ لێژبکەن. بەریتانیاکان کە دەستی باڵایان لە پەیمانەکەدا هەبوو، پێیان وابوو کە ئەگەر دەوڵەتێکی ئاوا دابمەزرێ، ڕاستەو خۆ لە ژێر سەرپەرستی بەریتانیادا دەبێ. دیارە بەریتانیا دەیویست ویلایەتی مووسڵیش لە تورکیاجیابکاتەوە و بیخاتە ژێردەسەڵاتی خۆیەوە، بە تایبەتی کە نەوتیشی لێدۆزرابۆوە. لە ڕاستیدا مەبەست لە پەیمانی سیڤر بچڕبچڕکردنی ئیمپراتوری عوسمانی بوو، بە جۆرێک کە ئەو دەوڵەتانەی دادەمەزرێن، ڕاستەو خۆ یاناراستەو

خۆ له ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتە ئیمپریالیستەکان دابن....... بەمجۆرە پەیمانی سیڤر ئەوەندە زیاتر کە بۆ یەکەمجار لە پەیمانێکی ناونەتەوایەتی داباسی مافەکانی گەلی کورد کراوە، قازانج و بایەخێکی بۆ کورد نەبوو، و گەلی کورد لەو پەیمانە کە هەر بە مردوویی لە دایکبوو لە وەزیاتری پێ نەبرا.(١)

کەندال نزان لە نووسینێکی خۆیدا بەناوی (کوردەکان لە ئیمپراتۆری عوسمانی)دا لە شیکردنەوەی پەیمانی سیڤردا دەنووسێ :

«..... پێش باسی سنوورەکانی دیاریکراو لە مادە٦٢ و چۆنیەتی ئەم کوردستانەی کە دامەزرانی ئەو لە پەیمانی سیڤردا پێش بینی کرابوو، وەبیرهێنانەوەی ئەم نوکتەیە جێگای سەرنجە کە چارەنووسی ویلایەتی مووسڵ لە چارەنووسی کوردستان جیاکرابۆوە. کاتێ سەبارەت بە ویستی خەلک بۆ لکان بە وڵاتی کوردستان،راوێژلەگەڵ خەڵک دەکراکەئەم کارە ئەنجام درابا. (واتە وڵاتەکوردستانەکە دامەزرابا. ک. ح )

ئەگەر(زۆربەی خەڵکی ئەم ناوچەیە) ویستبایان(لەتورکیا جیابنەوە)کاتێ دەیانتوانی ئەو کاربکەن، کە شورای(کۆمەڵی نەتەوەکان) زانیبای کە (لێهاتوویی سەربەخۆییان هەیە) ئەگینا داوا لە بەریتانیا دەکرا کە سەرپەرشتی ئەم ناوچەیە وەئەستۆ بگرێ. بەلام سنوورەکانی ئەم وڵاتە گریمانی یە ـــ زۆر لە سەر زەمینەکانی کورد نشینی هەڵکەوتوو لە رۆژئاوای فرات، ناوچەکانی وەک: ئادیامان، مەلاتیە، ئەلبوستان، دارندەودورک، بە دڵخواز لەم وڵاتە جیاکرابوونەوە. رێککەوتنی د.د.ی ئاوگوستی ١٩٢٠لە نێوان بەریتانیا و فەرانسە و ئیتالیا وای دادەنا کە ئەم ناوچانە بە «حەوزەی قازانجی تایبەتی فەرانسە» بلکێنرێن. مادەی ٢٧ (بەشی دووەم، خاڵەکانی ٢و٣) نەک هەرناوچەی (کورد داغ) چیای کورد و ئەم بەشە لە دەشتی جزیرە کە ئێستا بۆتە بەشێک لە سوریا رەگەڵ سوریای ژێر سەرپەرشتی فەرانسە دەخست، بەڵکوو شارەکانی کیلیس وعەین تەب و برجک و ئورفە و ماردین و نسیبەین و جزیرەشی بەو خاکەوە دەلکاند. ئەم دوو ناوچە یە کە راستەو خۆ، یالە لاوەرا دەبوونە بەشێک لە ناوچەی ژێر سەرپەرشتی فەرانسە،

سێ یەکی خاکی کوردستانی عوسمانیان دەگرتەوە......

کەوابوو ئەم (کوردستانە سەربەخۆیە)ی کە لەو پەیمانەدا پێش بینی کرابوو، لە ڕاستیدا وڵاتێک بوو کە دووبەشی خاکەکەی لێ جیاکرابۆوە، لە وانە ناوچەی بە ڕێژەو و لەوەرگای سوننەتی دیکەش وەلابنێین لە کوردستانی ئێران ـــ بۆ ئەم وڵاتە سەروکلک هەڵپاچراو وناتەواوە، جگە لە ناوچەی هەزارەکان چیتری نامێنێتەوە.: خارپوت ، درسیم (تونجلی)، هەکاری و سیرت ، لە گەڵ دیاربەکر وەک پێتەخت و ولایەتی مووسڵ وەک ناوەندی ئابووری ئەوـــ دیارە ئەوتی ئەوێ لە ژێر زیرەوانی بەریتانیادا دەبوو. ئەگەر بڕیارەکانی ئەو پەیمانە گەیشتبانە جێ، خاکی کوردستان بە پێنج بەش دابەش دەکرا : لە ڕۆژئاوا فەرانسە؛ لە باشور سوریا ،لە ڕۆژهەڵات ئێران؛ لە باکور ئەرمەنستان؛ کوردستانێکی سەربەخۆش لە ناوەند. بە سەرنجدانی ئەومەبەستانەجێگای سەرسوڕمانە کە بەرمیەک لە ناسیۆنالیستەکانی کورد پشتیان بەم پەیمانە ناداد وەرییە بەستوە و دەبەستن هەروەها ئەوەی وەک دان پێدانان بەمافی نەتەوەی کورد لە مەیدانی نێونەتەوەییدانیشان دەدەن.

پەیمانی سیڤر کە مەبەستەکەی لەتکردن و دابەشکردنی وڵاتەکانی بەردەستی عوسمانی بوو، نەک هەر بۆ خەڵکی تورک پەیمانێکی نارەوا و سەرشۆڕانەبوو، بەڵکوو سووکایەتی بوو بە گەلی کوردیش. دوای لە بەریەک بڵاوبوونی ئیمپراتوری عوسمانی، تەواوی نەتەوەکانی ژێردەستی ئەو، توانیان حکوومەتی سەربەخۆی خۆیان دابمەزرێنن. تەنیا خەڵکی کورد لەم قایدەیە بەدەربوو. هۆی ئەم کارەش بە گشتی لێ نە هاتوویی سیاسی و دواکەوتوویی مێژوویی ڕێبەرانی کوردبوو. لە ئەنجامدا کوردەکانی عوسمانی لە نێوانی سێ دەوڵەتی تازە دامەزراو دا بەشکران: تورکیا، عیراق، و سوریا. (٢ )

نووسەری فەرانسەیی(کریس کۆچێرا) بێ ئەوەی خۆی زۆر بە پەیمانی سیڤرەوە هیلاک بکا دەنووسێ: «.....لە کۆنفرانسی ئاشتی کە ١٨ی ژانویەی ١٩١٩لە پاریس بەسترا بەریتانیای گەورە و فەرانسە سەبارەت بە لەتکردنی

ئیمپراتوری عوسمانی بەتوندی چەقەیان بوو؛ بۆ ئەوەی گوێ بدەنە ویستی کوردەکان. لە کاتێکا وڵاتی کوردەکان بوو فەرانسە و ئینگلز کێشەیان لە سەردەکرد. کوردەکانیش کە دەموو قسە و بەیاننامەکانی پریزیدێنت ویلسن یان لە باردی مافی نەتەوەکان لە دیاری کردنی چارەنووسی خۆیان لە بەرگردبوو، لە بوونی ئەمریکاییەکانیش پشتیوانیکیان نەدیتەوە کە بە هیوای بوون. ئەندامانی کومیسیۆنی ئەمریکایی بە ناوی کومیسیۆنی لێکۆڵینەوەی(کینگ کرین)چوونە سوریە و فوستەنتەنیە، بەڵام ئاوریان وەسەر بەین النهرین و ئەناتۆلی نەدا.

زلهێزەکان بۆ گەیشتن بە پەیمانی سیڤر(١١ی ئاوگوستی ١٩٢٠)ئەم کوتە کاغەزە هیچە و ئەم مەلێتکە بە مردوویی لە دایک بود، ساڵ و نیوێک پێکەوە چەنەیان لێدا، تازە ئەوە پەیمانێک نەبوو کە بتوانێ مەسەلەی ڕۆژهەڵات چارە سەربکات. بەڵام بە بڕوای دەستەیەکی زۆر لە کوردان، ئەم پەیمانە دەوڵەتی ئیعترافە بە بوونی ئەوان لە لایەن کۆمەڵی جیهانییەوە. پەیمانی سیڤر کە دیمەنێکی لە خودموختاری و سەربەخۆیی لە دوورەوە بە کوردەکان نیشان دەدا، لە ڕاستیدا وەک ڕاگەیاندنی ئازدبوونەوەی ژیانی تورکیابە ڕێبەرایەتی مستەفاکەماڵ و لە دایکبوونی عیراق بوو لە ژێر حکوومەتی مەلیک فەیسەل دا »(٣)

دوکتور مارف ئەمەرگۆڵ لە ڕوانگەی یاسای نێو دەوڵەتانەوە لە پەیمانی سیڤر دەکۆڵێتەوە و بە جوانی هێز و حوکمی ئەم پەیمانە شی دەکاتەوە و دەنووسێ:«.... سەرکەوتنی کەمالییەکان لە شەڕدا بوو هۆی ڕەتکردنەوەی پەیماننامەی سیڤر، ئەو سەرکەوتنەش بە ئاگربەسی مۆدان لە١١/١٠/١٩٢٢ پێگەی خۆی داکوتا، کە لە نێوان تورکیالە لایەک و بەریتانیا، فەرەنسە و ئیتالیا لە لایەکی ترەوە بەسترا. پاشتریش لە١٢/١٠دا یۆنان هاتە پاڵیان. ئاگربەسی مۆدان دانپێدانانێکی داوبەشی وڵاتانی داوپەیمانە بە حکوومەتی ئەنقەرەدا، ئەمەش ڕەتکردنەوەیەکی داوبەش و تەواوی سیڤرە و زەمینە خۆشکردنە بۆکۆنفرانسی لۆزان...» (٤)

درک کینان- یش لە کتێبی کوردستان و کوردەکانی خۆیدا ئاورێکی وەسەر پەیمانی سیڤر داوە و دەنووسێ: «... پەیمانی ئاشتی کە لە شاری سیڤر لە لایەن

نوێنەرانی هاوپەیمانان و سوڵتانی وەسمانیدا واژۆ کرا، پێکهاتنی کۆمیسیۆنێکی پێشبینی دەکرد کە دەبوایە کەلاڵەیەک بۆ خودموختاری ناوچە کورد نشینەکانی رۆژ هەلاتی فرات و خوارووی ئەرمەنستان و سەرووی سوریا و ناوچەی نێو چۆمان( بین النهرین) ئامادە بکا. دەوڵەتی قوستەنتەنیە بەڵێنی دا بریارەکانی کومیسیۆن بە جێبەجێ بکا و ئەگەر هاتو لە ماوەی ساڵێکدا کوردەکان داوای دامەزرانی دەوڵەتێکی خودموختاریان کرد و کۆمەڵی نەتەوانیش ئەوانی بە شایانی ئەو کارە زانی، رێگا بدا دەوڵەتێکی خۆدموختار دابمەزرێت. بەلام ئەو پەیمانە هێندێ بەند و بریاری تێدا بوون کە تورکیای دەکردە کۆلۆنی هێزە مەزنەکانی ئۆرووپایی. نەتەوە پەرستەکانی تورک بە رێبەرایەتی مستەفا کەمال ئەم پەیمانەیان قبوڵ نەکرد کە نوێنەرانی دەوڵەتی پوشالی ئەستەمبول ئیمزایان کرد بوو. شەری سەربەخۆیی تورکیا دەستپێکرا و تورکەکان سەر کەوتن. هاوپەیمانەکان بە ناچاری پەیمانێکی دیکەیان واژۆ کرد کە بە پەیمانی لۆزان ناسراوە و لەوێدا ئیتر ناوی کوردان نەهاتە بەرباس»(٥)

لاوازی و بێبنگەهی پەیمانی سێڤر لەوەدا خۆی دەنواند کە ئەو پەیمانە لە گەڵ حکومەتی تێشکاو و بێدەسەلاتی سوڵتانی (خەلیفەی ئیسلام) هاتبوە سەر کاغەز و پشتیوانێکی پتەوی نەبوو. جگە لەوە وەفاداری کوردان بە حکومەتی ئیسلامیی وەسمانی و بە خەلافەت بەرچاوی تێگەیشتن و ئەقڵی سیاسی رێبەرانی کوردی گرتبوو. تورکیش بۆ راکێشانی هاوکاری کوردان هەوڵێکی زۆریان دەدا و تارادەیێکیش لەم تەقەلایەدا سەرکەوتبون. هەر وەک خوا لێخۆشبوو ماموستا رەفیق حیلمی دەڵێ: «...مستەفا کەمال هەر وەکو لەناوچەی شەری سەربەخۆیی ولاتا یاری بە کەللەی دوژمن ئەکرد، لە مەیدانی سیاسەتیش توانی کە یاری بە عەقڵی کورد بکا. لە هەڵبژاردنی تازە مەبعوسانا سێ یەکی (نایب) مکانی لە کورد هەڵبژێرێ و ئەمانە لە ( مەجلیسی گەورەی میللەت) دا لە ئەنقەرە تەمسیلی کوردیان ئەکرد. ئیتر چییان ئەویست؟ بەم سیاسەتە ژیرانەیە مستەفا کەمال گرەوی بردەوە و بۆ ئەو رۆژە کوردەکانی فریودا و ژێری کردنەوە. هەر بەم

سیاسەتەش بوو کە توانی دوای ئەوەی کوردەکان لە خۆی نزیک بخاتەوە و لە تەقەلا بۆ کوردستان دوایان بخا و ساردیان کاتەوە. دەوڵەتە سوێند خۆرەکانیشی لە مەسەلەی کورد پەشیمان کردەوە.»(٦)

پەیمانی سێڤریۆ کوردەکان لە ڕاستیدا نەک هەر داد پەروەرانە نەبوو، بەڵکوو سوکایەتیش بوو بە ئامانجی ئەوان «.... لە مادە ٩٨ی ئەو پەیمانەدا کە پێکهێنانی دەوڵەتی ئەرمەنستان پێشبینی دەکات( بەشی شەشەم : ئەرمەنستان) گوتراوە:« ..ئەرمەنستان و ئیمزاکەرانی تری ئەو پەیمانە قبوڵ دەکەن کە سنووری نێوان ئەرمەنستان و تورکیا لە ویلایەتی تەرابوزان، ئەرزەرۆم، وان و بیتلیس بکەوێتە بەر داوەری سەر کۆماری وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا. ئیمزا کەرانی پەیمان بەرئۆدە دەبن کە هەر بڕیارێکی سەر کۆماری وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەم بارەوە بیدا و هەر هەنگاوێکی کە ناو براو سەبارەت بە دەست پێڕاگەیشتنی ئەرمەنستان بە دەریا و غەیرە نیزامیکردنی هەر یەک لە ناوچەکانی دراوسێی سنوورەکانی ناو براو بسپێرێت، قبوڵی بکەن» بەمجۆرە وەک دەزانین پرێزیدێنت ویلسۆن بە ئاشکرا لە ئەسڵی مافی دیاریکردنی چارە نووس کە خۆی ڕایگەیاند بوو، پاشگەز بۆوە. سەر کۆماری ئەمریکا بەمکارە بێ ئەوەی پرسێک بە خەڵکی ناوچەکانی ناوبراو بکرێ و یا پێکهاتوویی ڕەگەزی خەڵکی ئەم ناوچانە دیاری بکرێن، سەر زەمینێکی زۆری کە زۆربەی دانیشتوانی کورد بوون - ناوچەکانی وەک: موش، ئەرزنجان، بنگول، بیتلیس، وان، ئاگری، قەرد کلیسا، ئیگدر و ئەرزەڕۆم- واتە بەشی گرنگی کوردستانی تورکیای دا بە ئەرمەنستان.

بەم پێیە ئەم ناوەندەی کە بە گوێرەی ئەو پەیمانە دەبوایە پێک بێت، مەڵبەندێک دەبوو کە دوو بەشی سەر زەمینەکانی لێ جیا کرا بۆوە. ئەو مەڵبەندە بریتی دەبوو لە؛ ناوچە نەقیرەکانی خارپوت، دەرسیم( تونجەلی) هەکاری و سیرت لە گەڵ دیار بەکر ڕەگ ناوەند و ویلایەتی موسلیش وەک ناوەندی ئابووری ئەو. حەوزە نەوتیەکانیش دیارە ببوونە هی بەریتانیا. فەرانسەش سەر پەرشتی سوریای گرتبود ئەستۆی خۆ و بەشێکی جزیرەشی پچڕیبوو. بەمجۆرە کوردستان لە نێوان

عیراق و تورکیا و سوریا و سۆڤیێت دابەشکرا...» (٧)

رەنگە پێویست نەبێ زیاترلەوە لە سەرباسی پەیمانی سیڤر بڕۆین کە لەبەر لێ نەهاتوویی و ناکۆکی نێوان رێبەرانی کورد کە تائیمڕۆ بەردەوام بەباڵایان براوە، هیچی بۆ کورد لێ وەدەست نەهات و هەر وەک گوترا مەسەلەی کورد بوویە گەمەی نێو دەوڵەتانی زلهێز و تائێستاش ئەم گەمەیە هەر بەردەوامە. بە دوای پەیمانی سیڤر و دابەشکردنی دوو بارەی کوردستان دا، مەسەلەی کورد لە نێو پەروەندەی کۆنفرانس و کۆنگرەی نێو دەوڵەتان دەخرێتە دەرەوەو وەک مەسەلەیەکی نێوخۆیی حکومەتانی داگیرکەر ئەمجارە لە نێوان ئەواندا گەمەی پێدەکرێ و دەستی دەوڵەتانی زلهێزیش لە پشتی پەردەی ئەم سناریۆیە هەرلە کاردایە و بە گوێرەی بەرژەوەندی خۆی هەڵیان دەسوڕێنێ.

# راپەڕینی شێخ مەحمودی حەفید

دوای پوچانەوەی بەند و بڕیارەکانی پەیمانی سێڤر، بەهۆی پێکهێنانی پەیمانی نگریسی لۆزانەوە، کە ٢٤ی مانگی یولی سالّی ١٩٢٣ لە نێوان دەوڵەتانی بەریتانیا و فەرانسە وئیتالیا وژاپون و یونان و رومانی و تورکیا و... واژۆ دەکرێت ، ئیتر مەسەلەی کورد و مافی کورد بە جارێ دەخرێتە پشت گوێ«... چونکە پەیمانی لۆزان کە لەدوای پەیمانی سێڤر بەسترا شتێکی وای بۆ کورد تیا نەبوو، لە خەڵەتاندنی کورد زیاتر بە چەند بەندێکی پوچ و جارێکی تر بە هۆی ئەو پەیمانەوە دەوری خوێناوی کورد دەستی پێکردەوە» (٨)

پاش ئەو پەندەی بە سەر کوردیان هێنا، لە خوارووی کوردستان بە ڕێبەرایەتی گەورە پیاوی کورد شێخ مەحمودی حەفید سەر هەڵدانی کوردەکان بۆ دامەزرانی دەوڵەتێکی کوردی دەست پێدەکا. ڕاپەڕینی شێخ مەحمودی نەمر بە چەند قۆناخی پڕ لە هەوراز ونشێودا تێدەپەڕێ. دەسکەوتی گەورە وەدەست دێنێ، توشی نسکۆ و تێشکان دەبێ، دەکەوێ و هەڵدەستێتەوە، بەلام لە ئاخردا دەکەوێتە نێو تەڵە و داوی حکومەتی شۆڤێنیستێ فیلاوی تورک و سیاسەتی بەند بازی و بێ پەیمانی ئینگلیز و ڕاپەڕین توشی هەرەس و تێشکان دێت. شێخ مەحمودی نەمر لە سەرەتاوە بە بێ لە بەر چاو گرتن و لێکدانەوەی سیاسەتی جیهانی و هەڵسەنگاندنی هێزەکانی ناوچە و نێو نەتەوەیی، بە بێ دارشتنی ستراتیژی و بە ڕێوە بردنی سیاسەتێکی ورد و دوور بینانە، زیاتر لە سەر بناخەی داب و نەریتی سیستمی عەشایری، شۆڕش دەست پێدەکات. لە وەش سەیرتر پشت بە یارمەتی

پشتیوانی حکوومەتی تورک دەبەستێ کە سەدان ساڵ بە ناوی ( ئیسلام و خەلافەت) کوردیان کوشتوە و چەوساندۆتەوە. تەنانەت بڕوای شێخ مەحمود بە تورک دەگاتە رادەیەک بە قەولی کریس کۆچیرا کە لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیای وەر گرتوە«...لە گەڵ سەرهەنگ عەلی شەفیق ناسرلو بە ئوزدەمیر دەست بە گۆڕینەوەی نامە دەکات و پێی دەڵێ:« ئامادەیە لە ڕێگای ئەرتەشی تورک دا گیان فیدا بکات و رادەگەیێنێ کە لە جیاتی سەر بەخۆیی ئامادەیە خود موختاری ژێر سەر پەرشتی تورکیاش قبوڵ بکات.»

لە سەر راپەڕین و خەبات و قارەمانەتی شێخ مەحمودی نەمر و بزاڤی رزگاریخوازی کورد لە خواروی کوردستان، نووسەرانی خۆماڵی و بێگانە زۆریان نووسیوە و بیرو ڕای جیاوازیان دەربڕیوە. لە یادداشتەکانی ماموستا رەفیق حلمی و ماموستا ئەحمەد تەقی وماموستا ئەحمەد خواجە و هیتردا، ڕووداوەکانی نێو راپەڕین و هەڵوێستی سەرەک عەشیرەتانی کورد بەرانبەر راپەڕین و پێوەندی شێخی نەمر بە ئینگلیز و تورک و کارەساتی شەڕ و شکانی راپەڕین بە درێژی باسکراوە. ماموستا محەممەد رەسوڵ هاوار لە دوو بەرگی ٩٠٠ لاپەڕەییدا سەر بردەی شێخ مەحمودی لە بنەماڵەوە تائاخرین ڕۆژەکانی ژیانی هێناوەتە سەر کاغەز و زەحمەتێکی زۆری لەگەڵ کێشاوە. بە تێڕوانینی نووسراوەکان و لێکدانەوەی بابەتی، مرۆڤ دەگاتە ئەم قەناعەتە کە هەمووی ئەو نووسەرانە زیاتر سەرنجیان داوەتە سەر باری ئازایەتی و قارەمانەتی شێخ مەحمود وناکۆکی عەشیرەتان و سیاسەتی دوژمنکاری ئینگلیز سەبارەت بە کورد. کەمتر ئاوڕیان داوەتەوە سەر لێکۆڵینەوەیەکی زانستی و بابەتی و لێنهاتویی و کەم و کوڕی ڕێبەرایەتی بزووتنەوە و دەستنیشانکردنی هەڵەکان. بەڕاستی ئەوەی توێژەرێکی ورد بین دەتوانی لە نووسینی نووسەرانی کورد و بێگانە هەڵیگرێنێ و چۆنیەتی ڕووداوەکانی ئەو زەمان لێکبداتەوە، رەنگە بگاتە ئەم ئاکامە کە بەداخەوە شێخ مەحمودی نەمر لە توانایدا نەبووبێ پاپۆڕی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردلە نێو لافاو و کێژاوی سیاسەتی ڕۆژ دا بەرە و ڕۆخی سەر کەوتن باژوێ ولە نوقم بوون

دەربازی بکات. یان بڵێین بۆ مەبەستی نەتەوایەتی خۆی زیرانە لە هەل و مەرجی پێشهاتوو کەلک وەر بگرێ. کاتێکی دەوڵەتی ئینگلستان بۆ هەر مەبەست و ئامانجێک بوو بێت، لە گەڵ حکوومەتی دەستنیژی مەلیک فەیسەل لە بەیاننامەیەکدا بە ڕەسمی و بە ئاشکرا دان بە مافی ڕەوای کوردی عێراق دادەنێ وبڵێ لەگوێیەوەکان دەکات بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی خود موختاری کورد لە چوار چێوەی سنوورەکانی عێراقدا هەنگاو بنێ، شێخ مەحموودی نەمر لە جیاتی قۆستنەوەی ئەم دەرفەت و پێشخوازی لەم هەنگاوە و دەست بە کار بوون بۆ بە جێگەیاندنی ناوەرۆکی ئەم بەیاننامەیە و پێکهێنانی دەوڵەتێکی خودموختاری کوردی وەک یەکەم هەنگاو بەرەو سەر بەخۆیی نەتەوەیی، بە دەنگ و پیلانی تورک و تورکخوازەکانی دەور و بەری، ڕێگای شەڕ و دوژمنایەتی لە گەڵ ئینگلیز دەگرێتە بەر. ئەمەش دەقی بەیاننامەی دەوڵەتی بەریتانیاو حکوومەتی فەیسەلی عێراق سەبارەت بە مەسەلەی کورد:

« .... دەوڵەتی ئالا حەزرەتی پاشای ئینگلستان و دەوڵەتی عێراق مافی ئەو کوردانەی لە چوار چێوەی عێراقدا دەژین بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێک لە چوار چێوەی ئەم سنوورانەدا بە ڕەسمی دەناسن. هەر تک دەوڵەت هیوادارن دەستەی جیاوازی کورد هەتا زووترە لە بارەی شکلی ئەم دەوڵەتە و لە بارەی ئەم سنوورەی کە دەیانەوێ لە چوار چێوەی ئەو دا دەسەلات بە ڕێوە بەرن، پێکەوە ڕێک بکەون. ئەم دەستە و گرووپانە بۆ وتو وێژ لە بارەی پێوەندییەکانی ئابووری و سیاسی داهاتووی خۆیان لە گەڵ دەوڵەتی ئالا حەزرەتی پاشای ئینگلستان و دەوڵەتی عێراق نوێنەرانی بەرپرسی خۆیان دەنێرن... » (٨)

دیارە ناکرێ هەل و مەرجی ئەو زەمان و دواکەوتوویی کۆمەڵگای کوردەواری و سیستەمی دەرەبەگایەتی و تەنگژەی نێو بزووتنەوە لە بەر چاو نەگیرێ. بەڵام ئەوانەش هیچیان نابێ ببنە پاکانە کردن بۆ قاڵ نەبوونی دام و دەزگای دەسەڵاتی شێخ مەحموود لە مەیدانی سیاسەتدا و نفوزی حکوومەتی تورک لە سەر شێخ و دەست و پێوەندی دەور و بەری و تەئسیریان لە سەر ڕووداوەکانی ئەو زەمان،

«... لەگەڵ ئەوەشدا کە شێخ مەحموود لە ڕووی کار و باری دەوڵەتییەوە شارەزاییەکی ئەوتۆی پەیدا نەکرد بوو، هەرچەندە هێندێ سوودیشی لە تاقیکردنەوەی حوکمداریەتییەکەی وەر گرتبوو، ژمارەیێکیش خوێندەوار و ڕۆشنبیر و ئەفسەر لە دەوری کۆ ببوونەوە، بەڵام ئەوانە بەشی چەسپاندن و سەر گرتنی ئەو دەوڵەتەی نەدەکرد کە شێخ مەحموود و هەموشمان ئاواتمان بوو. خواست و سیاسەتی دەوڵەتانیش لەو ڕۆژانەدا لە گەڵ کوردا نەبوو. ئەوانەش کە لەو ڕۆژانەدا لە دەوری شێخ مەحموود کۆ ببوونەوە هەر یەکەیان لە ئاوازێک دەیانخوێند و دەمار گیری ئایینی و پەیوەندی خەڵکی ساویلکەیان بە دەستەوە بوو کەم نەبوون و حیسابیان بۆ دەکرا. بۆیە شێخ مەحموود نەیتوانی بە ئاسانی لە داوی ئەوانە ڕزگار بێت. ئێمەش لە دوای ماوەیەک بۆمان دەر کەوت لە سیاسەتی ئینگلیزدا ئەوە نەبوو کە حکوومەتێکی کوردی دابمەزرێنێت، بۆیە زۆرمان هیوامان بڕابوو، یەکە یەکە لە شێخ مەحموود دوور کەوتینەوە. ڕاستە ئینگلیز حکوومەتی بۆ کورد دروست نەکرد بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا ئەگەر تەقەلای ئینگلیزەکان نەبوایە تورکەکان ویلایەتی موصڵیان دەسەندەوە و ئێمەی کورد لە خوارووی کوردستاندا ئێستە لە کوردەکانی تورکیامان خراپتر بە سەر دەهات...»(١٠)

خوالێخۆشبوو ڕفیق حلمی کە لە سەردەمی بزووتنەوەی شێخ مەحموودی نەمردا یەکێ لە ڕوشنبیرانی چالاک و هەڵکەوتووی سەردەم و یەک لە نیزیکانی شێخ بوە دەنووسێ: «...شێخ مەحموود ئازایی و چاو نەترسی و کەمتەرخەمی خۆشی هۆیەکی گرنگ بوو کە تووشی هەڵەی زۆری بکا. لە بەر ئەوە ئەستێرەی بەختی زوو ڕووی کردە کزی چونکە ڕێو و شوێنێک کە لە هەڵسوڕاندنی کار و باری عەشایری لە سەری ڕۆیشتبوو، بۆ تەدبیر و کار و باری حکوومەتی لە یەک نەدەهات. ئەوانەی دەیانتوانی لە حوکمدار نیزیک ببنەوە لەو بابەتانە بوون: دەست و پێوەندی نەفام و نە خوێندەوار، دەروێشی چاو برسی و دوای تالانکەوتوو، نۆکەری خەنجەر لە پشت و عەشایری تفەنگ لە شان. هەر چەند لە بەغداوە هەتاکو تورکیا هەندێ خوێندەواری باش و نیشتمانپەروەر بوون و دەیانویست تێبکۆشن و یارمەتی

حوکمدار بدەن، بەڵام ڕێکەوتنی تاقمی دەور و پشتی حوکمدار و تاقمی دووهەم لە خەنجەر و دەمانچە دیوارێکی دروست کرد بوو. ئەگەر حوکمدار خۆی بیویستبایە ئەو دیوارەی دەڕووخاند و لە زابتەکان و منەوەرەکان نیزیک دەکەوتەوە. بەڵام وەکوو گوتمان نە ترسان لە دوا ڕۆژ و نازایی خۆی لە لایەک و گرێیەکی نەفسی کە بەرانبەر زابت و ڕۆشنبیر پەیدای کرد بوو لە لایەکی ترەوە بەر هەڵستی ئەوە بوو کە شەقێک لە دیواری خەنجەر و دەمانچەکە هەڵبدا بیڕوخێنێت و ڕوو بکاتە خوێندەوارە باشەکان...» (١١)

بێجگە لە بۆچوونی ڕۆشنبیرانی دەور و بەری شێخ مەحمود، شێخ ڕەئوفی ضیائی کە ماوەیەک لە خزمەت شێخ مەحمود بوە لە یاد داشتەکانیدا دەنووسێ:«... لەو ماوەیەدا ئەوەی هاتە دەستم ئەمە بوو: ئەوەڵەن جەنابی شێخ مەحمود هەر چەند لە بواری پایە و کەسایەتیەوە لە کەسانی بنەماڵە گرنگەکان و لە بنەچەکەیەکی بیرۆز بوو، نفوزی ڕوحانی و دەسەڵاتی شەخسی خۆی لە پلە و پایەی تازەی کەمتر نەبوو، بەڵام لە گەڵ هێندێ سیاسەتی ڕۆژ شارەزایی نەبوو، ئەوانەی لە دەوری کۆ ببوونەوە سێ تیپ بوون. دەستەی یەکەم ئەو سەید و شێخانە بوون کە دەیانویست لە هەڵکەوتی بنە ماڵەیی بەرزنجی کەڵک وەر بگرن. دەستەی دووهەم هێندێ خەڵک بوون کە نانیان بە نرخی ڕۆژ دەخوارد. ئێستا کە دەیانبینی تەشکیلاتێک هەیە بە زمانلووسی چوو بوونە ناوی تا لەم سفرە ڕەنگینە چێژ وەر بگرن و دەستیان بە شتێ ڕابگا. دەستەی سێیەم هێندێ ئەفسەری عوسمانی بوون کە سەرنجی شێخیان ڕاکێشا بوو تا لە ئینگلیزەکانی جیا بکەنەوە و پاڵی پێ بە عوسمانیەوە بدەن. دەستەی دوایی هەمیشە دەیانویست لە ڕێگای دینەوە سەرنجی شێخ بۆ لای خۆیان ڕابکێشن. چونکە لە گەڵ ئەوەش کە شێخ مەحمود مرۆڤێکی ئازا و بە دەسەڵات بوو، هۆگری ئایینی و بەڵکوو دەمار گیریی زۆریشی هەبوو. زووش دەکەوتە ژێر تەئسیرەوە. لە بیرمە ڕۆژێک ئەفسەرێکی ئینگلیزی هاتە لای ئەو خوا لێخۆشبوە، توڵە سەگێکی پێبوو. دوای ڕۆیشتنی یەک لە کار بەدەستانی حکوومەتی کوردستان دەستیکرد بە ڕەخنە و گوتی: ئیتر پەنایەک بۆ مۆسڵمانان

نەماوە. خوا زووتر ئێمە لەو بەڵایە ڕزگار بکا. جێی داخێکی زۆرە کە ئینگلیزی بە بێ ئەوەی گوێ بداتە پایە و مەسلەکی حەزرەتی مەلیک کە ئەوەی کاک ئەحمەدی ڕەحمەتی و لە ئەولادی ڕاستەوخۆی حەزرەتی ڕەسولە د.خ لە گەڵ سەگ دێتە دیداری و گرنگی پێنادات. هەر چەندە ئێرە تەکیەی کاک ئەحمەدی ڕەحمەتیە و سەگ لە دینی ئێمەدا گڵاوە، ئەو هێناویەتی. ئەگەر دەیانەوێ ئاوا سەر بەخۆیی و خودموختاریمان بدەنێ، قەت نامانەوێ. چونکە دووسبەی گۆشتی بەرازیشمان دەرخوارد دەدەن و پاشان دەڵێن لە جیاتی مەککە بچن بۆ بەیتولمقدەس. کە وابوو ئیسلام چیلێهات و دین چوە کوێندەرێ؟ قسەکانی ئەو کابرایە وەها کاری کردە سەر شێخ کە دەستبەجێ ئەمری کرد نامەیەکیان بۆ حاکمی سیاسی نووسی کە فلان مەئموری ئێوە بێ لەبەر چاو گرتنی دابی ئایینی بە سەگەوە هاتۆتە لای من، خێرا لە سولەیمانی وەدەری بنێن و بە گشت مەئمورەکانی خۆشتان ڕابگەیێنن، کاتێ دێنە لای من بە پێچەوانەی دینی پاکی ئیسلام نە بزوونەوە و هەستی موسڵمانان بریندار نەکەن. شێخ ڕەئوف لە سەر باسەکەی دەڕوا و دەنووسێ: ئینگلیزەکان بە سەرنجدانی پایەی مەعنەوی شێخ مەحمود کارو باریان بەو ئەسپارد وعوسمانیەکانیان پێ لە ناوچە دەر کرد و حکوومەتی کوردی عیراقیان پێکهێنا. خۆشیان بە ناوی مەئموری سیاسی و کونسول و ڕاوێژکار تەشکیلاتی خۆیان دامەزراند. لەولاشەوە هەر وەک باسکرا پیاوەکانی عوسمانی لە ڕێگای ئاینیەوە شێخیان بۆ دوژمنایەتی ئینگلیزەکان هان دەدا. لە بیرمە جارێکیان دەستەیەک کۆ ببوونەوە و سەبارەت بە هەڵکردنی ئاڵای ئینگلیز لە سولەیمانی ئیعتیرازیان دەکرد. شێخیان تورە کردبوو. کاتێ وەژوور کەوتم دیتم شێخ نارەحەتە. خێرا ئەمری بەمن کرد کە بچمە کن مەئموری سیاسی ئینگلیز و داوای لێبکەم ئاڵای ئینگلیز لە سەر بان بێنێتە خوار. کونسولی ئینگلیز بە نارەحەتی گوتی : زۆر باشە. خۆتان بڕۆن بیهێننە خوارێ. گوتم: من چۆن دەتوانم ئاڵای ئینگلیز دابگرم. باشترە خۆت ئەم کارە بکەی. ناوبراو بە نارەحەتی چوو ئاڵاکەی داگرت وگوتی بە شێخ مەحمود بێژە: بە هێنانە خواری ئەم ئاڵایە، حکوومەتەکەی

ئەویش دێتە خوارێ. خودموختاری یا سەربەخۆیی کورد ئەودەم بە گیران و ئەسیر بوونی شێخ مەحمود کۆتایی پێهات لێرە نەشێ بێژین: جوان شەبەقی دا، بەڵام دەوڵەت بە پەلە بوو. بەرهەمی ئەم کارە ئەوە بوو کە ئینگلیز بە ئاواتی خۆی گەیشت و سەربەخۆیی کوردانیش بەناو داچوو و لەبیر کرا.» ( ١٢)

بە ورد بوونەوە لەم بۆ چونانە و سەیر کردنی رووداوەکانی ئەو زەمان، مرۆڤ دەگاتە ئەم نەتیجەیە کە شێخی ئەمرلە داخی بێقەولی ئینگلیز ولە ژێر تەئسیری تورکخوازانی دەور و بەری و هەستی پاکی ئاینیدا، کەوتۆتە تێو پیلان و داوی حکومەتی بێدەسەلات و خۆ نەگرتووی تورک و دوژمنایەتی ئینگلیز و پاک کردنەوەی کوردستانی لە ( تۆزی کفر)، پێ باشتر بوە لە رێککەوتن لە گەڵ ئینگلیز و خۆ پاراستن لە داو و کەڵەکی حکومەتی تورک و تورکخوازەکان . وەک لەم پارچە شیعرەدا دەفەرموێ :

« بارها بر لشکر بد خواه کافر تاختم

- جای استحکام ایشان منزل خود ساختم

در ره دین پروری هم مال و هم جان باختم

- صد هزاران نوجوانرا زیر خاک انداختم

تاز کرستان غبار کفر از ان برداشتیم

شێخی ئەمر لە کوردەکانیش نا ڕازییە و داخی دڵ دەر دەبرێ و هەر لەم پامچە شیعرەسا دەفەرموێ:

من کە اولادی حسێنم این میبت عار نیست

کار با مولا بود، بازمره ی کوفار نیست

داخی دل از کورد باشد، بیم ازان غدار نیست

حسرەتا فەردی چرا از قوم ما بیدار نیست

ماکە این زحمت برای حف قوران داشتیم.

دیارە ئەوە بەو مانایە نیە کە پێمان وابێ ئینگلیزەکان لە سیاسەت و بەرنامەی دابوو بێت کە سەر بە خۆیی بدا بە کوردستان. نەک هەر ئەوە بەڵکوو پڕاو پڕ بە

ناو ونیشانی ئەم نووسراوەیە:«.. کورد لە گەمەی........» لە گەڵ دەوڵەتی ئێرانیش پێوەندی دەگرن و دڵنیای دەکەن کەرێگا نادەن ( عیراق ببێتە ناوەندی پیلانی ناسیۆنالیستە کوردەکان بۆ پێکهێنانی ئاژاوە لە نێو کوردەکانی خاکی دەوڵەتانی دراوسێ). سەیرێکی دوو راپۆرتی باڵیۆزی بەریتانیا لە تاران و کومیسیۆنی بەرزی بەریتانیا لە عیراق بکەین، سیاسەت و هەڵوێستی دوو حکوومەتی ئێران و ئینگلیزمان سەبارەت بە مەسەلەی کورد باشتر بۆ روون دەبێتەوە

«... باڵیۆزی بەریتانیا لە تاران بۆ کومیسیۆنەری بەرزی بەریتانیا لە عیراق، ٢٧ی خاکە لێوەی ١٣٠٩ ، سرآر.کلایو، بۆ سر اف همفریز، تاران ١٦ی ئەوریلی ١٩٣٠.

ئاغای بەرێز! لە دانیشتنێکدا کە دوێنێ لە گەڵ وەزیری دەربارم هەبوو، حەزرەتی ئەشرەف تەواو نیگەرانی ئەو مەسەلەیە بوو کە ناوی دەناد بزووتنەوەی کوردان » ناو براو گوتی: مەسەلەی کوردستانی یەکگرتوو وەک مەسەلەی ئەرمەنستانی سەر بەخۆ سەر لە نوێ بۆتە جێگای وتو وێژ. بە بڕوای ئەو کوردەکانی ئێران لەم بزووتنەوەیە بە دوورن. بەڵام هەڵوێستی تورکیا سەبارەت بە خەڵکی کورد هەمیشە بۆتە هۆی نیگەرانیی دەوڵەتی ئێران. ئێستا دەڵێن دەوڵەتێکی بە رواڵەت کوردی لە دەورو بەری ئارارات دامەزراوە و تەنانەت وەزیرێکی دەرەوەشی هەیە... هەر لەو کاتەشدا ئەو بیستبووی کە کاربەدەستانی ئینگلیزی لە عیراق لە گەڵ بزووتنەوەی کوردستانی سەر بەخۆ جۆرە هاو دڵیەکیان هەیە و لە گەڵ شێخ مەحموود پێوەندیشیان گرتوە. ناو براو گوتی: سوپاس دەکا ئەگەر بتوانم لەم بارەوە خەبەرێک لە بەغدا وەر بگرم..» (١٣)

کومیسیۆنەری بەرزی بەریتانیا لە عیراق لە وەڵامی راپۆرتی بالیۆزی بەریتانیا لە تاران بۆی دەنووسێ:

«... سراف، همفریزر بۆ سر آر کلایو، لە رێگای ئیدارەی موستەعمەراتەوە، ١٧ی مای، بەغدا، ٢٩ی ئاوریلی ١٩٣٠.

ئاغای بە رێز! شانازیم هەیە بە نامەی ژمارە ٥٧ رێکەوتی ١٦ی ئاوریلی ١٩٣٠

که منت له وتو ویژێک سەبارەت بە ناسیۆنالیستەکانی کورد لە گەڵ حەزرەتی ئەشرەف وەزیری دەربار و نیگەرانی ئەو لە هاو دڵی کاربەدەستانی ئینگلیزی عیراق لە گەڵ بزووتنەوەی سەر بەخۆیی کوردستان ئاگادار کردوە.

٢- دەسپێرم ئەگەر حەزرەتی ئەشرەف( مەبەست تەیمورتاش-ە وەزیری دەرباری رەزاشا بوە. ک .ح ) جارێکی دیکە باسی ئەم مەسەلەیە بکاتەوە، تۆ دەتوانی وەبیری بخەیەوە کە لە ئەنجامی راسپاردەکانی شورای کۆمەڵی نەتەوەکان کاتی بڕیاردان لە بارەی کێشەی موسڵ لە گەڵ تورکیا، دەوڵەتی ئالاحەزرەتی( پاشای بەریتانیا )ئەرکدار بوە بە هێندێ ژێدەیی تایبەتی بۆ کوردەکانی عیراق. وەک کەلک وەر گرتنی رەسمی لە زمانەکەیان قبوڵ بکات. لە بەر ئەوە سروشتیە کە کاربەدەستانی بەریتانیا لە عیراق ئەرکەکەیان بە شێوەیەکی پێویست بە جێبگەیێنن.

٣- هەر وەک ئاگادارن کاربەدەستانی بەریتانیا لە عیراق، لە وانە دو کەسیان کە بەرلە من لە وێ بوون، نەک هەر بیری خودموختاری کوردگە لە نێو هێندێ ناسیۆنالیستە هەڵەشەکانی کورد برەوی هەیە، پاڵ پشت ناکەن، بەڵکوو بە تایبەت تێکۆشاون کە رێگا نەدەن عیراق ببێتە ناوەندی پلانی ناسیۆنالیستە کوردەکان بۆ پێکهێنانی ئاژاوە و گێرە شێوێنی لە نێو کوردەکانی خاکی دەوڵەتانی دراوسێدا .....»(١٣)

رفیق حلمی لەم بارەوە دەنووسێ :«... دەستەی نیشتمانپەروەر و خوێندەوارەکان(بە تەعبیری ئەو رۆژە منەوەرەکان) لە راست بێ قەراری ئینگلیز و پرو پاگاندەی تورکیا لە چاوەرێکردنی هەل بەو لاوە هیچیان بۆ نەمابۆوە. نۆزدەمیر لە کورد ببوە(شیخ الاسلام) وای برد بوە مێشکی زۆربەی عەشایر و خەلقی دێهاتەوە کە کوردستان مادەیەکی ژەهراویە بە دەس ئینگلیزەوە بۆ ئاکۆکی بەر پاکردن خراوەتە سەر زمانی موسڵمانە سافیلکەکانەوە. کورد و تورک برای یەکترن، دین و ئاین و قیبلە و باوەڕیان بە قورئان یەکی خستون. ساڵەهای ساڵ لە ژێر یەک ئاڵا پێکەوە و لە خاکی ئەم وڵاتەدا ژیاون و خاوەنی مێژوویێکی هاو

ولاتن...» (١٥)

سەیر ئەوەیە شێخ مەحمود لە کاتێکا ویستوویە دەست لە ئینگلیز بەر بداو بە لای تورک دا بێ، کە تەجروبەی پەیمانی سیڤر و لۆزانی لە بەر دەست دابوە. تورک ئەودەم نە دەسەلاتێکی وابوە کە کورد بتوانێ پشتی پێ ببەستێ و نە جێگای بڕواش بوە. ئینگلیزەکان هەر لە سەر دەمی شەڕدا زۆر جار لە ڕێگەی دەزگای تەبلیغات و پڕوپاگاندەی خۆیانەوە داوایان لە کورد کردوە کە فریوی تورکان نەخۆن و بۆ وەدەست هێنانی ماف و پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردی و ئازادی کوردستان دژی تورک پاڵ وەئینگلیز بدەن. «... ئینگلیزەکان شێخ مەحمودی بەرزنجی ڕێکخەری بزووتنەوەی سەر بەخۆیی دوای شەڕیان لە ئاوارگەی هیندستانەوە هێنایەوە سولەیمانی و کردیان بە حاکم بەو مەبەستە کە پێشی تێخزانی تورکەکان بگرێ لە مەڵبەندی موسڵدا. بەلام لە جیاتی ئەوە شێخ مەحمود سەر لە نوێ خەباتی چەکداری دژی ئینگلیزەکان هەڵگیرساندەوە. لەو خەباتەدا سولەیمانی چەند جار دەستاو دەستی کرد. ئاخرەکەی ساڵی ١٩٢٧ شێخ مەحمود لە بەرانبەر پەلاماری بێ وەستانی هێزی هەوایی دا خۆی نەگرت وناچار بڕیاری دا بچێتە ئێران. بابا عەلی کوڕی وەک بارمتە لە بەغدا مایەوە. لەگەڵ نووسینی پەیمانی موسڵ، ئیتر کوردستان لە نێوان چوار دەوڵەتی تورک وعیراق و سوریا و فارس دابەشکرا. سەرکوتکردنی کوردەکان دەمێکیش نەوەستێنرا و کوردەکانی پاڵ پێوەنا بۆ قۆناخی تازەی خەبات. مەلیک مەحمود نوێنەری خۆی ناردە لای شێخ ئەحمەد بارزانی ڕێبەری عەشیرەتێکی بەهێزی کورد کە پێکەوە سەر لە نوێ خەبات دەست پێبکەنەوە. ئەرتەش و پۆلیسی دەوڵەتی لە بەرانبەر دەستەی پارتیزانی خاوەن ئەزموون و ئەخلاق و ترادیسیۆنی لێهاتوویی شەڕ چ سەر کەوتنیان وەدەست نەهێنا. حکوومەتی بەغدا پەنای بردە بەر ناردنی لەشکر بە پشتیوانی هێزی هەوایی ئینگلیز. مێتۆدی یارمەتی فڕۆکەکانی ئینگلیز کە گوندەکانیان بۆمباران دەکرد، ئاخرەکەی بەربەرەکانی کوردانیان تێک شکاند.٢٤جۆ زەردانی ١٩٣٢ شێخ ئەحمەدی بارزانی ڕووی کردە تورکیا

بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد کەوتە وێستانی کاتی. بەڵام وەک میرسکی (Mirsji)مێژوو نووسی ڕوس دەنووسێ:درێژەی چەند ساڵەی ڕاپەرینی بەردوامی شێخ مەحمود و شێخ ئەحمەدی بارزانی، بۆمباران و کوشتار بوو بە هۆی لاواز بوونی میللەت ولە بەینچوون وئاوارە بوونی باشترین و چالاکترین ڕۆڵەکانی کورد وفەوتانی ئابوری تەواوی مەڵبەندەکە» (١٦)

لە کۆتایی ئەم باسەدا بێ جێ نابێ کە بۆ چوونی خوا لێخۆشبوو ماموستا رەفیق حیلمی بخەمە بەر چاوی خوێنەرانی کورد. ناو براو لە بەرگی سێیەمی یاد داشتەکانیدا دەڵێ:«..... مەسەلەی کورد و سەر بەخۆیی کوردستان هەر لە رووی سستی و فرو فێڵی ئینگلیزەوە بەئەنجام نەگەیشت. لە مەدا کوردەکان خۆشیان بەشدارن و ئەتوانم بڵێم کە تاوتی گەورەتر ئەبێ لە کوردەکان خۆیان بگیرێ، چونکە جارێ کۆمەڵە سیاسیەکانی کورد کە ناوچەیان لە ئەستەمبوڵ بوو، لە گەڵ ئەمەشدا کە ئەندامە ناودارەکانی خەڵکی سولەیمانی بوون، ئەومیان بە بیرا نە هاتبوو کە بە ناوی کۆمەڵەکانەوە ئەمانە بنێرنە سولەیمانی بۆ یارمەتیدانی شێخ مەحمود و ڕێکخستنی کار و باری ئەو حکوومەتە کوردە کە بەراست و درۆ هاتبوە ناو. لە کاتێکا کە ئەچوونە ئاسیای بچوک و ویلایەتەکانی خۆر هەڵاتی تورکیاو، لە نێو کوردەکانی ئەو ناوەدا تەقەلای بێ سودی کوردایەتیان ئەدا و بۆ بڵاو کردنەوەی بیری دامەزرانی کوردستان تێ ئەکۆشان و خۆیان ئەخستە دەر و ڕوویان نە ئەکردە سولەیمانی و هەوڵی ئەومیان نە ئەدا کە لە شێخ مەحمود کەلک وەر بگرن و حکوومەتەکەی لە دەستکاری نا ڕاست و نەفامەکان بپارێزن، بناغەی بە هێز بکەن تا نە ڕوخێ و بژی. بە کورتی لەم لایەنەوە هەڵێکی یەکجار هەڵکەوتووی گەورەیان لە کیس دا و کەلکیان وەر نەگرت لەوە کە لە کوردستانی عیراقدا ماوەیەکی هەرە گەورە بە دەستەوە بوو تەقەلای تیا بدرێ بۆ مەسەلەی کورد.

ئەوانەش کە لە تورکیا بوون و بە تایبەت سەرۆک عەشیرەتەکان و ناودارەکان، وەکوولەمونتەمەری- ئەرزەڕۆم-دا بینرا بوو، بە چەشنی تورکە نیشتمانپەروەرەکان و بەڵکوو لە وان زیاتر و بە ڕاستتر، پشتی- مستەفا کەمال-

یان گرتبوو، وە بڕیاریان دابوو بە شەڕی(خۆ...؟) واتە شەڕی ڕزگاری - وڵاتی شەریکایەتی کورد و تورک - واتە: شەڕی ئیستقلال ! ئەو شەڕە کە ئەنجامەکەی- داخەکەم- مەحکەمەی ئیستقلالی لێ پەیدا بوو کە لاوەکان و گەورە ناودارەکانی کوردی بە کۆمەڵ ئەخنکاند و ئەینان بە نیشانی تفەنگ و شەست تیرەوە. ئەگەر بهاتایە و، پێش سەر کەوتنی - مستەفا کەمال- کۆمەڵە سیاسیەکانی کورد، دوور بینیان بکردایە و، هەندێ لە ئەندامە وریاکانی خۆیان بناردایەتە لای- شێخ مەحمود-و بە پێی بەرنامەیەکی سیاسی و قەومی بزووتنەوەکانی کورد لە عیراق و تورکیا، یەک بخرایەو، پێکەوە لە سەر ئەو بەرنامەیە بڕۆشتایە، زۆر جێگای باوەڕ بوو کە مەسەلەی کورد ڕانگێکی تری وەر بگرتایە. ئەنجامی شێخ مەحمودی-یش بەم جۆرە نە ئەبوو کە چاومان پێکەوت...»

بەمجۆرە دەبینین ڕاپەڕینی گەلی کورد لە خوارووی کوردستان بە ڕێبەرایەتی شێخ مەحمودی نەمر دەبێتە قوربانیی سیاسەتی کاڵ و کرچی ڕێبەرایەتی و لە نێو گەمەی حکومەتانی تورک وئینگلیزدا توشی نسکۆ و شکان دێت و بۆ ماوەیەکی زۆر بزووتنەوەی چەکداریی کورد لەم بەشەی نیشتمان دەوەستێ ، تێکۆشانی سیاسی بە شێوەی سەرهەڵدانی کۆمەڵ و ڕێکخراو و حیزبی سیاسی جۆراوجۆر دەستپێدەکرێتەوە و درێژەی پێدەدرێ.

# ڕاپەڕینی سمایلاغای شکاک ( سمکۆ )

ڕاست لەو سەر و بەندەدا کە خوارووی کوردستان لە ژێر ڕێبەرایەتی شێخ مەحموودی حەفید دا بۆ وەدەست هێنانی سەربەخۆیی و دەسەڵاتی نەتەوەیی لە تێکۆشاندا بوو، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش سمایلاغای شکاک ناسراو بە (سمکۆ) لە شپرزەیی و بێدەسەڵاتی حکوومەتی ناوەندی تاران کەلک وەر دەگرێ ولە ناوچەی سەلماس ڕاپەڕینێکی نەتەوەیی هەڵدەگیرسێنێ. لە ماوەیەکی کورت دامەڵبەندی ورمێ وسندوس و شنۆ و لاجان و مەڵبەندی موکریان، مەهاباد و بۆکان و سەقز لە هێز و دەسەڵاتی حکوومەتی تاران پاک دەکاتەوە و دەسەڵاتی خۆی دەسەپێنێ. ئیدارە و دام و دەزگای کوردی لەم ناوچانە دادەمەزرێنێ و لە ورمێ ڕۆژنامەی(کورد)وەک ئۆرگانی دەسەڵاتی ڕاپەڕین دەردەکا. لە سەر ڕاپەڕینی سمکۆی شکاک و کردە وە وسیاسەت و پێوەندییەکانی بە دەوڵەتانی رووس و تورک و ئینگلیز بابەتی زۆر نووسراون و بیر و ڕای جیاواز دەربڕاون. نووسەری ئەم دێڕانە خۆی لە بەرگی یەکەمی پێداچوونەوەدا(١٩٩٦) بەشێکی کتێبەکەی بۆ باس و لێکۆڵینەوەی ڕاپەڕینی سمکۆی شکاک تەرخانکردوە. ماموستا محەممەد رەسول هاواریش لە کتێبێکی ٧٠٠ لاپەڕەییدا بە گوێرەی بەڵگە و دۆکۆمێنتی بە نرخ و باوەڕ پێکراو هێندێ لایەنی ڕاپەڕین وئامانج و سیاسەت وپێوەندییەکانی سمکۆی شیکردۆتەوە و بابەتێکی خەست و بە چێژی خستۆتە بەر دەستی خوێنەری کورد.

مەبەست لە نووسینی ئەم چەند دێرە وەرد دانەوەی ڕووداوەکانی ڕاپەڕینی سمکۆ نیە. مەبەستی سەرەکی ئەم نووسینە ئەوەیە کە بە کورتەی توانا ئەوە ڕوون بکرێتەوە کە هەموو بزووتنەوە و سەرهەڵدان و خەباتی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کورد بوونەتە گەمەی نێو دەوڵەتانی ئیستعماری وحکومەتانی داگیر کەری کوردستان.

تا ئەوکاتەی کە ئینگلیزەکان پەیمانی سەرشۆڕییان بە وثوق الدولە ئیمزا نەکردوە، تا ئەو کاتەی رەزاخانی میر پەنجیان وەک نۆکەرێکی گوێ لەمست لە ئێران نەگردۆتە دەسەڵاتدار، تا ئەو کاتەی ویستوویانە تورک بە سمکۆ بترسێنن و ئوزدەمیری پێ لە رەواندز وەدەر بنێن، لە ڕێگای بابەکری سەلیماغاوە پێوەندیان پێوە گرتوە، چاک وخۆشیان لە گەڵ کردوە و لە سیاسەتی خۆیاندا بۆ کەلک لێ وەرگرتن حیسابیان بۆ کردوە. بەڵام پاش ئەوەی لە ڕێگای هێنانی رەزاخانی میر پەنجەوە سیاسەت و دەسەڵاتی خۆیان بە سەر ئێراندا دەسەپێنن، پاش ئەوەی بەرە و چارەسەر کردنی کێشەی موسڵ و لێک نیزیکبوونەوە لە تورکیا هەنگاو داوێژن، و ڕاپەڕینی شێخ مەحمودیش لە کوردستانی خوارووسەر کوت دەکەن، ئیتر پشت دەکەنە سمکۆ و لە سیاسەتی خۆیان دەری داوێن.«... ئەگەر ئێمە ڕێگە بدەین بە سمکۆ ئیتر ئەوە ئەبێت بە بیانوێک بە دەست حکومەتی ئێرانەوە و ئەوە بە هاندانی ئێمەی ئەزانێت. ئێمەش بەرانبەر بەوە ناتوانین هیچ جۆرە وەڵامێکیان بدەینەوە کە ئێمە بە ئاشکرا ڕێگەی چالاکی سمکۆ ئەدەین و بەوە کوردەکانی ئێرانیان لێ هاندەدەین...»(١٧)

تورکیش تا ئەو کاتەی کە هەرەشەی پێ لە حکومەتی ئێران دەکەن و ئاسۆری و ئەرمەنیانی پێدەترسێنن. و تا ئەو دەمەی کە مستەفا کەمال جی پێی خۆی قایم نەکردوە، سمکۆ دەلاوێننەوە و یارمەتی پێدەکەن. بەڵام هەر لەو کاتەشدا قەت بڕوایان پێ نەکردوە و سمکۆیان بە سەربەخۆیی خواز و بە دوژمنی تورکیان زانیوە.نیاز و بۆچوونی تورک لە سەر سمکۆ لەم تەلگرافەی خوارەوەدا بە جوانی خۆدەنوێنێ: «..... لە دیاربەکرەوە بۆ ئوزدەمیر قایمقام :

١- سمكۆ كابرایەكی فێڵبازە و بە هۆی زرنگی خۆیەوە ئەو خەنجەرەی كە هەڵیگرتوە بۆ كاتی خۆی دەیشارێتەوە. ئەم پیاوە بیری سەربەخۆیی(استقلال)ی لە مێشكدایە. مەبەستی ئەوەیە تا ئەو كاتەی لە ئێراندا دەسەڵاتی زیاد نەكا و بە هێز نەبێ، لە گەڵ ئێمە تێك نەچێت و بەمجورە بە مەرام و ئامانج بگات.

٢- سەركەوتنی سمكۆ لە ناو عەشایری كورد و بەمجۆرە گەورە بوونی و دەسەڵات پەیداكردنی بۆحكوومەتی میللی ئێمە دەست نادا. بەڵام لەم رۆژەدا تێكچوونیشمان لە گەڵ سمكۆ باش نیە. ئەگەر بتوانن هەوڵی ئەوە بدەن كە بە پروپاگاندە و بڵاوكردنەوەیەكی ئاوا كە عەشایری پێ فریو بدرێ و بیانكەین بە دوژمنی سمكۆ بە راستی بەم كردەوەیە خزمەتی گەورە بە حكوومەت دەكەین. وەك ئەوە كە بڵێین : سمكۆ بە پارەی ئینگلیز ئەم شۆرشە دەگێڕێ و بۆ قازانجی خۆی و خزمەتی ئینگلیز خوێنی كوردان دەرێژێ..... بە ناوی قوماندانی جەبهەوە، سەرۆكی ئەركانی جەنگ .. بەسری » ( ١٨ )

كاتێكی تورك لە گەڵ حكوومەتی ڕەزاشا پەیمانی دۆستایەتی دەبەستن و لە گەڵ ئینگلیز دەكەونە دانوساندن نێوانی ئینگلیز و حكوومەتی شێخ مەحمود تێك دەدەن، ئیتر دەكەونە پەلاماردانی سمكۆ و كوشتنی خێزانی و بە دیلگرتنی خوسرەوی كوری و تالانكردنی. بە كورتی بە لێ وردبوونەوەی بەڵگەكان و شیكردنەوەی رووداوەكان بۆمان دەردەكەوێ كەراپەڕینی سمكۆش هەر وەك راپەڕین و بزووتنەوەكانی دیكەی كورد بۆتە گەمەی نێوان دەوڵەتانی تورك وئینگلیز و كراوەتە بارمتەی هەڵسو كەوتی نێوان سیاسەتی ئینگلیز و تورك و ئێران و لە ئاخردا خۆشی سەری تێدا دەچێ.

سەرچاوەكان :

١- د. عبدالرحمن قاسملو، كوردستان وكورد، ١٩٧٣، ل ، ٥٥ ــــ ٦٥ ــــ٥٧
٢ - كەنداڵ ، كوردەكان لەئیمپراتۆری عوسمانی دا، وەرگێڕانی برایمی

یونسی، فارسی ۱۳۷۰، ل ، ۸۱ـــ ۸۳

۳ – کریس کۆچرا، بزووتنەوەی میللی کورد، وەرگێرانی برایمی یونسی، فارسی ۱۳۷۳، ل ٤٧ ـــ ٥۱

٤ – د. مارف عومەر گوڵ، گۆڤاری رابوون، ژ. ۱٦، ۱۹۹٦

٥- درک کینیان، کوردستان و کوردەکان. وەرگێرانی برایمی یونسی ، فارسی ۱۷۳۲ ل ۷۷- ۷۸

٦- رفیق حلمی، یاد داشت، بەرگی دووەم- بەغدا ۱۹٥٦ ، ل ۱٥۱

۷- برایمی یونسی، پێشەکی وەرگێرانی کتێبی( کوردها،ترکها، عربها، ۱۳٦۷

۸- د، بەلەچ شێرکۆ ، کێشەی مێژینە و ئێستای کورد ، وەرگێرانی محەمەد حەمە باقی لە عەرەبیەوە ۱۹۹۱، ل۷٥

۹- راپۆرتی تایبەتی کۆمەڵی نەتەوەکان، بە نەقڵ لە د. عیسمەت شەریف ، کوردستانی عیراق، وەرگێرانی برایمی یونسی، فارسی ۱۳۷۰، ل ۱۸۳-۱۸۲

۱۰-م.ر.هاوار ، شێخ مەحمودی قارەمان ودەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان. بە نەقڵ لە توفیق وەهبی بەگ، بەرگی دووەم، ۱۹۹۱، ل ۲٥۹.

۱۱- هەمان سەر چاوە، ، بەرگی یەکەم، ل ٤۱۲- ٤۱۲ ۱۳٤

۱۲- شێخ رەئوف ضیائی، یادداشتهایی از کردستان ، باهتمام عمر فاروقی، ۱۳٦۷، ل ۹۰، ۹۱، ۹۲، ۹۳، ۹٤، ۹٥

۱۳ و ۱٤- کاوە بەیات، شورش کردهای ترکیە و تاسیر آن بر روابط خارجی ایران، ۱۳۷٤،تهران، ص، ص، ۲۰٥، ۲۰۷، ۲۰۸

۱٥- رفیق حیلمی، یادداشت، بەرگی دووەم، بەغدا ۱۹٥٦ ل ٥٤

۱٦- کارل دورمان ، رۆژهەڵاتی ناوەراست لە سیاسەتی جیهانیدا، ۱۹٥۹- ۱۹۱۸. چێکی، پراگ ، ۱۹٦٦ ، ل ۱۷٥- ۱۷٦

۱۷- م.ر.هاوار:(تەلگرافی بالیۆزخانەی بەریتانیا لە تاران بۆ وەزارەتی موستەعمەراتی بەریتانیا. دەی نوڤەمبەری ۱۹۲۲. سمکۆ و بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد. ۱۹۹٥ ، ل ۸٦

١٨- رەمــزی قــەزاز، بزووتنەوەی ســیــاسی و روشنبــیــری کــورد، ١٩٧١، ل ١٦٧.١٦٩

## چەند وتەیەکی پێویست

بەرلە وەی بێمە سـەرئەسڵی وەرگێرانی نووسینەکـەی ئاغای (کـاوە بەیات) دەمەوێ چەند خاڵی پێویست بخەمەبەرچاوی خوێنەرانی بە رێز:

١ ــ وەرگێرانی هێندێ بەشی سەرەکی ئەم کتێبە کە پێوەندیان بە سیاسەت و کردەوەی دەوڵەتانی ناوچەیی و دەرەوە سەبارەت بە مەسەلەی کوردەوە هەیە، بە شێوەیەکی ئازاد بەڵام بە ئەمانەتەوە کراوە بەکوردی و لە درێژدادڕی و داتاشین و، وە رگێرانی وشە بە وشە خۆم پاراستوە.

٢ ــ نووســەر بەشـێـوەی مێـژوو نووس و نووســەرانی نەتەوەی باڵادەسـتی ئێرانی لە زۆر جێ وشـەی دزێوی:(اشـرار ویاغی وچەتە و رێگر)ی بۆکورد بەکـار هێناوە، لەم جۆرە شوێنانە ئەگەر ڕاست کردنەوەیەک بەپێویست زانرابێ و ڕاست کرابێتەوە، بەپیتی(ک .ح ) نیشاندراوە.

٣ ــ نووسەر وشەی شۆرشی بە مانای شۆرشی فارسی، واتە( سەربزێوی، یاخیبوون، ئاژاوەچیەتی، و..)بەکار هێناوە، لێرەدا لە جێگای (شۆرشی)فارسی ( سەرهەڵدان، ڕاپەرین، بزووتنەوەی چەکداری ) بەکار هاتوە .

٥ ــ وابە باش زانراکە ئەو سەرچاوانەی ناویراو بۆنووسینی ئەم کتێبە کـەلکی لێ وەرگـرتوون هـەروا وەک خـۆی بە فـارسی وئینگلیـزی دەقـەکـانیـان بنووسـمـەوە وبیـانخـەمـە ئاخری وەرگێراوەکەی ئاغای بەیات. نازانم ئەم شێوازە

چەندە لە گەڵ داب و شێوەی نووسین و وەرگێرانی باو دێتەوە، بەڵام ڕەنگە (بۆ پەژ یش زیانی نەبێ). هەر چۆنێک بێ تکای دۆستانەم لە خوێنەرانی بە ڕێز هەیە بە کەرەم و گەورەیی خۆیان لە کەم و کوڕییەکان چاو بپۆشن و بە ڕەخنەی دۆستانە هەڵەکان ڕاست بکەنەوە.

## بەشێک لەپێشەکی نووسینەکەی ئاغای کاوە بەیات:

لە نێوان ساڵەکانی ١٣٠٦ تا١٣٠٩(١٩٢٧تا١٩٢٩) بەشێک لە عەشایری کوردی تورکیا کە لە کاتی بەرەنگاری پێشووی کوردەکان لە گەڵ دەوڵەتی تازە دامەزراوی مستەفاکەماڵ پاشا(ساڵی ١٣٠٤(١٩٢٥)سەرکوت نەکرابوون، لەو پەڕی ڕۆژهەڵاتی خاکی تورکیا، واتالە دەور و بەری بەرزاییەکانی دووره دەستی ئارارات ،دەستیان بەشۆڕش کرد. هەڵکەوتی جوغرافیایی ئەم ناوچەیە لە بەرئەوەی کەوتبوە نێوان ئێران و سۆڤیێت و تورکیا، و هەر وەها سەبارەت بە بوونی مەسەلەی کورد ئەو دەم لە تەوەری نێـونەتەوەیی دا، ڕاپەرینی ئاراراتی لە مەسەلەی سەر هەڵدانێکی ناوچەیی بە گرنگترنیشان دەدا.

ڕاپەرینی کوردەکانی ئارارات لە سەردەمێکدا دەست پێکرا کە هەریەک لە دەوڵەتە تازە دامەزراوەکانی پەهلەوی و کەماڵی تێدەکۆشان پێوەندی تازەی خۆیان لە سەر بناغەیەکی جیاوازلە شێوە پێوەندی قەدیمی ئێران و عوسمانی دابمەزرێنن، بەڵام لە بەرئەوەی کە مەسەلەکان لەوە قـوڵتـربوون کـە وا بە هاسانی چارە سەربکرێن، ئەم تێکۆشان و تەقەلایە تووشی هێندێ گەند وکۆسپ بوون، کە جار و بار دەگەیشتنە قەیرانی جیددی لە پێوەندی دوو وڵات دا. یەک لەو مەسەلە کۆنانە مەسەلەی کوردەکانی ئەم دووولاتە بوو کە بە شێوەی ڕاپەرینی ئارارات لایەنێکی توند و تێژی بەخۆ وە گرت و تەواوی پێوەندی ئێران و تورکیای خستە ژێر تیشکی

خۆیەوە.

چۆنیەتی کار کردی راپەرینی ئارارات لە سەرپێوەندی دوو وڵات کە مەسەلەی سەرەکی ئەم لێکۆڵینەوەیە، لە گەڵ باسێکی کورتی شێوەی سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ناسیۆنالیستی کوردەکانی تورکیا دەست پێدەکەم، گۆڕانکاری دوایی ئەوله قالبی راپەرینی شێخ سەعیدی پیران لە بەشەکانی ناوەندی و باشوری ناوچە کوردنشینەکانی تورکیا درێژە پێدەدەم. پاشان ئاماژەبۆ چۆنیەتی سەرهەڵدانی بەربەرەکانی عەشایری کورد لە دەور و بەری بەرزاییەکانی ئارارات دەکەم و چۆنیەتی پێکهاتن و تەقەلای رێکخراوی سیاسی خۆیبون بۆ کەلک وەرگرتن لەو نائارامییە کە دەبێتە هۆی ناردنی ئیحسان نوری پاشا بۆ رێبەرایەتی عەسکەری و راکێشانی پشتیوانی نێونەتەوەیی وناوچەیی باس دەکەم؛ پاشان دێمەسەر باسی سێ دەورەی دیاریکراوی ئەم بزووتنەوەیە، یانی شەڕی هەوەل و شکانی عەسکەری تورکان( بەهاری ١٣٠٦(١٩٢٧/؛ و ه ستانێکی دووساڵە بە شێوەی تێکهەڵچوون و وتو وێژی جاربەجار، ئاخرەکەشی سەرکەوتنی تورکەکان لەراکێشانی پشتیوانی و هاوکاری هێزەکانی تری ناوچەبۆسەرکوت کردنی کوردەکان١٣٠٩(١٩٣٠)بە هێنانەگۆڕی ئەم مەسەلانە نۆرە دەگاتە ئەسلی مەسەلە، واتە لێکۆڵینەوەی چۆنیەتی کار کردی گۆڕانکارییەکانی ناوبراو لە سەر پێوەندی نێوان ئێران و تورکیا..

لەم بەشەی کە پێوەندی بە ناکۆکی سنوور و ڕکەبەری عەشیرەتییەوە هەیە، پاش باسێکی کورتی بار و دۆخی جوغرافیایی، سیاسی و عەشیرەتگەلی سنووری سەرووی رۆژ ئاوای ئێران و نەخشی هۆزەکانی جێگای باس لە ئاخرین دەورەکانی مل بەملەی هۆزەکان وناکۆکی سنووری ئێران وعوسمانی دا، دێمە سەر گۆڕانکاری و تەقەلای رێژیمی تازەی ئێران بۆ کۆکردنەوەی دەسەلاتی ناوەندی و کورتکردنەوەی دەسەلاتی سوننەتی ــ و بە تایبەت دەسەلاتی بنەماڵەی ئیقبال السلطنەی ماکۆیی- بەکەلک وەرگرتن لە ئەرتەشی یەک دەستی تازە و بە دەستەوەگرتنی راستەو خۆی کاروباری ئەم ناوچانە.

گەلێک لە کاربە دەستانی ئێرانی دامەزرانی دەوڵەتی تازەی تورک، واتە

حکوومەتی مستەفاکەماڵ پاشایان بە خاڵێکی هیوا دادەنا بۆ سەرەتایەکی تازە و کۆتایی هێنان بە کێشە و هەرای ماڵ وێرانکەری لە مێژینەی نێوان ئەم دوو وڵاتەدا. بەرهەمی نهایی ئەو گومان چاکی یە، بوو بە هۆی بەستنی پەیمانی «دۆستایەتی و ئەمنیەت» ی نێوان تورکیا و ئێران لە ساڵی ۱۳۰٥دا.(۱۹۲٦) ×

بەمحاڵەش چونکە دەوڵەتی تازەی تورکیا هێشتا لە زۆر مەسەلەی ناوچەییدا، ڕێبازێکی هاوگرلە گەڵ سیاسەتی سەردەمی عوسمانی گرتبوە بەر، زۆری نەخایاند هێندێ ناکۆکی ڕابردووی ئێران و عوسمانی سەرلە نوێ سەریان هەڵداوە. پاش چەندساڵ وەستان بە هۆی گۆڕانکاری ڕووخانی عوسمانی و شەرمکانی سەربەخۆیی و سەقامگرتوویی دەسەلاتی تازەی مستەفاکەماڵەوە، تەبلیغاتی پانتورکیسم لە ناوچەدا دەستی پێکردەوە. لە پەنائەودا، ئاشنایی لە گەڵ سیاسەتی پێشووی عوسمانی وەک تازەکردنەوەی ئیدیعای عەرزی لە سەر هێندێ شوێنی سنووری ئێران، یان بە هاندانی کوردە یاخییەکان دژی دەوڵەتی ئێران. لە پەنا ئەم گۆڕانکاریانەدا کە نموونەیەک بوون لە درێژەپێدانی بزووتنەوەکۆنەکانی ناوچەیی، هێندێ بزووتنەوەی تازە و جیا لە ڕابردووش سەریان هەڵدا، لە هەموان گرنگتریان ناسیۆنالیزمی نوێباوی کورد بوو.

لە گەڵ گۆڕانی بەرهەمی ئەم هۆیە تازانە و سیاسەتی بەربلاوی سەرکوتکردنی کوردەکان لە لایەن دەوڵەتی ئانکاراوە، تورکەکان لە چەکێکی هەرە گرنگ بێ بەشبوون کە لە کۆنەوە دژی ئێران بە کاریان دەهێنا. یانی نەک هەرئیتر نەیاندەتوانی هۆزەکانی کوردی سەرسنوور دژی ئێران هانبدەن، بەڵکوو هێندێ دەستەی سیاسی کورد لە گەڵ پێداگرتن لە سەر هاوپێوەندی ڕەگەزیی وکولتووریی قەومەئێرانیەکان، ڕێبازێکی تەواو جیاواز لە ڕابردوویان گرتە پێش.

لە گەڵ ڕاپەرینی کوردەکانی ئارارات تەواوی مەسەلەکانی جێگای ناکۆکی دوو وڵات، چ ئەوانەی ڕیشەی کۆنیان هەبوو، چ ناکۆکی بیروڕای تازە، هەموویان لە دەورو بەری سنوورەکانی دوو وڵات کۆبوونەوە، و لە گەڵ سەرنجدانی شەڕی توندی نێوان تورک و کوردەکان، چارەسەرکردنی ئەو مەسەلانە کە لە حاڵەتی ئاساییدا

دەکرا وردە وردە ڕێبازی خۆیان بدۆزنەوە، وەپەلە کەوت. نیگەرانی کاربەدەستانی ئێرانی لە پانتورکیزمی نهێنی دەوڵەتی تورک، و هەر وەها دڵەڕاوکەی تورکەکان لە شکڵ گرتنی هاوکاری قەومە ئێرانیەکانی ناوچە لە گەڵ گۆڕە دەسەڵاتدارەکانی ئێرانی و شتی دیکەش وەک ئیدیعای عەرزیی تورکەکان لە ناوچەی ئاراراتی بچوک کە سەبارەت بە ئیحتیاجی نیزامیی تورکەکان بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەرینی کوردان، بارێکی پەلە و تاڵوکەی بە خۆوە گرتبوو.

لە ڕوانگەی وردەکاریەوە، چوارچێوەی گشتی ناکۆکی یەکان لە چەند جێگا گەیشتە ئەوپەڕی قەیرانی پێوەندی دوو وڵات. توێژینەوەی ئەم گۆڕانکاریانە لە گەڵ ئاوڕ دانەوەیەک بۆ سەر پێوەندییەکانی دەرەوەی ئێران لە گەڵ دەسەڵاتەکانی تری ناوچەیی و هێندێ سیاسەتی خۆجێیی کە لەم ئاڵوگۆڕانەدا تەئسیریان وەرگرت، ئامانجی سەرەکی ئەم نووسینەوەیە.

## بەشی یەکەم

# ناسیۆنالیزمی کورد لەتورکیا

هەرچەندە ڕاپەرینی سەرۆکانی کوردی : وەک شێخ عوبیدوڵای شەمزینان و بەدرخانی بۆتان لە نیوەی دووەمی سەدەی ۱۹دا وەک سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزمی کوردلێک دەدرێتەوە، بەڵام شکڵگیری پتەوی ئەم بزووتنەوەیە لە ساڵەکانی هەوەڵی سەدەی بیستەم و لە ڕەوەندی ئاڵوگۆڕی سیاسیدا خۆدەنوێنێ کە دەگاتە شۆڕشی مەشروتەی تورکیا و دەسەڵاتی تورکانی لاو.

ڕێکخراوەکانی وەک کۆمەڵی تەڕەقی و تەعالی کورد لە ئەستەمبوڵ ۱۹۰۸، یان هیوا۱۹۱۲ کە لەو قۆناخەدا پێکهاتن، زیاتر ئامانجی ئەوان بواری کولتوری وەک دانانی قوتابخانە و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەی کوردی بوو.(۱) بەڵام شکانی هێزەکانی عوسمانی لە شەڕی یەکەمی دنیاگر ولافاوی بەر بڵاوی ناسیۆنالیستی کە بەشێکی فراوانی ئەوڕۆژگارەی داگرتبوو،ڕوانگەیەکی سیاسی ڕوونی هێنابەرچاو، و کۆڕە کوردەکانی ئیمپراتوری عوسمانیش لەم ئاڵوگۆڕە کەنار نەمانەوە. بەتایبەت بە« شکان و لە بەریەک بڵاوبوونی عوسمانی یەکان» دەرەتانی سەربەخۆیی کوردستانی بەشی پێوەلکاوی ئیمپراتوری عوسمانی هاتەگۆڕێ. هۆیەکی دیکەش کە لەم بوارەدا کاریگەربوو، هێندێ کۆڕی بە توانای تەشکیلاتی دەسەڵاتی بەریتانیابوون لە نێوان دووچۆمان(بين النهرين)داکە دەرفەتی کەلک

وەرگرتن لە هێزی بە توانای کوردیان لە بەر چاو دوور نەخستەوە. هەر وەک بەندی ٦٢و٦٣ی پەیمانی سیڤر کە لە ١٠ی مانگی ئاوگوستی ١٩٢٠ بە سەرعوسمانیدا سەپێندرا. بۆ دانانی حکوومەتی خودموختاری کوردیش لە بەشەکانی سەرووی (نێودووچۆمان) هێندێ ڕاوێژ لە بەرچاو گیرابوون،(٢)

لەم قۆناخەدا ڕێکخراوەکوردییەکانی کە لە ئەستەمبوڵ و شوێنەکانی دیکە دامەزران، لە چاو ڕابردوو ڕوکارێکی ئاشکرای سیاسی یان لە بەر چاو بوو، بۆ بە جێگەیاندنی بیری سەر بەخۆیی کورد چاوەڕوانی ئەوە بوون لە کەش و هەوای تازەی جیهانی کەلک وەر بگرن. گرنگترینی ئەم ڕێکخراوانە بریتی بوون لە: کۆمەڵەی سەربەخۆیی کورد لە قاهیرە لە لایەن ثریابەدرخانەوە دامەزرابوو. و لە کۆنفرانسی ئاشتی پاریسدا بۆ بردنەپێشی ویستی کوردەکان نەخشێکی گرنگی هەبوو.

کۆمەڵەی تەعالی کوردستان کە لە لایەن شێخ عەبدولقادر وئەمین عالی بەدرخانەوە دامەزران، لە گەڵ کۆمەڵەی هیواکە دوای ماوەیەک کورتە تێکۆشان لە ساڵەکانی پێش شەڕدا دووبارە زیندوو ببۆوە(٣) بەم حاڵەش پێکهاتنی ڕێکخراوەکانی ناوبراو و توندبوونی تێکۆشانی سیاسی کوردەکان، بە مانای بەربەرەکانی تەواو لە گەڵ تورکان نەبوو. کۆمەڵانی خەڵکی کورد، واتە کەڵێک لە هۆز و عەشیرەتگەلی ڕۆژهەڵاتی تورکیا نەک هەر پێوەندییەکی ئەوتۆیان لە گەڵ ئەوکۆمەڵانە نەبوو، بەڵکو هێشتا هەروەک پێوەندییەکانی پێشوو دەبزووتنەوە. زۆرلە سەرۆکانی هۆز و عەشایر هەر وەک لە ساڵەکانی پێشوودا وەک بەشێک لە فەرماندەکانی سوارەی حەمیدیە لە خزمەت کاربەدەستانی حکوومەتی دابوون. ئێستاش لە گەڵ تورکان و بەتایبەت لە گەڵ کەمالیستەکان پێوەندی دۆستانەیان هەبوو. زۆرلە سەرۆکانی کورد لە گەڵ مستەفاکەماڵ، کە ساڵی ١٩١٦فەرماندەی سوپای دیاربەکربوو، ئاشنایەتیان هەبوو، شان بەشانی یەکتر شەڕیان کردبوو. کەمالیستەکانیش بە ژیری لەم هەلە کەلکیان وەرگرتبوو. لە گەڵ ئەوەش کە کەش و هەوای سیاسی ئەوێ ڕۆژێ بەلای بیری سەربەخۆیی کورددابوو، کەمالیستەکان

توانیان بەشێکی گرنگ و کاریگەری کورد بە دەستەوەبگرن.(٤) ئەم دوولایەنی و ناتەباییە، تەنانەت لە نێو تاقمەسیاسیەکانی بە ڕواڵەت سەر بەخۆی کوردیشدا خۆی نیشاندا. زۆری نەخایاند کە ئەم دەستانەش بە دوولایەنی« خودموختاری خواز» و « سەربەخۆیی خواز » دابەشبوون. کۆمەڵەی تەعالی کوردستان بە ڕێبەرایەتی شێخ عبدولقادر ویستیاری کوردستانێکی خودموختاربوو لە چوارچێوەی ئیمپراتوری عوسمانیدا، تاقمەکانی سەربە بنەماڵەی بەدرخان، ویستیاری جیابوونەوە لە تورکیا و سەربەخۆیی تەواوی کورد بوون.

لەم قۆناخەدا، واتە لە نێوان ساڵەکانی ١٩٢٠تا١٩٢٣ سەرەڕای پل و پای دەستە و تاقمە سیاسیەکانی کورد و کەش و هەوای لە باری نێونەتەوەیی بۆسەربەخۆیی کوردستان، کەمالیستەکان بە سیاسەتێکی ژیرانە کە بۆ ڕاکێشانی ڕوانگەی باشی سەرۆکانی کورد بە کاریان هێنا. بەشی گرنگی هێزی عەشایری کوردەکانی تورکیایان بە دەستەوەگرت. کوردەکان نەک هەرلە شەڕەکانی سەربەخۆیی تورکیادا دژی یونانیەکان و هێزی هاوپەیمانان نەخشێکی گەورەیان یاری کرد، بەڵکوو لە کێشەی موسڵیشدا بۆ پشتیوانی لە کەمالیستەکان دژی سیاسەتی بەریتانیا لە ناوچۆمان(بین النهرین) هەنگاویان نا.

لە گەڵ سەرکەوتنی کەمالیستەکان بە سەر هێزەکانی یونانیدا ساڵی ١٩٢٠کە بوو بە هۆی سەقامگرتوویی دەسەڵاتی تازە و بە تایبەت لە گەڵ چارکردنی ناتەبایی تورکیا و دەوڵەتانی ئوروپایی لە ڕەوەندی پەیمانی لۆزاندا( یولی١٩٢٢)، هەوەڵین نیشانەی لێکدابڕانی کوردەکان و تورک دەرکەوت. کاتێکی کەمالیستەکان بە سەرئەستەمبوڵدا سەرکەوتن، زورلە ڕێکخراوەسیاسیەکانی کورد کە لە گەڵ کاربەدەستانی سیاسی و نیزامی دەوڵەتانی هاو پەیمان نێوانیان هەبوو، سەرکوت کران و زۆربەی ڕێبەرانیان ڕایان کردە سوریا کە لە بەردەستی فەرانسەدا بوو.

هێزەکوردەکانیش کە لە ڕەوەندی ئاڵوگۆڕەکانی دواییدا لە گەڵ کەمالیستەکان هاوکاری یان دەکرد، بۆیان دەرکەوت کە تەواوی وادە و بەڵێنەکانی مستەفاکەماڵ و لایەنگرانی ئەو، سەبارەت بە ویستەکانی نەتەوەی کورد بنچینەیەکی ئەوتۆیان

نەبوە.

## ڕاپەرینی شێخ سەعیدی پیران

ڕێکخراوی کۆمەڵی ئازادی کورد کە ساڵی ١٩٢٣لە تورکیا دامەزرا، لە زۆربارەوە لە گەڵ ڕێکخراوەکانی پێشوو فەرقی هەبوو یەکەم لە ڕوانگەی سیاسی یەوە سەبارەت بە ئامانجی ڕاستەقینەی کەمالیستەکان هیچ شک و گومانی نەبوو. دووەم بە پێچەوانەی کۆمەڵەکانی پێشووی کورد کە مەیدانی نفوزیان لە دەور و بەری ئەستەمبوڵ تێ نە دەپەڕی. کۆمەڵەی ئازادی لە گەڵ ئەندامانی دامەزرێنەری وەک خالیدبەگ لە سەرۆکانی عێلی جەبران و خوێندەواری مەدرەسەی نیزامی حەمیدیە، یوسف ضیابەگ لە ئەمیرەکانی بدلیس و یەک لە نوێنەرانی مەجلیسی مەزنی تورکیا و لە وانەش گرنگتر بە پشتیوانی شێخ سەعیدی پیران لە شێخەکانی مەزنی نەقشبەندی لە ئەرزە روم و لە گەڵ کۆمەلانی خەڵکی کورد پێوەندی یەکی ڕاستە و خۆی هەبوو. جگە لە خودی مەسەلەی (کوردایەتی)کە لە ساڵەکانی دوای شەڕی یەکەمی دنیاگر وەک بیر و باوەڕی سیاسی ڕاکێشەر هاتبوە گۆڕێ و سیاسەتی پان تورکیزمی ئانکارا، بوارێکی لە باری بۆ پەرەگرتنی ناوچەکورد نشینەکانی تورکیا پێکهێنابوو. هێندێ هۆی دیکەی وەک هەڵوەشانی خەلافەتیش(مارسی ١٩٢٤)و هێندێ هەنگاوی دژبە ئایینی کەمالیستەکانیش لە

هارۆژاندنی دژایەتی کۆمەڵانی کورد کاریگەربوو. بێجگە لەوە، کۆمەڵەی ئازادی لە بواری خۆجێیی دا لە سەرپشتیوانیی نەیارەکانی سیاسی مستەفاکەمال لە ئانکارا و ئەستەمبوڵ، ولە بواری دەرەوش لە سەردەرەتانی پشتیوانیی دەوڵەتی بەریتانیا حیسابی دەکرد. بەڵام بە کردەوە زۆرلە حیسابەکانی کۆمەڵەی ئازادی بە هەڵە دەرچوون. لە سەرەتاوە هێندێ رووداوی ئەوتۆ بوون بە هۆی ئەوە کە هێزەکانی لایەنگری کۆمەڵە بەرلە کاتی دیاریکراو تووشی شەڕ بن. هێندێ لە ئەفسەرانی هەڵکەوتووی لایەنگرانی کۆمەڵە، وەک ئیحسان نوری و رەزابەگی برای(یوسف ضیابەگ)فەرماندەکانی پادگانی(بیتولشەباب)لە ناوچەکانی خوارووی تورکیا لە دراوسیەتی سنوورەکانی عیراق لە رەوەندی مەئموریەتێکی خۆجێیی دا لە مانگی ئاوگوستی ١٩٢٤بە لێحاڵی بوونی چاوت لە پەیامێکی رەمزیی یوسف ضیابەگ، لە گەڵ تەواوی کەسانی ژێردەستی خۆیان، شۆرشیان دەست پێکرد و لە چیاکانی دەور وبەر جێگربوون. دەوڵەتی تورکیا نەک هەر راپەرینی پێ نەگەیشتووی پادگانی (بیتولشەبابی) بە هاسانی سەرکوت کرد، بەڵکوو بە دوای ئەو روو داوە وریاکەرەوەدا، هێندێ لە سەرۆکەکانی گرنگی کۆمەڵەی ئازادی ناسی و گرتنی. یوسف ضیابەگ و خالید بەگ لەو گیراوانەبوون کە لە زینداندا کوژران.

لە گەڵ لێک هەڵوەشانی رایەلکەی نیزامی کۆمەڵە، رێبەرایەتی بزووتنەوە کەوتە دەست شێخ سەعید. ئەمجارەش هەرچەندە بریار وابووکە راپەرینی سەرانسەری کوردەکان لە مانگی مارسی ١٩٢٥ دەست پێ بکات، سەبارەت بە هێندێ پێکهەڵپرژانی خۆجێیی، یا لە راستیدا دەست پێشخەری سەربازانی تورک لە هەوەڵی مانگی فیوریە، بەرەنگاری گەورەی کوردەکان بە پەلاماردانی دیاربەکر دەست پێکرا.

هەرچەند لە هێندێ ناوچە کورد نشینەکانی وەک موش و بتلیس، هێندێ لە هۆزە کوردەکانی وەک حەیدەرانلو، وەک چاوەڕوان دەکرا بەشدارییان نەکرد، بەڵام لە سەریەک بەشێکی بەرچاوی کوردەکان لە راپەریندا بەشداربوون و راپەرین ناوچەکانی سەرەوەشی گرتەوە.

دەوڵەتی بەریتانیاکە لە عیراق لە گەڵ ڕاپەرینی شێخ مەحمود پێوە ببوو، بە پێچەوانەی تەبلیغاتی تورکەکان یارمەتی بەڕاپەرین نەکرد لە لایەکی تر مستەفا کەمالیش بە ڕاگەیاندنی حکوومەتی نیزامی لە ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات و، وەرگرتنی دەسەڵاتی بەربڵاو لە مەجلیسی مەزنی تورکیا لە گەڵ سەرکوتکردنی باڵە نەیارەکانی سیاسی کە کوردەکان بە هیوای پشتیوانیی ئەوان بوون، هێزێکی زۆریشی بۆ سەرکوتکردنی شێخ سەعید خستە ڕێ . لە کاتێکا سوپای حەوتەمی دیاربەکر بە فەرماندەیی مرسل پاشا هێشتا لە بەرانبەر هێزی کوردەکاندا بەربەرەکانی دەکرد و سوپای هەشتەمی ئەرزە ڕۆمیش بە فەرماندەیی کازم قەرەبەکرلە گەڵ شۆرشگێران لە شەڕدابوو، هێزی یارمەتی ناوەندیش گەیشتێ و دوای شەڕێکی قورس ٢٧ی مارس دیاربەکرلە گەمارۆی کوردەکان دەرباز بوو. زۆری نەخایاند کە ناوەندەکانی دیکەی بەربەرەکانی کوردان سەرکوت کران. شێخ سەعیدیش کە خەریکبو لە گەڵ چەندکەس لە هاورێیانی پەنابۆ ئێران بەرێ، بە یارمەتی یەکێ لە سەرۆکانی هۆزی جبران، بە ناوی قاسم بەگ، گیرا و کەوتە دەست هێزەکانی دەوڵەتی. دوای ماوەیەک لە چواری مانگی سپتامبری ١٩٢٥ لە گەڵ ٤٨کەس لە ڕێبەرانی ڕاپەرین ئیعدام کرا. هاوکات لە گەڵ لە سێدارە دانی شێخ سەعید، ڕێبازی سەرکوتکردنی هەموو جۆرە بزووتنەوەیەکی بەرهەڵستکاری وتاراندنی زۆرە ملی هەزاران هەزارکورد بۆ ناوچەکانی ڕۆژئاوا و خوارووی تورکیا دەستپێکرا.»

– لێرەدا نووسینەکەی ڕێزدار کاوە بەیات سەبارەت بە ڕاپەڕینی شێخ سەعید تەواو دەبێ ، بەڵام لە سەر ڕاپەڕینی شێخ سەعید نووسەرانی بێگانە و خۆماڵی بیر و ڕای جیاوازیان دربڕیوە.وباسیان کردوە بۆیە بە پێویستم زانی کورتەیەکیش لە نووسراوە و بیر و بۆچوونی نووسەرانی بێگانە سەبارەت بە ڕاپەڕینی شێخ سەعید لە لاپەڕەکان زیاد بکەم ورووناکی زیاتربخەمە سەرخەباتی خوێناوی نەتەوەکەمان.. نووسەر و ڕۆژنامە نووسی ناسراوی فەرەنسەیی کریس کۆچێرا لە سەر ڕاپەڕینی

شێخ سەعید دەدوێ و دەنووسێ : «...... هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت لە لایەن مستەفا کەمال و ڕاگەیاندنی کۆماری لە سێیەمی مارسی ١٩٢٤ ئەو پەردە خەیالییەی لادا کە ناسیۆنالیستەکانی تورک لە ١٩١٨ەوە بۆ دڵدانەوەی کوردان و کەلک وەر گرتن لە وان دژی ئینگلیز و یونان و ئەستاندنەوەی ویلایەتی موسڵ زانستە و حیسابکراو بە سەر نیەت و ئامانجی خۆیان دادابوو.

ئەو هەودایەی کە کوردەکانی بە ئیمپراتوری وەسمانی یەوە بەستەوە - واتە ڕێز گرتنی خەرفاوانە لە ئاست خەلیفە - کە قوستەنتەنیە خۆی ببوە هۆی شکانی کوردە نەتەوەییەکان - بە ناچاری پسا بوو. بەڵام مەخابن ئەم کارە درنگ رووی دا. چونکە ئەو دەمەی کە تەواوی کوردەکانی تورکیا بۆ شەڕی سەر بە خۆیی ئامادە بوون، کاری لە بەر یەک هەڵوەشانی ئیمپراتۆری وەسمانی تەواو کۆتایی پێهاتبوو. سنووری تازە دیاریکراو بوون و ئەم تێکۆشانە ئیتر سەرنج و هۆگریی کەسی ڕانەکێشا. کوردەکان کە لە دەور و بەری ئەنەدۆڵ و ئێراندا تاق کەوتبوونەوە، ڕاپەڕین، شەڕی قورسیان کرد، بەڵام کەس سەر کەوتنی ئەوانی نەبینی. کوردستانی تورکیا لە ١٩٢١ەوە تا ١٩٣٧ بە کردەوە بێ پسانەوە لە حاڵەتی شۆڕش دابوە. بەڵام لە بارەی ئەم شۆڕشانە کە تا ڕادەیەک بە شێوەی دەستکرد بە ناوی شێخ سەعید( ١٩٢٥) و شۆڕشی ئارارات( ١٩٣٠) و شۆڕشی دەرسیم(١٩٣٧) ناسراون. شتی زۆریان لە بارەوە نە زانراوە.

لە ١٥ی فیوریەی ١٩٢٥ هەواڵدەری ئەنادۆلی لە بارەی ڕوو داوێک لە گوندی پیران، نیزیک گەنج، خەبەرێکی بڵاو کردەوە کە لە نێوان پەلێکی پێشمەرگە وکە سێک بە ناوە شێخ سەعیدەوە کە ٥٠کەسی لە مریدانی خۆی لەگەڵ بوە، پێک هەڵپڕژانێک ڕووی داوە و دوو ژاندارم کوژراون.

لە ٢٣ی فیوریە ڕۆژنامەکانی تورکیا ڕایانگەیاند کە ئەم ( هێرشە ڕێگرانەیە) شتێکی جیددیتر بوە، بەڵام ئەتاشەی نیزامی بەریتانیا لە قوستەنتەنیە هێشتا لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە دەوڵەتی تورکیا بۆ مەبەستی سیاسی و سیاسەتی خۆ جێیی و بۆ ڕاکێشانی نەیارەکانی یا لە بەینبردنیان ئەم ڕوو داوێە بە گەورە نیشان

دەدا.

لە ٢٤ی فیوریە وەزیری نێو خۆی تورکیا ڕادەگەیەنێ کە نەخشەی کار ئەوە بوە لە ئاخری مانگی مارس دا ڕاپەڕینی گشتی دەست پێبکات، لایەنگرانی شێخ سەعید لە حەفت هەزار کەس تێدەپەڕن. هێندێ سەربازی ڕاکردووش لە نێویاندا دەبینرێن. هێندێ لە ڕۆژنامەکانی تورکیا ڕادەگەیەنن کە بەریتانیا یارمەتی بە شۆڕشگێڕان دەکات. لە گەڵ ئەوەشدا ڕۆژنامەی( وطن) لەو بڕوایە دایە کە ڕیشەی ڕاپەڕین لە خەراپیی بەڕێوە بردنی ناوچە دایە. لە ٢٦ی فیوریە چاپەمەنی ڕادەگەیەنن کە تەواوی ناوچە لە دەست شۆڕشگێڕان دایە و بزووتنەوە لە بنە ماوە سروشتێکی ئایینی هەیە و ئامانجی ئەوەیە کە یەکێک لە کورەکانی سوڵتان عەبدولحەمید لە سەر تەخت دابنێ. بەڵام هیچ ڕۆژنامە و یا دیپلۆماتێکی ئورووپایی نەیانتوانی لە کەڕیانی شۆڕشی شێخ سەعید و ٣ ساڵیش دوای ئەو بچنە کوردستان و لە بەرانبەر ڕاپۆرتە یەک لایەنیەکانی چاپەمەنی تورکیادا مرۆڤ ناچارە پەنا بۆ هەست و گومان بەرێت. تەنانەت ئیمڕۆش سەرەڕای هێندێ بەڵگە و نووسراوە، ساخکردنەوەی ئەم ڕووداوەیە زۆر دژوارە.

کریس کۆچیرا زیاتر لە سەر ئەم باسە دەڕوا و بە ئاماژە لە چەند سەرچاوەی جۆر بە جۆرەوە دەنووسێ:«...... شۆڕشی کوردستان لە کاتێکا بەڕیا دەبێ کە ئەندامانی کومیسیۆنی نێو نەتەوەیی کۆمەڵی نەتەوەکان بۆ دیاریکردنی دوا ڕۆژی ویلایەتی موسل و دیاریکردنی سنووری عیراق و تورکیا لە موسل دەبن. مستەفا کەمال گومانی نامێنێ کە ئەم شۆڕشە ئینگلیز سازی کردوە. تورکیا لە مەترسی دایە.... ئینگلستان لە پشت سەری کوردەکانە و دژی تورکیا لە کوردەکان کەلک وەر دەگرێ. جاسوسەکان لە ناوچەدا لە هاتووچۆ دان. عەشیرەتەکان چەکدار دەکەن و هانیان دەدەن. ئینگلستان موسل و نەوتی دەوێ. کلیلی موسل و نەوت بە دەست کوردەکانە.»(LE PEUPLE، بروکسەل، ٢٨ی فیوریە ١٩٢٥ )

بەڵام لە قوستەنتەنیە ئالبر سارۆ بالیۆزی فەرانسە پێدادەگرێ کە دادگا بەڵگەیەکی باوەڕ پێکراوی ئەو تۆی نیشان نەداوە کە ئینگلستان دەستی لەو

شۆرشەدا بوویێت. لە ڕاستیدا ئینگلیزەکان لە سەرەتاوە لە خۆیان دەپرسی ئەکا ئەم شۆرشە پیلانی تورکیا بێ بۆ ئەوەی بخوازێ هێزە نیزامیەکانی خۆی لە ناوچەی سەر سنووری ویلایەتی موسل کۆ بکاتەوە و پاشان بە بیانووی پێشگری لە یارمەتی کوردەکانی ناوچەی دیاربەکر بە شۆرشگێران، هێزەکانی خۆی بۆ ناوچە بنێرێت.» (یاد داشتی جی.مورگان، وەزارەتی دەرەوەی ئینگلستان، ١٠٨٦٧ ٣٧١. چوارەمی مارسی ١٩٢٥)

کریس کۆچیرا لە بارەی نەخشی سۆڤێت لەو ڕووداوەیەدا دەنووسێ : «...... بە گوێرەی قسەی ئینگلیزەکان خالید جویرانلی لە وەرمێ لە گەڵ کونسولی ڕووسیا پێوەندی گرتوە و هەڵوێستی کونسولی ڕووس نەرێ بوە. ئەم وتەیە ڕاست بێ یا ناڕاست نوکتەیەک پشت ئەستور دەکات: ڕاپەڕینی شێخ سەعید لەو پەڕی خۆ گێل کردنی هێزەکانی ڕۆژئاوایی دا پەرەی گرت و ئاخرەکەشی تێک شکا. لە کاتێکا یەکێتی سۆڤێت بە شێوەیەکی فرە ڕەسمی بە زمانی ڕۆژنامەی (ئیزڤێستیا)ئەو شۆرشەی بە ڕاپەڕینی هێزەکانی دەرەبەگ و دژی شۆرشی کورد ناو برد کە بوونەتە داردەستی ئینگلیزەکان»( نووسراوەی ویلسون هاول، بەناوی یەکێتی سۆڤێت و کوردەکان، موتالایەک لە بارەی کەمایەتیەکی قەومی. تێزی نیشاندراو بە زانستگای ڤێرجینا وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا. ١٩٦٥)

کریس کوچیرا پاش باسی کەمارۆدانی دیار بەکر و پەرەگرتنی شۆرش وپەلاماری ئەرتەشی تورک و گیرانی شێخ سەعید و سەر کوتکردنی بێ بەزەییانەی ٣٠ هەزار سەر بازی تورک و کوشتار کوردانی بێ تاوان، چەند دێڕێک لە ئیدیعا نامەی دادستانی تورک دێنێتەوە ، نیشانی دەدا کە شێخ سەعید تەنیا دەمار گرژێکی ئایینی و مەزهەبی نەبوە. دادستان لە ئیدیعا نامەی خۆیدا دەڵێ:«... سەبەب و ڕیشەی ئەو شۆرشەی کە لەم دواییەدا لە ئوستانەکانی ڕۆژهەڵات، نیشتمانی ئەبەدی تورک هەڵگیرساوە، ڕاست هەر ئەوەیە کە بۆسنە و هەرزە گوینەی وەرگێڕا... ئامانج و مەبەستی شۆرشی کوردان هەر ئەوەیە کە سووریە و فەلەستینی توشی وێرانی کرد. ڕێنوێنی هێندێ لە ئێوە غەرەبی و خۆ هەڵکێشان

بوو. هێندێکی دیکەش کەوتوونە تە ژێر ئاواتی سیاسی بێگانان. بەڵام هەمووتان خاڵێکی هاو بەشتان هەبوو: دەتانویست کوردستانێکی سەر بەخۆ پێک بێنن. ئێستا بایی جنایەتی خۆتان لە سەر دار وەر دەگرن.» ( کریس کوچیرا، بزووتنەوەی میللی کورد. وەرگێرانی برایمی یونسی، تاران ۱۳۷۳، ل ۹۹- ۱۱۰

کارل درومان مێژوو نووسی چێک لە بارەی ڕاپەڕینی شێخ سەعیدەوە دەنووسێ: «.... پاش کۆنفرانسی لۆزان ئینگلیزەکان هەموو تواناى خۆیان بە کار هێنا کە سەبارەت بە مەسەلەی موسڵ مل بە تورکان ڕابکێشن و گیر وگرفتیان بۆ ساز بکەن. بۆ گەیشتن بەو ئامانجە دەبوایە کوردەکان ببزوێنن. کوردەکانی تورکیا بۆ سەربزێوی و ڕاپەڕین بەڵگە و بیانوی بە هێزیان بە دەستەوە بوو. گۆڕانکاری نێو تورکیا نەک هەر ئاوات و ئامانجی ئەوانی بەجێ نەگەیاند بوو، بەڵکوو باری ژیان و بەڕێچوونیان بە جارێک شپرزە ببوو، بەتایبەت سنووری تازەی دەستکرد کوردەکانی لە بازاڕی سوریا وعیراق بێبەش کرد بوو.ماڵیاتی قورس و بار گرانی ئەرتەشی تورک ببوە سەر بارێکی زیادیی بە سەر ژیانی کوردەکاندا. لە بەر ئەوە بۆ بانگەوازی ڕێبەرانیان بۆ ڕاپەڕین و سەر بزێوی، لێهاتوویی و ئامادەییان هەبوو. وەک ڕۆژنامەی مەنچەستیر گاردین ۲ی مارسی ۱۹۲۵دەنووسێ:« جاسوسانی ئینگلیز پێوەندیان لە گەڵ شێخ سەعید گرت وهانیاندا بۆ ڕاپەڕین. شێخ سەعید ڕێبەرێکی مەزهەبی باڵی گرنگی نەقشبەندی بوو. بۆ ئەم کارە دوو سەت هەزار لیرەیان دایە» لە ئانکارا بڵاویان دەکردەوە کە کوردستانی سەر بە خۆ لە ژێر ڕێبەرایەتی کوڕێکی سوڵتان دا، خەلافەت بۆ ئەستەمبوڵ دەگێڕێتەوە. ڕاپەڕیوەکان بەڵێنی یارمەتیان بە ڕێبەرانی پێشکەتنخوازی حیزبی جەمهوریش دەدا.

لە سەرەتاوە لە ئاخری ۱۹۲٤لە شەرناخ ویلایەتی وان سەر هەڵدان دەست پێکرا. لە مارسی ۱۹۲٤کوردەکان چەند شاریان گرت ودیاربەکریشیان گەمارۆ دا. بەڵام کەماڵیستەکان زۆر بە گورجی لێیان وەدەست هاتن. باج و ماڵیاتی زەوی وزاریان لە سەر خەڵک هەڵگرت. بەم هەنگاوە تاڕادەیەک فەرحانیەک کەوتە نێو گوندیان. ڕاپەڕین بە هێزێکی گەورەی نیزامی سەر کوت کرا. ئەنجامی ڕاپەڕین

بۆ کوردەکان تراژیدی بوو. وەک (ئارمستر و نگ.. Armstrong, Grey (wolf , london 1933 p, 265)دەنووسێ: « کوردستان لە ئاگر وئاسندا نوقم کرا. پیاوەکان ئەشکنجە کران و کوژران، ژنان دەست درێژیان بۆ کرا. زارۆک کوژران. گوندەکان سووتێنران. تورکی مستەفا کەمال کوردەکانیان بە وەحشی و بە دەستکردی سوڵتان و یونان و ئەرمەنی و بولغاری تاوانبار دەکرد.» دادگای لە نزرە بەدەری نیزامی بە ناوی « دادگای ئیستقلال» هەزاران کەسیان بە زیندانی ئەبەد و ئیعدام مەحکوم کرد. ٤٦کەس لە رێبەرانی راپەرین بە شێخ سەعیدیشەوە لە دیار بەکر لە سێدارە دران. ١٥٠٠ خێزان و بنە ماڵەی ناسراو لە کوردستان دوور خرانەوە و لە بەر یەک بڵاو کران و کەمالیستەکان لە ژێر دروشمی خەباتی دژی ئینگلیز و چاسوسەکانیان ئەو کارەساتەیان بەرێوە دەبرد: (کارل دورمان . رۆژهەلاتی ناوەراست لە سیاسەتی جیهانیدا. ١٩١٨-١٩٥٩ پراگ ١٩٦٦ ل ١٧١..»

راستیەکەی ئەوەیە راپەرینی شێخ سەعید رەنگدانەوەی بەرهەمی سیاسەتی کورد قڕانی مستەفا کەمال بوو کە دوای سەرکەوتن لە شەڕی دژی یونان بۆ تواندنەوی کورد بەرێوەی دەبرد. دوور نیە لە رەوەندی راپەریندا دروشمی ئاینیش بۆ هاندانی خەڵک بەرز کرابێتەوە، بەڵام گومانی تێدا نیە ئامانجی سەرەکی راپەرینی شێخ سەعید پێکهێنانی کوردستانێکی ئازاد و سەر بەخۆ بوە. هیچ بەڵگەیەکی باوەر پێکراو بۆ بوختانی پێوەندی لە گەڵ ئینگلیز و یا هاندان و پاڵ پێوەنانی ئینگلیز بۆ راپەرین بە دەستەوە نیە. بە پێچەوانە ئیمپریالیزمی فەرانسە لە سەرکوتکردنی راپەریندا یارمەتی بە تورکیا کردوە و رێگای پێداوە کە بە رێگای ئاسنی سەرووی سوریادا لەشکر بۆ مەیدانی شەڕ بنێرێ. «....... حکوومەتی تورکیا چەند جار ویستی ئەو بزووتنەوانە( بزووتنەوەی کورد.ح) وەک راپەرینەکەی شەریف حوسێنی حیجاز بە ناوی لۆرانسی بە ناوبانگەوە ببەستێتەوە. واتە بیکاتە فیتی ئەو. کە چی دوای لێکۆڵینەوەی ورد دەرکەوت لۆرانس هیچ کاتێک پێی نە ناوەتە ناو خاکی کوردستانەوە و ئەو رۆژانەی کەمالی یەکان دەیانگوت لۆرانس بە ناو کوردا دەگەرێت ئەو لە ئەفغانستان خەریک بوە. پێویستە ئەوەش بڵێین کە

ئەگەر بهاتایە و ئیمپریالیستەکان دەستیان لە ڕاپەڕینی ١٩٢٥دا هەبوایە، هەڵبەت کەمالییەکان نەیاندەتوانی وا بە هاسانی و بە خێرایی دایبمرکێننەوە. زۆر سەیرە لە سەر هیچی نەبوو ئەم هەموو پەت پەتێنە بە شێخ سەعید و ڕاپەڕینەکەی دەکرێ، لە کاتێکدا کەمالییەکان خۆیان دەمێک ساڵ بوو دەستیان لە گەڵ ئەمریکایی و فەرەنسەییەکاندا تێکەڵ کرد بوو، وە هەمە ڕەنگ پشی پشی یان بۆ ئینگلیز دەکرد.(د، کەمال مەزهەر، وتارێکی بێ ناو ونیشان، ر. هاوکاری ، ٢٢/٢/ ١٩٩٠)

کەندال نزان لەبارەی ڕاپەڕینی ساڵی٩٢٤ی کوردستانی تورکیاوە دەنووسێ:«...... ئەم ڕاپەڕینە دژ کردەوەی بابەتیی سروشتی و نیشاندەری هەستی خەڵک بوو. بە قسەی شارەزایێکی ئەو دەمی کار و باری تورکیا، لە لایەن کۆمەڵانی خەڵکەوە پشتیوانی لێدەگرا. هەر بۆیەش ئەنجامی سەر کوتکردنی لە ڕادە بەدەر وەحشەتناک و خوێناوی بوو. لە چواری سیپتامبری ١٩٢٥ شێخ سەعید و٥٢کەس لە هاڤالانی لە دیار بەکر لە دار دران. بۆ دڵنیایی لەوە(کە ئەم دەرسە لە بیر نەچێتەوە) هەزاران جوتیاری بێ ناو و نیشانیان بە بێ بەزەیی کوشت. سەدان گوندیان سووتاند و کاول کرد. لە پایزی ئەو ساڵەدا چوار سەت نیشتمانپەروەری کوردیان لە خاربوت و سەت کەسیشیان لە مش لە سێدارە دا. لافاوی سەرکوتکردن زیانێکی گەورەی لە جەبهەی نەیارەکانی مستەفا کەمالی-یشدا. لە ڕەوەندی ڕاپەڕینی کوردەکاندا قانونی« سەقامگرتوویی تازەی نەزم» دانراکە دەسەڵاتی دەدا بە هێزی ڕاپەڕاندن« هەموو چەشنە ڕێکخراو وبزووتنەوە و بڵاو کراوەیەک یاساغ بکا و هەڵبوەشێنێتەوە کە هێمنایەتی وڵات بخاتە مەترسییەوە و نەزمی گشتی تێکبدا. دەوڵەت لەم دەسەڵاتە ئەو پەڕی کەلکی وەرگرت و نەک هەر تەواوی ڕێکخراوە و بڵاو کراوە چەپیەکانی قەدەغە کرد، بەڵکوو ڕێکخراوە کرێکارییەکان و حیزبی«کۆماری پێشکەوتوخوازیشی هەڵوەشاندەوە کە بەرمیەکی بۆرژوازی موخالیف بوو. زۆر لە ژەنراڵەکانی ڕێژیم کە بە خەیانەت تاوانبار کرا بوون، لە وانە قەرە بەکر پاشا کە بە نووسینی نامە بۆ شێخ سەعید تاوانبار کرابوو لە سێدارە دران. بە گوێرەی اج.س. ئارمسترانگ، وابەستەی پێشووی نیزامیی

بەریتانیا لە تورکیا، دادگا نیزامییەکان حکوومەتی بەترسیان دامەزراندبوو. سرت و خورت و پەیڤێکی لاپرسەنی بەس بوو تا کابرا ڕاکێشنە پشتی مێزی دادگا. ڕێژیمی مستەفا کەمال لە کاتێکدا کە کوردەکانی بە تاوانی هەنگاو هاویشتن بۆ پێکهێنانی کوردستانی سەر بەخۆ دادگایی و مەحکووم دەکرد و لە سێدارەی دەدان، هەر لەو کاتەشدا بزووتنەوەی کوردی بە بزووتنەوەیەکی کۆنە پەرستی بە دنیا نیشان دەدا کە ویستوویەتی خەلافەت بگێڕێتەوە وئالی وەسمان بێنێتەوە سەر تەختی پاشایەتی. ئیدیعای دەکرد کە بەریتانیا بۆ خنکاندنی تورکیای تازە پشتیوانی لە کوردەکان کردوە. هەر چەند ئەم تەبلیغاتە فری بە ڕاستییەوە نەبوو، بەڵام کارکردیشی زۆر بوو. ڕاستە کە لە ڕاپەڕیندا دروشمی ئایینی بەرز دەکرانەوە، بەڵام پێویستە وەبیری خەینەوە کە مستەفا کەمال خۆشی لە ڕەوەندی شەڕەکانی سەر بەخۆییدا، لە دروشمی ئایینی کەلکی وەر گرتبوو. داخوا ئەمە بەو مانایە بوو کە ئەو بۆ خەلافەت شەڕی دەکرد و خەباتەکەی ئایینی بوو.؟ سەرەڕای ئەوە کە هێندێ لە کەسانی گرنگی بزووتنەوە، وەک فەوزی پاشا و قەرە بەکر پاشا موسوڵمانی دین باوەڕ بوون، ئاشکرایە کە بزووتنەوەی مستەفا کەمال بزووتنەوەی ئایینی نەبوو، ئامانجی سەرەکی سەر بەخۆیی میللی بوو. ئەم حوکمە لە بارەی بزووتنەوەی شێخ سەعیدیش هەر ڕاستە. ئەوەندەیە لە جیاتی ژەنراڵێک، شەخسیەتێکی ئایینی ڕێبەری بزووتنەوە بوو. ئەمەش هیچ گۆڕانێک لە ئامانجی سەرەکی بزووتنەوە و ئاواتەکانی خەڵک بۆ ئازادی کوردستان پێک ناهێنێ.

مرۆڤ دەتوانێ پرسیار بکا: بۆچی کاتێ ساڵی ١٩٢١ لە منەمن لە ئاناتۆڵی ڕاپەڕینێکی وەرزێڕی بە ڕێبەرایەتی شێخێکی تورک بەر پابوو، هیچ بەوە تاوانبار نەکرا کە ویستوویەتی ئەناتولی سەر بەخۆ پێک بێنێ. ؟ ئامانجەکانی بزووتنەوەی شێخ سەعید چی بوو؟ دادگایەکی کە ئەوانی مەحکوم کرد، هیچ گومانی لەوەدا نە هێشتەوە کە :« مەسەلەی گرنگ پێکهێنانی وڵاتێکی سەر بە خۆی کورد بوو.» ( کەندال نزان، کوردەکان، وەرگێڕانی برایمی یونسی، ١٢٠٧، ل ١٠٨ – ١١٠)

زۆر لە چاوەدێرانی سیاسی ناسیۆنالیزمیان بەهۆی سەرەکی و بنگەهی ئەو

راپەڕینە زانیــوە. بۆ نموونە جــەواهیــر لال نەهرۆ لەم بارەوە دەنووسێ :
«... تورکەکان کە خۆیان لەم دوایەدا بۆ سەربەخۆیی شەڕیان کردبوو، چۆنە کە کوردەکان قەتڵ عام دەکەن بەو تاوانە کە بۆ سەر بەخۆیی خۆیان تێدەکۆشن. بە راستی سەیرە کە ناسیۆنالیزمیکی بەرگری لە خۆی دەکرد، ببێتە ناسیۆنالیزمێکی پەلامار دەر و خەبات بۆ ئازادی بکاتە ئامراز بۆ دەسەلات و زاڵبوون بە سەر خەڵکی دیکەدا...» ( جەواهر لال نەهرۆ، ئاوڕێک لە مێژووی جیهان، ۱۹۳۵ بەرگی ۲ ل ۱۱۰۸) ک .ح

## تێهەڵکێش:

لە نووسین و ئامادە کردنی ئەم بەشەی ڕاپەڕینی شێخ سەعید ببوومەوە کە کتێبی«راپەڕینی شێخ سەعیدی پیران» نووسینی(رابیرت ئولسین) وەرگێڕاوەی برایمی یونسی گەیشتە دەستم. دوای خوێندنەوە دیتم راپەڕینی شێخ سەعید گەلێک بەربلاوتر و قوڵتر و سەرنجراکێشترە لەوەندەی ئاغای کاوە بەیات بە کورتی باسی کردوە و یا ئەم چەند کۆپلەی من لە نوسراوەی نووسەرانی دیکە وەرم گرتوە. هاتمە سەر ئەو باوەڕە کە لە نووسینی«رابیرت ئولسین»یش بەر کوڵێک هەڵێنجم و باسی راپەڕینی شێخ سەعیدی پێ چڕتر بکەم. دەبێ ئەوەش بڵێم ئەم بەر کوڵەش هەڵبژاردەیەکی زۆر کورتە لە نووسین و لێکدانەوەی « رابیرت ئولسین» کە بە پشت ئەستووری گەلێک بەڵگە و دوکۆمێنت و سەر چاوەی جۆر بە جۆر، بە تایبەت ئەرشیوی وەزارەتی هەوایی ئینگلستان ئامادەی کردوە. ناوبراو خۆی لەم بارەوە دەڵێ:«.... ساڵی ۱۹۷۹-۱۹۸۰ کە بۆ وچانی ساڵانە لە ئینگلستان بووم، هاتمە سەر ئەوە، بزانم داخوا لە بارەی راپەڕینی شێخ سەعید و سیاسەتی بەریتانیا سەبارەت بە کوردەکان لە ساڵەکانی ۱۲۹۱تا ۱۲۹۸ بەڵگە و ودوکۆمێنت لە دەست داهەنە؟ بە سەر سوڕمانەوە توشی هەزاران بەڵگە و نووسراوە بووم بە تایبەت لە دەوسیەکانی وەزارەتی هەوایی دا. پێشتر لە شیکردنەوەکانی راپەڕینی شێخ سەعید دا ،لە بەڵگەکانی وەزارەتی هەوایی کەڵک وەرنەگیرابوو. دەوسیەکانی ژمارە

٢٦٢/٢٢ و ٢٢٧ و ٢٢٨ و٢٣٩ له چوار پوشـــەی گـەورەدا بە نـاوی«شـۆرشـی شـخ سەعید» لە شوێنێک دانرا بوون. ئەم چوار پوشەیە بە تەنیا ٢٠٤بەڵگەیان سەبارەت بە ســــەر دەمی ٢٦ی ژانویـەی ١٩٢٦تا ژانویـەی ١٩٢٨تێــــدا بوو. وەک لە یـاد داشـتـەکاندا ڕوونکراوەتەوە، ئەم بەڵگانە تەنیا بەشـێک بوون لە مـەتلەبی سـەرنج ڕاکێش کە لە بارەی شۆرشی شێخ سەعید لە دەوسیەکانی وەزارەتی هەوایی دا پارێزرابوون..... دەزگای ئیتیلاعاتی هێزی هەوایی بەریتانیا لە عیراق لە ساڵی ١٩٢٢تا سـەر هـەڵدانی ڕاپەڕینی شـێخ سـەعیـد ١٩٢٥، سـەرچاوەی دابینکردنی زانیـاری بوە سـەبارەت بە کوردەکـان و عـیـراق و ڕۆژ هـەلاتی تورکیـا. لە لایەکی دیکەوە زۆر لە بەڵگەکـانی وەزارەتی دەرەوە لە سـەر بنەمـای ئەو ڕاپۆرتانە ئامـادە کراون کە وەزارەتی هەوایی بۆ وەزارەتی موستەعمەراتی ناردوە...»

لە بەر ئەوەی باسـەکەی ئێمە پێوەندی بە ڕاپەڕینی شێخ سەعیدەوە هەیە، بۆیە لەم بەشـەی کتێبەکەی«رابیرت ئولسین» هێندێ شتم بە کورتی و بە هـەڵبژاردە دەر هێناوە کە زانیارییەکی زیاتر دەدا بە خوێنەری کورد، ئەگینا سەرجەمی کتێبی ناو براو کـە خـۆی لە ٢٤٠ لاپەرە دەدا، ئـەگـەر بکرێ بە کـوردی لە ڕاپەڕینی شـێخ عوبیدوڵلاوە تا ڕاپەڕینی شێخ سەعیدی پیران زانیارییەکی یەکجار زۆر و بەنرخ دەخاتە سەر گەنجینەی مێژووی ئەو سەردەمی کورد کە ڕەنگە زۆری تا ئێستا بەم شێوەیە نە هاتبێتە سـەر کاغەز و باسـی نەکرا بێت. ئەوەندە هەڵێنجانە منیش بەشێکی زۆر کورت و پچر پچری کتێبی ناوبروە.

## « دامەزرانی ئازادی »

ڕێکخـراوی نەتەوەیی کورد کـە بوو بەهۆی ڕاپەڕینی شـێخ سـەعیـد(جیڤـاتا ئازادیٚ کـــورد)cwata Azdi kurd کە پاشـان بوو بە « جـیڤـاتا خۆوە سـەریا کـــــورد»civata xowe seriy kurd، بە کـورتی بە(ئازادی)نـاودەبرا. ڤـان براونیسن دەڵێ:«ئازادی» لە ١٩٢٣دا پێکهـاتوە، بەلام نیزامیـە کـوردەکان کـە لە ڕاپەڕینی چواری سـەپتـەمبـەری ١٩٢٤ی بێت شـەیاب دا بەشـداریان کـرد بوو، لە

راپۆرتی خۆیاندا بۆ دەزگا ئیتیلاعاتی بەریتانیایان گوتویانە: ئەم ڕێکخراوەیە ساڵی ١٩٢١لە ئەرزەڕوم دامەزراوە. ئاگادارییەکی تەواو لە بارەی «ئازادی» یەوە لە بەر دەست دانیە. چونکە زۆر بە نهێنی لە ئەنەدۆڵ دەستی بەتێکۆشان کرد بوو. ڤان بروئین سەن هەوەڵین توێژەرێکە کە پەنجە دەخاتە سەر گرنگی ئەو ڕێکخراوەیە. دەزگای ئیتیلاعاتی بەریتانیا زۆر ترین زانیاری لە بارەی « ئازادی»یە لەو ئەفسەرانە وەر گرتوە. پێنج ئەفسەری کوردی ڕاکردوو بریتین لە: عەلی زەکی کوری والی، ئیسماعیل حەقی ئەفەندی کوری محەممەد عەلی خەڵکی موسڵ، ئیحسان بەگ کوری نووری بەگ خەڵکی بیتلیس، توفیق ئەفەندی کوڕی حەسەن خەڵکی ماردین و ئەحمەد ڕاسیم ئەفەندی کوڕی مقدال خەڵکی جان کە هەموویان لە هەنگی ١٨ی لەشکری دووەمی ئەرتەشی حەفتەمی تورکیادا خزمەتیان کرد بوو. ئیحسان نووری و توفیق ئەفەندی و ئەحمەد ڕاسیم ئەفەندی سەر چاوەی زانیاری « ئازادی» بوون.

ئەگەر «ئازادی» نەک لە ١٩٢٣، بەڵکوو لە ١٩٢١دا پێکهاتبێ، مانای وایە ڕاپەڕینی کۆچگیر و ئانجامەکانی و سەر هەڵدانەکانی ناوچەی دەرسیمیش لە ساڵەکانی ٢١ و ٢٢دا، لە دامەزرانی ئەودا کاریگەر بوە.

بە گوێرەی قسەی ئەم ئەفسەرانە دامەزرانی«ئازادی» بەرهەمی گەلێک هۆکاری جۆر بە جۆر بوە. پێویستە وەبیری خەینەوە کە دەزگای ئیتیلاعاتی بەریتانیا لە وتو وێژ و بەراورد کردنی قسەی ئەفسەرانی کورد و چۆنیەتی و هۆی دامەزرانی «ئازادی» زەحمەتی زۆری کێشا. زانیاری ئەفسەرانی کورد زۆر ڕاست دەرچوو. ئەوان گوتیان کە «ئازادی»ساڵی ١٩٢١ لە ئەرزەڕوم لە لایەن سەرهەنگ خالید بەگ جبران، فەرماندەی پێشووی پادگانی ئەرزەڕوم دامەزراوە. لقەکانی دیکەشی لە ژێر چاوە دێری لقی هەوەڵێ دامەزراون. ئەژماری لق و ڕێبەرانی بە نهێنی ڕاگیراون. ئەفسەرانی کورد گوتیان بە ڕاستی نازانن چەند لقی هەنە. بەڵام دەزانن لە دیاربەکر، سیرت، ئەستەمبوڵ، دەرسیم، بیتلیس، قارس، هینیس، موش، ئەرزنجان، مەلازکرد، خارپوت و ڤان لقی هەبوە. بە گشتی ٢٢لق و ناوی ئەو

کەسانەشیان هێنا :«..خالید بەگ جبران( ئەرزەڕوم)، جەمیل پاشا ئەکرەم(دیاربەکر)مکوێر حوسێن پاشا فەرماندەی تایفەی حەیدەران( سەرۆکی لقی مەلاز گرد )خالید بەگ تایفەی حەسنیان( سەرۆکی لقی وارتو)یوسف زیا بەگ ( سەرۆکی لقی بیتلیس)حاجی موسا بەگ( موش سەرۆکی تایفەی موتکی و کویتە)بێت حاجی بەیرام(سەرۆکی تایفەی شرناک) ئەیوب بەگ( ماردین لە تایفەی میلان)فارس عیسا براپاغا( نیزیک ماردین، لە تایفەی داکوری) مەحمود بەگ کوری برایم پاشا( لە تایفەی میللی)سمکۆ (ڕێبەری ناسرای شکاک)»

ئەفسەرانی کورد گومانیان نەبوو کەتەواوی تایفە و عەشیرەتی کورد بە پێرەوی لە هەستی نەتەوەیی و ئایینی، پشتیوانی لە « ئازادی »دەکەن. ناوی ئەو سەرۆک تایفانەشیان بەدەزگای ئیتیلاعاتی ئینگلیزڕاگەیاندکە پشتیوانی«ئازادی» ین........

ئەفسەرانی ڕاکردووی کورد لایان وابوو کە تایفەکانی ناوچەی مەلازگرد و بیتلیس و موش پێنج هەزار تفەنگیان هەیە.«ئازادی» لە مانگی ئاوگوستی١٩٢٤ بەولاوە لە سەربزێویی تایفەی ئەو ناوچانە پشتیوانی کردبوو. وای لێهاتبوو کە هێزی دەوڵەتیی کەمتر لە ٢٠٠ کەس نەیاندەتوانی لە موشەوە بچنە بیتلیس. وایان لێک دەدایەوە کە تایفەی بۆتانی ناوچەی شرناک دەتوانن ٢تا٣ هەزار شەر کەر ئامادە بکەن. ناوی تەواوی ئەو ئەفسەرە کوردانەیان دا بە ئینگلیزەکان کە پێشتر لە ئەرتەشی حەفتەمی تورکیادا سەروان پاستوان و ئەندامی «ئازادی» بوون. لە ئەنجامی دامەزرانی«ئازادی»دا، کوردەکان زۆر زیاتر لە ڕاپەڕینی کۆچگیری ١٩٢١ بۆ ڕاپەڕین ١٩٢٥ ئامادە دەبوون. ئەفسەرانی کورد بۆ دەستپێکردنی ڕاپەڕینی چەکدارانە(بە لێکدانەوەی ئینگلیزەکان) یازدە هۆی سیاسی یان باس دەکرد. ئەم ژمارەیە لە بەر گرنگی لە ٢یا٣ سەرچاوەی دیکەش باس کراوە و داخواز و هاواری کوردەکان پێش ڕاپەڕینی شێخ سەعید ڕادەگەیێنن:

١- دانانی قانونی تازە لە بارەی کەمایەتیەکان کە هەر ئێستا لە بارەی مەسیحیەکانەوە بەکار دەبرێت. دەوڵەتی تورکیا خەریکە تەواوی حەشیمەتی کوردی ویلایەتەکانی ڕۆژهەلات بۆ ئەنەدۆلی ڕۆژ ئاوا دوور خاتەوە و تورکان بێنێتە

جێگای ئەوان. بەم شێوەیە دەیەوێ بۆشایی پێکەوە نووسانی تورانیی لە مودیتەرانە و ئەو سەری ئەنەدۆڵ تاقەفقاز و ئەو بەری خەزەر و تورکستان پڕ کاتەوە. هەر لە ئێستاوە زۆر لە ڕۆشنبیر و خوێندەواری کوردی لە ئەنەدۆڵی ڕۆژ هەڵات دوور خستۆتەوە و تورکیان هێناوەتە جێگای ئەوان.

٢- هەڵوەشانەوەی خەلافەت لە لایەن حکوومەتی ئەنکاراوە کە یەکێ لە پێوەندییە کەمەکانی پاشماوەی نێوان کورد و تورکانە.

٣- ئیجباری کردنی زمانی تورکی لە دادگا و مەدرەسەکان و قەدەغە کردنی فێر بوونی زمانی کوردی لە مەدرەسەکان. ئەم کارە فێر کردنی لە نێو کوردەکان بە گشتێ لە بەین بردوە. ئەوەش شتێکە کە تورک پەسندی دەکەن.

٤- وشەی کورد لە تەواوی کتێبەکاندا سڕاوەتەوە و ناوی جوغرافیای دیکە لە جێگای ناوە کوردییەکان دانراون.

٥- کار بەدەستی بەرزی حکوومەت بێ ئەم لاولا هەموویان تورکن. تەواوی کەسانی گومان لێکراوی نەتەوەیی کوردیان لە ئیدارەکان وەدەر ناوە.( کوردەکان ویلایەتەکانی ئەرزەڕوم و ئەرزنجان و بیتلیس و جان و دیاربەکر و خارپوت بە کوردستان دەزانن کە دەبێ ویلایەتی هەکاریشی لێ زیاد بکرێ.

٦- نەبوونی خزمەتگوزاری دەوڵەتی لە بەرانبەر ئەو مالیاتانەی کە وەریان دەگرێ. هەر چەند زۆر جار لە ساڵدا دوو جار مالیات وەر دەگرێ هیچ کارێک لە ئیداری دەوڵەتیەکاندابە بێ بەرتیل بەڕێوە ناچن.

٧- دەست تێوەردانی حکوومەت لە هەڵبژاردنی نوێنەرانی مەجلیسی میللی تورکی لە ویلایەتانی کوردستان. نیزیکەی تەواوی ئەو نوێنەرانە بە فەرمانی دەوڵەت هەڵدەبژێردرێن، نەک بە دەنگی ئازادی خەڵک.

٨- سیاسەتی تورکیا لە بە گژ یەکداکردنی تایفەکانی کورد بۆ پێشگری لە یەکێتی نەتەوەیی و تواندنەوەی هێزی بەر بەرەکانی ئەوان لە بەرانبەر ملهوڕی و زۆر داری حکوومەت دا

٩- داگیر کردنی گوندەکانی کورد لە لایەن ئەرتەش و دەست بەسەرداگرتنی

ئاژەڵ و ماڵاتی خەڵک و کەلک وەرگرتنی خەراپ لە نرخی ئاژەڵ و شتو مەکی داگیر کەر.

١٠- رەفتاری دزێو لە گەڵ سەربازانی کورد لە ئەرتەشدا و هەڵبژاردنی ئەوان بۆ کاری دژوار و ناخۆش.

١١- هەوڵی حکوومەت بۆ تالانکردنی سامان و کانگا ژێر زەویەکانی کوردستان بە یارمەتی سەرمایەی ئەڵمانی.

بەقسەی ئەفسەرانی کورد «ئازادی» -لانی کەم لە ئاخری مانگی نوڤەمبەری ١٩٢٤- سێ ئامانجی سەرەکی هەبوە: رزگار کردنی کورد لە ژێر ستەمی تورکان، رەخساندنی دەرفەت بۆ خەڵکی کورد بۆ ئاوەدانکردنەوەی وڵاتی خۆیان و راکێشانی پشتیوانی بەریتانیا، چونکە دەیانزانی کوردستان بە تەنیا توانای ئەم کارەی نیە. ئەفسەرانی کورد دەیانگوت: یەکێتی سۆڤیێت پێشنیاری یارمەتی پێکردووین، بەڵام ئەوان ئەو پێشنیارەیان رەت کردۆتوە، بەو هیوایە کە بەریتانیا بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە یارمەتیان بدات. بۆ گەیشتن بەو مەبەستە مەئمورییەت درا بوو بەو ئەفسەرانە، پێوەندی دۆستانە لە گەڵ بەیتانیا بەر قەرار بکەن و یارمەتی ویشتیوانی دەوڵەتی بەریتانی دەستە بەر بکەن. هێندێ کورد لە بەغدا بوون و لەگەڵ سەرۆک تایفەکانی و ناوەندی«ئازادی» لە رێژەوی چەمی خاپورەوە تائەرزەروم، لە پێوەندی دابوون. ئەو ئەندامانەی «ئازادی»دەسەڵاتی تەواویان پێدرا بوو، تا بزووتنەوەی شۆرشگێری لە ژێر رێنوێنی بەریتانیادا بخەنە کار، بەو مەرجە کە بەریتانیای مەزن بەڵێنی یارمەتی بدات. بۆ گەیشتن بۆ ئەم مەبەستە، هەر ئێستا لە سەرووی سیرت بزووتنەوە دەست پێکراوە. ئەم ئەفسەرانە مەئمورەکانی ئیتلاعاتی بەریتانیا یان دڵنیا دەکرد کە لە ناوچەکانی دیکەی کوردستانیش ئەم جۆرە بزووتنەوانە دەست پێدەکەن.

ئەفسەرانی ناوبراو بۆ پشتیوانی لەم ئامانجانە سێ داخوازیان هەبوو. یەکەم ئەوە کە ئەفسەری ئینگلیزی لە بەغداوە تاناوچەکانی سنووری راپەرین، هاوڕێییان بکات. دووەم رێگایان پێبدرێ بۆ پوچەڵکردنەوەی تەبلیغاتی تورکەکان و بڵاو

کردنەوەی بیری شۆرشگێری لە کوردستان، ڕۆژنامەیەک لە موسڵ دەر بکەن. سێیەم ئەوە کە ڕێگا بە کوردەکان بدرێ لە زاخۆ ناوەندێک پێک بێنن کە دەرفەتیان پێبدات لە گەڵ سەرۆک عەشیرەتەکانی گۆیان و سلوپی و شرناک لە پێوەندی نیزیک دابن. «ئازادی» لە ڕێگای ئەو کەسانەوە دەیتوانی ڕۆژنامە بگەیێنەوە نێوە ڕاستی ولاتیان.«ئازادی» هیواداربووبە ئەنجامدانی هێندێ شت، بەوئامانجانە بگات. چاوە ڕوان بوون بەریتانیای مەزن یە چەک و پارە یارمەتیان بدات و دڵنیایان بکات کە لە کاتی سەرکەوتندا پشتیان بەرنادا. لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە دەتوانن بە ناوی کوردستان ڕاپەرینێک ساز بکەن کە کوردەکان تا ئاخرین کەس پشتیوانیان لێبکەن، لەم بارەوە حیسابەکەیان بە هەڵە دەرچوو.

بەبڕوای ڤان براونیسن و سەرچاوە زانیارییەکانی ئەو« ئازادی» هەوەڵین کۆنگرەی خۆی ساڵی ١٩٢٤ پێکهێنامەر چەندە ڕۆژی پێکهاتنی کۆنگرە دیار نیە. شێخ سەعید کە ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٢٥ ڕێبەرایەتی کرد، یەک لە شێخە مەزنەکانی نەقشبەندی بوو، لە گەڵ خالید بەگی جبران-یش خزمایەتی هەبوو. هاو سەردەمانی ئەو دەڵێن ئەتەوە باوێکی بەتین و سەبارەت بە نفوزێکی زۆری کە لە نێو زازایانی سەرووی ڕۆژهەلاتی دیاربەکردا بوویەتی، بۆ کۆنگرە بانگ کرابوو. فەرماندەکانی حەمیدیەی پێشوش لە کۆنگرەدا بەشدار بوون. گوڕ وتینی ئەوان بۆ بەشداری لە ڕاپەڕین، وەک دەڵێن لە گوڕ و تینی شێخەکانی وەک شێخ سەعید کەمتر بوە. بەلام شێخ سەعید ئەوانی بەم کارە ڕازی کردوە. ئەوە نیشانەی پشتیوانی زیاتری ئەو بوە لەو ڕاپەڕینەی کە دەهات ئامادە بکرێ.

هەوەڵین کۆنگرەی «ئازادی» دوو بڕیاری گرنگی دان. یەکەم: بڕیاری دا ڕاپەڕینی گشتی دەست پێ بکرێ و هاو کاتیش لەگەڵ ئەو، سەربەخۆیی ڕابگەیێنرێت. دووەم: پێداگرتن لە سەر یارمەتی و پشتیوانی دەرەوە. کۆنگرە بڕیاری دا کەلە گەڵ یەکێتی سۆڤێت و بەریتانیای مەزن پێوەندی بگیرێ. هیچ یەک لەم دوانە نەیانگوت پشتیوانی لە ڕاپەڕین دەکەین، بەلام هیچ کامیشیان لە گەڵ ڕاپەڕین موخالیفەتیان نەکرد. وادیارە کوردەکان ئامادە بوون پشت بە خۆیان

ڕاپەڕین دەست پێبکەن.

ڤان براونێسن دەڵێ: کۆنگرەی یەکەمی «ئازادی» لە ١٩٢٤بەستراوە. سەبارەت بە نەخشێکی گرنگی کاریگەر کە ئەم کۆنگرەیە لە داڕشتنی بەرنامەی ڕاپەڕینی فیوریەی ١٩٢٥ی شێخ سەعید و ڕاپەڕینی شەوی ٣-٤ی سپتەمبەری ١٩٢٤ی بێت شەباب دا، بوویەتی، دیاریکردنی شوێنی کۆنگرە گرنگی خۆی هەیە. بە گوێرەی وتەی ئەو ئەفسەرانەی کورد کە بۆ موسل ڕایانکرد، ڕاپەڕینی بێت شەباب بۆ پوچەڵکردنەوەی نەخشەی تورکان سەبارەت بە توند و تیژی سەر کوتکردنی کوردان و هەر لەو کاتەشدا بە مەبەستی پێشگری لە پەرە گرتنی زیاتر و باشتری هێزەکانی تورک لە بەرانبەر هێزەکانی ئینگلیزی نیشتەجێی عیراق کە زۆربەیان لە بەکرێگیراوانی ئاسوری و هیندی پێکهاتبوون، دەستپێکراوە. تورک لە نەخشەی خۆیاندا حەوت مەبەستی گرنگیان هەبوو

١- قایم کردن وبە هێزکردنی شوێن و هەڵوێستی خۆیان، پێش بارینی بەفر.

٢- پڕ کردنی عەمبار و ئاوەندی شتو مەکی پێویست.

٣- ساز کردنی ڕێگاو بان.

٤- پێکهێنان و جێگیر کردنی یەکانی بچوک لە نێو تایفەکانی کورد ودابینکردنی پێوەندی لە گەڵ شێخ مەحمود لە عیراق و بە هێز کردنی چاودێری بە سەر چیاکانی کە بە سەر دەشتی موسڵدا دەڕوانن.

٥ - پاش دابینکردنی ئەم مەبەستانە، داگیر کردنی ناوچەکانی کەرکوک و سولەیمانی.

٦- ئامادەیی بۆ کەلک وەر گرتن لە عەشایری باکور بۆ پڕوپاگاندەی شۆرش دژی بەریتانیا لە نێو تایفەکانی خوارووی عیراق، لە تۆڵەی ئەم کارەدا، ڕێگا دەدرێ بە عەشایر کە دێهاتی مەسیحیەکان تالان بکەن، هاروژاندنی خەڵک بۆ خەزای دژی ئینگلیز و ناهومێد کردنی کوردەکان لە پشتیوانی دەوڵەتی بەریتانیا.

٧- جێگیر بوون لە کەرکوک و سولەیمانی بۆ چاوەڕوانیی ئەنجامی وتو وێژی مەسەلەی موسڵ و ناچار کردنی کۆمەڵەی نەتەوەکان بۆ دەنگدان بە قازانجی

خۆیان........

ئەفسەرانی کورد لایان وابوو، تورک بەم سیاسەتە هیوادار بوون کە هیوای کوردەکان بۆ گەیشتن بە سەر بەخۆیی و ڕزگاری لە ستەم و کۆیلەتی ئەوان بۆ هەمیشە چاڵ بکەن. کوردەکانی ئەندامی «ئازادی»بە دەزگای ئیستیلاعاتی ئینگلیزیان ڕاگەیاند کە وابیر دەکەنەوە لە سەتا پەنجای ئەفسەر و سەربازی ئەرتەشی حەفتەمی جێگر لە دیار بەکر، کورد بن ویشتیوانیان لێ بکەن. جگە لەوە لایان وابوو نیزیکەی لە سەتا بیستی ئەفسەر و سەر بازی تورک لە گەڵ ئاوات و ئامانجی کوردەکان هاو دەنگ بن.

بە بیر و هیواو پشتیوانیی سیاسەتێکی ئاوا بوو کە ڕێبەرانی«ئازادی» شەوی ۳-٤ی سەپتەمبەری ۱۹۲٤ لە بێت شەباب ڕاپەرین. ڕاپەرینی بێت شەباب ۲ ئامانجی سەرەکی هەبوو.: پێشگری لە هەڵوێستی دوژمنانانەی تایفەکانی کورد دژی هێزەکانی بەریتانیا لە عیراقدا . پێشگری لە کۆبوونەوەی هێزەکانی تورک لە تەپۆڵکەکانی ئاشور، ئاخرەکەشی کز کردنی ورەی ئەرتەشی تورک. کوردەکان هیوادار بوون ئەگەر لە بێت شەباب لەم ۲ ئامانجەدا سەر کەون، سەرنجی تورکەکان بۆ ئەو بزووتنەوانە ڕابکێشن کە لە ناوچەکانی بیتلیس و ڤان و دیاربەکر دەست پێدەکرێن و عەمەلیاتی تورکان لە باشور ڕابگرن. ڕاپەرینی بێت شەباب لە کاتێکا دەست پێکرا کە ڕێبەرانی «ئازادی» هێشتا نەیانتوانیبوو تێکۆشانی خۆیان لە گەڵ ڕێبەرانی تایفەکانی کورد بکەنە یەک. لە ئەنجامدا تایفەکان ڕانەپەڕین. ئەفسەری تورکی فەرماندەی پادگانی بێت شەباب لە نەخشەی ڕاپەرینەکە ئاگادار بوو. دەست بە جێ بۆ گرتنی گۆمان لێکراوان کەوتە خۆ. وەک پێشتر باسمان کرد، ڕێبەرانی گرنگی ڕاپەڕین، ڕایانکرد و چوونە عیراق. ئەنجام و بەرهەمی ئەم کارە ئەوە بوو کە ۳ گروهان لە گوردانێک و یەک گروهان لە گوردانێکی دیکە بە خڕی ڕایانکرد. هەموویان ٥٠٠ ئەفسەر و سەر باز بوون. چەخماخەی چوار تۆپیان هێنا دەرو شاردیاننەوە و ۱۲ شەست تیریان لە گەڵ خۆ برد.

کوردەکان لایان وابوو کە تورک لە ماوەی چەند حەوتووی داهاتوودا، بۆ سەر

کوتکردنی بەربەرەکانی « ئازادی» هێز کۆدەکەنەوە. یادەگانەکان لە مانگەکانی سەپتەمبەر و ئۆکتۆبردا لاوازن، پێویستە پێش ئەوەی هێزی پشتیوانیان بگاتێ، ڕاپەڕین دەست پێ بکرێت. دەزگای ئیتیلاعاتی بەریتانیا نەخشەی کوردەکانی بە شتێکی خەیاڵی و دوور لە واقعیەت دادەنا. بەڵام زۆر توندیش کەوتبوە ژێر کارکردی ئەوە کە ئەفسەرانی کورد نەیاندەویست لە عیراق لە ئەرتەشی بەریتانیادا کار بکەن. حەزیان دەکرد هەتا زوە بۆ کوردستان بگەڕێنەوە و ڕاپەڕین دەست پێبکەن. ئینگلیزەکان لە ڕاپەڕینی بێت شەبابدا، ڕاستی سیاسەتێکیان چاو پێکەوت کە پتر لە ٣٠ ساڵ بوو بە دوایەوە بوون. زانیان کە لە کاتی شەڕ لە گەڵ تورکیا، «ئازادی»چەکێکی بە هێز دەبێ بە دەست ئەوانەوە. تەنانەت لە سەر دەمی ئاشتیشدا بە قازانجی ئەوان دەبێ. یەکێ لە ئەفسەرانی« ئیدارە و خزمەتە تایبەتیەکان» دەنووسێ: هەڕەشەی ئارام و بێ هەرا، لە ڕێگای هاندانی ناسیۆنالیزمی کورد، بە هیچ جۆر کارێکی دیپلۆماتی بێ کەلک نابێ. هەڕەشەی ناسیۆنالیزمی کورد لە نێو سنوورەکانی عیراق، سەبارەت بە حەشیمەتی بەر چاوی کورد لەم ساڵانەی ڕابردوودا زۆر کاریگەر بوە. ئەفسەرانی ڕاکردووی کورد چەند جار پشتیوانیی« ئازادی» یان لە عەمەلیاتی ئینگلیز دوو پات کردەوە.........

سیاسەتی دەوڵەتی بەریتانیا بۆ کەلک وەر گرتن لە کوردەکان وەک ئامرازێکی دیپلۆماسی و سیاسی و نیزامی دژی تورکیا ماوەیەک پێش ڕاپەڕینی بێت شەباب، دەست پێکرا و بەکار هێنرابوو...

## لە بێت شەبابەوە تا پیران

ڕاپەڕینی ٣-٤ی سەپتەمبەری بێت شەباب، نەخشەی «ئازادی»بۆ ڕاپەڕین وەپێشخست. ئەو ڕاپەڕینە سەرنجی تورکانی بۆ هێزی ڕێکخراوی «ئازادی» ڕاکێشا کە زیاد لە ٥٠٠ ئەفسەر و سەرباز لە ڕاپەڕیندا بەشدارییان کرد بوو. لە تەواوی پایزی ١٩٢٤دادگا عەسکەرییەکان لە دیاربەکر و بیتلیس بە توندی لەکاردا بوون. وەزیرێکی پێشووی دەوڵەتی تورکیا کە سەرچاوەی گرنگی زانیارەییەکانی

ئینگلیز بوو، لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە بە ئەنجام نەگەیاندنی ڕێککەوتنەکانی کۆنگرەی هاو بەشی تورک و کورد(ئاوگوستی ١٩٢٤)لە لایەن تورکیاوە، بۆتە هۆی وەپێشخستنی ڕاپەڕینی بێت شەباب. ڤان براونێسن بە پشت ئەستوری سەر چاوەی زانیاری کابرایەک بە ناوی مەلاحەسەن، دەڵێ: لە تەواوی ساڵی ١٩٢٤دا، خۆ ئامادە کردن بۆ ڕاپەڕین بەر دەوام بوە. لە سێیەمی مانگی مارس دام ودەزگای خەلافەت پێچرایەوە. لە هەشتی ئەپریل بە گوێرەی قانونی تەشکیلاتی دادگا، مەحکەمە شەرعییەکان هەڵگیران، قازیەکان خانە نشین کران و ئەرکەکانیان درا بە دادگا گشتییەکان. لە-٤ی سەپتەمبەر ڕاپەڕینی بێت شەباب دەست پێکرا، ٢٩ی ئوکتۆبری ١٩٢٤مەجلیسی مەزنی میللی قانونی ئەساسی تازەی پەسند کرد. قانونی ژمارە١٥٠٥ ڕێگا دەدا بە دەوڵەت کە زەوی خاوەنملکە مەزنەکان دەست بەسەر دابگرێ و بیاندا بەو تورکانە کە دەبوایە لە کوردستان نیشتە جێ بکرێن. سەیر ئەوەیە، شەریف فرات دەڵێ: زیاتر ڕاگەیاندنی کۆماریی لە ٢٩ی ئوکتۆبری ١٩٢٤، ئامادەیی ڕاپەڕینی هاسان کرد تا هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت و یا پێچانەوەی مەحکەمە شەرعییەکان لە هەشتەمی ئەپریل دا.

ئەم ڕووداوانە بە گشتی توانای«ئازادی»یان لە ئامادە کردنی شێخ و مەلا و سەرۆک عەشیرەتانی بۆ ڕاپەڕین زیاد کرد. «ئازادی» لە هەوەڵین کۆنگرەی خۆیدا گەیشتبووە ئەو نەتیجەیە کە ڕەنگی ئایینی لە ڕاپەڕینی دوا ڕۆژ، لە دوو لایەوە سودی دەبێ. ئەوە شتێک بوو کە نەک هەر تەنیا ڕێبەرانی ئایینی بۆ ڕاپەڕین رادەکێشا، بەڵکو کۆرە خۆپارێز و موخالیفەکانی مستەفاکەماڵیشی وا لێدەکرد کە پشتیوانی لە ڕاپەڕین بکەن. هیوای ئەوەش هەبوو کە لە مەجلیسی مەزنی میللی-شدا، بۆ دژایەتی ڕاپەڕین یەکدەنگی پێک نەیەت. «ئازادی» تەنانەت خەریک بوو لە گەڵ وەحیدەدین، سولتانی پێشووش پێوەندی بگرێ کە لە تاراوگە دا دەژیا. کەلک وەرگرتن لەم هەڵکەوتە، جگە لە ناوبانگ و نفوزی شێخەکان لە نێو کۆمەڵگای کورد، ئازادی» والێکرد کە شێخەکان وەک ڕێبەری ڕواڵەتی ڕاپەڕین هەڵبژێرێت.

لەم ناوەدا، ڕاپەڕینی بێت شەباب ئەم ڕووداوانەشی بەدواوە بوو. لە ١٠ی

ئوکتۆبر یوسف زیا له ئەرزەرۆم گیرا و بۆ دادگای عەسکەری ناردیانە بیتلیس. ناوبراو لەوێ هاتە زمان کە لە گەڵ ڕاپەڕین و تێکۆشانی نەتەوەیی باودا، هاوکار بوە. وادیارە خالید جبران و حەسنانلی خالید وشێخ سەعید و حاجی موسای سەرۆکی تایفەی مۆتکی-یشی باسکردوە. حاجی موسا دەگیرێ و پاشان بە فەرمانی ژەنراڵ کازم دیرێک. والی تازە بۆ ساز کردنی ناکۆکی لە نێوان سەرۆک تایفەکان و ڕێبەرانی «ئازادی»، بە تایبەت ئەفسەرانی پێشووی ئەرتەش، ئازاد دەکرێ. ئەم ڕەفتارە نا ئاساییەی تورکان لە گەڵ ڕێبەرێکی نەتەوەیی کورد، دەری دەخات کە تورک لە پێکهاتنی «ئازادی» ئاگادار بوون و بۆ تەنگە بەر کردنی مەیدانی تێکۆشانی ئەو، شێوەی تازەیان هەڵبژاردوە.

کازم دیرێک بە ئازاد کردنی حاجی موسا و شێخ نورسینلی مەعسوم، پێشەوای تەریقەتی نەقشبەندی و جبرانلی سەلاحەدین هیوادار بوو تایفە کوردەکانی ناوچەی بیتلیس و هێزان کە هەموویان سەر بە یەکێتی باباکوردی بوون، لە بەشداری ڕاپەڕین پاشگەز بکاتەوە. تەگبیری ژەنراڵ کازم جێی خۆی گرت. کاتێ حاجی موسا ئازاد کرا. نوح بەگی برای نیزیکەی ٧٠ بار چەک و قۆرخانە و کەل و پەلی دیکەی داوە بە کازم دیرێک. ئەم شێوە«ناکۆکی سازکە و حکومەت بکە» بەر لە دەستپێکی شۆرش کاریگەر بوو. لە ٢٠ی دیسامبری ١٩٢٤ خالید بەگ جبران گیراو لە بیتلیس زیندانی کرا و لە گەڵ یوسف زیا بەگ هەر لەو زیندانەدا کوژران. ژەنراڵ کازم ئەمجارە دەیویست حەسنانلی خالید و شێخ سەعیدیش بگرێ. ئەم دوانەش بۆ دادگای بیتلیس بانگ کران. شێخ سەعید بە بیانووی پیری کە توانای سەفەری وا دووری نیە، داوای کرد لە هەنیس پرسیاری لێبکرێ. بە قسەی شەریف فرات، ماکسون بەگ قایمقامی هەنیس کە لە ژێر نفوزی ڕوحانی شێخ و لە وانەیە پێرەوی تەریقەی نەقشبەندیش بوبێت، تیلگرافی کرد کە شێخ لەتەمەنی ٩٠ ساڵیدایە و شێخێکی پیرۆز و لە تەماعی دنیا و کورسی خوازی بە دوورە. لە کاتێکا لە تەمەنی٦٠ ساڵیدابوە.

کاتێکی شێخ لە هەنیس دەگەڕێتەوە، لە خالید بەگ جبرانەوە فەرمانی پێدەگات

کە دەست بەجێ ڕاپەڕین دەست پێبکات. لەڕێگای دیاربەکرەوە لە گەڵ سوریا پێوەندی بەر قەرار بکا، عەشیرەتەکان تەواوی ناوەندییەکانی حکومەتی بگرن. شێخ سەعید خەبەری دا بە حەسنانلی خالید کە بیتلیس پەلامار بدا و خالید بەگ ئازاد بکا. دوور نیە تورک لە ترسی ڕزگار کردنیان یوسف زیا و خالید بەگیان کوشتبێ.

شێخ سەعید لە٢٤ی دیسامبری ١٩٢٤لە ناوچەی هەنیس(گەل حەسار)بۆ ئامادەکردنی ڕاپەڕین و کۆکردنەوەی پیتاک و یارمەتی بە نێو تایفەکانی زازادا، دەستی بە سەفەر و سوڕانەوە کرد. لە چواری جەنیفەری ١٩٢٤ چەند ئاغا و شێخ و سەرۆک عەشیرەتی گەورە کە سەلیم زیرەکانی سەرهەنگی پێشووی حەمیدییەشیان لەگەڵبوو، بۆ باس و دانانی ستراتیژی ڕاپەڕین لە گوندی(کیریکان) کۆبوونەوە. شێخ سەعید لە بارەی ڕاپەڕینەوە هێشتا بڕیاری نەدابوو. لەم دەورو بەرانە، واتە لە هەوەڵی جەنیفەر عەلیرەزای کوڕی شێخ سەعید لە حەلەب گەڕایەوە. ناو براو بۆ پەز فرۆشتن چوو بوە حەلەب و لە وێوە بۆ پرس و ڕاوێژ لە گەڵ ئەندامانی کۆمەڵەی (تەعالی کوردستان) و شێخ عەبدولقادر چوو بوە ئەستەمبول. هەر چەندە شێخ عەبدولقادر ئەندامی«ئازادی» نەبوو. ناوبراو لە گەڵ کەسانی کوردو تورکی موخالیفی مستەفا کەمالیش ڕاوێژی کرد بوو. عەلیرەزا خەبەری دا شێخ سەعید و هاوکارانی کە ئەو کەسانەی ئەو راوێژی پێکردوون لە سەر ئەو باوەڕەن، ئەگەر ڕاپەڕین لە ناوچەی دیاربەکر دەست پێبکرێ، سەر کەوتن نیزیکتر دەبێ. ئەو خەبەرەی عەلیرەزا، بڕواو پشت گەرمی شێخ سەعیدی زیاتر کرد. و دەست بە جێ فتوای دا. لەم فتوایەدا دەوڵەتی ئانکارا و مستەفا کەمالی سەبارەت بە فەوتاندنی دین مەحکووم کرد و گوتی : ڕاپەڕین دژی ئەم سوکایەتی کردنە بە پیرۆزییەکان ، تەکلیفی شەرعی یە. لە چواری جەنیفەر ١٩٢٥ نامەیەکی بۆعەشیرەت و تایفەکانی عەلەوی مەزەبی هەرمەک و لۆلان نووسی، بەم هیوایە کە بۆ ڕاپەڕین هانیان بدات. ئەو تایفانە بە ڕەهایی بەشداری لە ڕاپەڕینیان ڕەت کردەو و تەنانەت ڕایانگەیاند کە لە دژی ئەو شەڕیش دەکەن. شێخ سەعید

هەوڵی دا کە لە گەڵ ئەم دوو تایفەیەی عەلەوی رێک بکەوێ. نامەی بۆ نووسین کە دەوڵەتی ئانکارا هەموو مەزهەبەکان لە بەین دەبات. عەلەوی و سوننی پێویستە بۆ پاراستنی شەرەف و مەزهەب پێکەوە هاوکاری بکەن. عەلەوی یەکان داخوازی شێخیان رەت کردەوە. بە کردەوەش هاو شان لە گەڵ هێزەکانی دەوڵەتی دژی راپەرین شەڕیان کرد. وادیارە عەلەوی یەکان نەیانویستوە بۆ پێکهێنانی کوردستانێکی سەر بەخۆ کە رێبەرایەتی بە دەست سوننییەکانەوە بێ، یارمەتی بە راپەرین بکەن. زۆرلە رێبەرانی راپەرینی شێخ سەعید فەرماندەکانی پێشووی حەمیدیە بوون کە تایفەی هەرمەک و لۆلان یان بە توندی سەر کوت کرد بوو، لە وانە خالید بەگ جبران زەینەڵی کوڕی تێلۆی رێبەری بەناوبانگی هەرمەکی کوشتبوو.....

یارمەتی نەکردنی ئەوان ناوچەی چالاکیی راپەرینی تەنگە بەر کرد بوو. لە شەشەمی جنێفەر لە گوندی کانی رەش، بەشی قەرە لیوا ، شێخ سەعید کۆبوونەوەیەکی پێکهێنا. بڕیار دراکام هێز بۆ پەلامار دانی عەلەوی یەکان دیاری بگرێت کەنایانەوێ بێنەنێوراپەڕین.لەهەشتی جەنیفەرلە گوندی(سولتان)کۆبوونەوەیەکی دیکە پێکهات، فەرماندەی جەبهەکان دیاری کران . مانگی مارس بۆ دەستپێکردنی راپەڕین لە کۆبوونەوەی پێشوودا دیاریکرابوو. بڕیار درا پێنج بەرەی گرنگ بکرێنەوە. شێخ سەعید لە شەشەمی جەنیفەر تا دەستپێکی راپەرین دەگەڕا و بە دانی فتوا و وتاری مەحکووم کردنی سیاسەتی بێدینانەی حکومەتی ئانکارا، خەڵکی بۆ راپەڕین هاندەدا و ئامادەی دەکرد. شێخ دەیگوت: هاتوە دین زیندوو کاتەوە. لە ١٥ی جەنیفەر لەدارەهەینی وەک مەهدی مەوعود پێشوازی لێکرا وناز ناوی( ئەمیرا لمجاهدین)ی پێبەخشرا. لە ٢٥ جەنیفەر لە مانی لە گەڵ شێخ شەریف فەرماندەی بەرەی خارپوت گفتگۆی کرد و بڕیاردرا لە گەڵ دەستپێکی راپەڕین شێخ شەریف ئالازیک پەلامار بدات. لە پێنجی فیوریە شێخ سەعید لە گەڵ سەد چەکدار گەیشتە پیران. لە وێ بوو کە لە هەشتی فیوریەی ١٩٢٥ راپەڕین دەستپێکرا.

ڕاپەڕینی بەر لەکاتی دیاریکراو، لە گوندی پیران ساز بوو. شێخ سەعید بە ناچار دەستپێکی ڕاپەڕینی ڕاگەیاند. ئەمەش کاتێ کە لە نێوان دەستەیەک ژاندارمە بە فەرماندەیی ستوان حەسەن حوسێنی و پیاوەکانی شێخ سەعید شەڕێک قەوما. ژاندارمەکان وەدوای پێنج کەسی تاوانبار کەوتبوون کە پەنایان بۆ شێخ سەعید برد بوو. وادیارە عەبدولرەحیمی برای شێخ فەرمانی داوە تەقەیان لێبکەن. ژاندارمەیەک دەکوژرێ و دوانیش بریندار دەبن، یەکێیان ئەفسەری فەرماندە بووە. ئەم ڕوو داوە ترس وەبەر شێخ دەنێ، نەکا ئەرتەشی تورک پەلاماریان بدات. بۆیە شێخ ڕاپەڕینی ڕاگەیاند و یەکێک لە نیزیکانی شێخ بەناوی مادانلی فەقێ حەسەنلی کرا بە حاکمی شار..........

لە ئاخری مانگی فیوریە ڕاپەڕین پەرە دەستێنێ. بە گوێرەی بەراوردی ئینگلیزەکان پاش شەڕی باسکی هانی، هێزەکانی شێخ سەعید لە حەوت هەزار کەس تێدەپەڕن و ڕوو دەکاتە دیار بەکر. لە ٢٨ی فیوریە شێخ بارەگای خۆی لە باکوری دیاربەکر دادەمەزرێنێ و لە وێوە لە گەڵ بەرەکانی دیکەی شەڕ پێوەندی بەر قەرار دەکات. لە دووەمی مانگی مارس دیاربەکر بە هاواری ئەللاهو ئەکبەر پەلامار دەدرێ و تا ٢٧ی مارس ئەم شارە لە گەمارۆدا دەبێ. لە ٢٧ی مارس بە گەیشتنی هێزیکی گەورەی تورک، کوردەکان بە ناچاری دەکشێنەوە.......

لە دوای سێیەمی ئەپریل شکانی شێخ سەعید ئیتر مەسەلەی کات بوو. لە ١٤ی ئەپریل هەنگی ٣٤بە فەرماندەیی سەرهەنگ تەلعەت بەگ ڕێگای پەڕینەوەی شێخی گرت کە لە سەرووی موش لە پردی مرادسوو بپەڕێتەوە. ناچار بۆ لای وارتو گەڕایەوە، بەو هیوایە کە لە ڕێگای بولانیکەوە بچێتە ئێران. لەوێ کەوتە گەمارۆی گوردانێک عەسکەر و دەستەیەک هەرمەکی سەر بە تایفەی حوسێن سەلجوقلو. ئیتر لەوێ دەست بەسەر کرا. شێخ سەعید لەگەڵ ٥٠کەس لە هاوڕێیانی، لە وانە: قاسم و سمایل و محەممەد و ڕەشید جبران، شێخ شەمسەدین و شێخ برایم و شێخ حەسەن جان و حاجی خالید خۆیان تەسلیمی فەرمانەدەی کوردان کرد.

ڤان براونێسن،دەڵێ: سەرچاوە زانیارییەکانی ئەو گوتوویانە: قاسم بەگی

جـبـران شـێـخي بەگرتن داوە. هـەر ئەوەش کـە قـاسـم بەگ وپاوکي و براياني لە دادگای ئیستیقلالی دیاربەکر بە ئیعدام حوکم نەدران و ئازاد کران، ئەم قسەیە وەراست دەگێرێت.

سێ ڕۆژ دوای ئەوە، ١٦ی ئەپریل ژمارەیەکي زیاتر لە دەورو بەری شێخ گیران و یا خـۆیان بەدەسـتـەوەدا. هـەمـوویان لە چاپاکـچـور کـۆ کـردنەوە وناردیـانن بۆ دیاربەکر. دادگای ئیستیقلال( ئیـسـتـقـلال مـەحکەمـەسی)٤٧کەسی بە مـەرگ مەحکووم کرد.

لە دەورو بەری مـانگی ئەپریل دەزگـای ئیتیـلاعاتی بەریتـانیـا دەسـتی کرد بە تۆمار کردنی ناوی ڕێبەرانی ڕاپەڕین و ئەو سـەرۆک تایفـانەی کە لە شـەڕدا کوژرا بوون و یاپاشـان ئیـعدام کرابوون. هێندێ سـەرۆک تایفەش بە عـێل و تایفـەوە بۆ عـیـراق ڕایان کـرد بوو. ڕاپۆرتەکـانی لە مـەڕ شـەڕەکـانی سـەرووی ڕۆژهەڵات بە درێژی ئامادە دەکران. پاش گرتنی شێخ سـەعید ئەو ناوچانەی تورک دەیانگرت، بە توند وتیژی( هێمنیان) دەکردنەوە. دەستیانکرد بـە چەک کردنی گشتی. دێهات و خانوو ئاگر دەدران. دوور خـسـتنەوەی هێندێ سـەرۆک تایفـە بۆ ئەنەدۆڵی ڕۆژئاوا دەستپێکرا.

یەک لە هۆیەکانی بەر بەرەکانی و درێژەی ڕاپەڕینی کوردەکان لە ماوەی ساڵي ١٩٢٥ و ئەپریلی ١٩٢٦ هـەر ئەو توند و تیـژیـەی تورکـان بوو. لە دووەمی یونی ئینگلیزەکان ئاگادار بوون کـە کـوردەکـانی زازایان لە دیار بەکر و دەورو بـەر کۆ کـردۆتەوە و بە بۆمـبـای دەسـتی بە سـەعـاتێک هـەموویان قڕ کـردوون. تورک دژی ڕاپەڕینی شـێخ سـەعـید هێـزی هەوایی تازە دامـەزراویشـیـان بە کـار هێنا...... سـەربازانی تورک مێگەلە مەڕی ٣ هـەزار سـەری کوردەکـانیـان هەراج دەکـرد. تا ئاخری ساڵی ١٩٢٥ لە ناوچـەی موش و گـارزان و سـوسـان شـەڕی پارتیزانی بەر دەوام بوو....... دەزگای ئیتیـلاعاتی هێزی هەوایی ئینگلستان کە زیاتر بە دوای گەڕیانی ڕاپەڕینی شێخ سـەعیـدەوە بوو، لە هەوەڵی مـانگی مـارسی ١٩٢٧هێندێ ڕاپۆرتی ئامادە کردن کە باسی درێژە پێدانی بەربەرەکانی کوردەکانیان دەکرد لە

بەرانبەر تورکاندا. هێندێ لە ڕاپۆرتەکان بەر بڵاوی مەیدانی ڕاپەڕین لە ١٨ی یونی تا ١٢ی سەپتەمبەری ١٩٢٥ نیشاندەدەن.

لە ڕوانگەی تورکانەوە یەک لە گرنگترین ناوچەکانی ڕاپەڕین، ناوچەی ڕاپەڕینی سەید عەبدوڵلای کوڕی سەید عەبدولقادر بوە. سەید عەبدولقادر لە ٢٧ی مانگی مای لە گەڵ کوڕەکەی و سەید محەممەد وحاجی ئەهدا وپالو کوێرسادی وبیتلیسی و کەمال فەوزی وخواجە عەسکەری لە داردرا. سەید عەبدوڵلا لە ناوچەکانی ڤان و بیتلیس و هەکاری بەربەرەکانییەکی توندی شەڕی پارتیزانی دەست پێکرد. لە ڕاستیدا جارچی مزگێنیدەری تێکۆشانی دوا ڕۆژ بوو. لە گەڵ ئەوەش کە هیچ یەک لە تایفەکانی کوردی عیراق نە هاتنە نێو ڕاپەڕین، تەنانەت لە کاتێکیشا کە سەید عەبدوڵلا داواشی لێکردن. سەرەڕای ئەوەش ڕاپەڕین چەند مانگان درێژەی هەبوو. بەربەرەکانی سەید عەبدوڵلا بە تایبەت لە شەمزینان زۆر توند بوو. زیاتر لە ٢٠٠ سەربازی تورک کوژران. هێزی بچوکی ڕاپەڕیو و بەربەرەکانی توند، دەزگای ئیتیلاعاتی فەڕانسەی هێنا بوە سەر ئەو باوەڕە کە ڕاپەڕینەکانی مانگی ئاوگوست وسەپتەمبەرلە ڕاپەڕینی شێخ سەعید زۆر شێلگیرتر بوە. فەرەنسییەکان لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە ئینگلیزەکان ئەمجارە لە گەڵ کوردەکان هاوکاری دەکەن. بە گوێرەی دەزگای ئیتیلاعاتی بەریتانیا ٢٥٧کەس لە گەورە گەورانی کورد لە دادگای ئیستیقلال دا بە مەرگ مەحکووم کراون.....

لە ١٦ی دیسەمبەر سەید عەبدوڵلا لە بەرانبەر هێزەکانی تورکدا پاشە کشەی کرد و لە عیراق لە گەڵ (سرهێنری دابز)کومیسەری بەرزی بەریتانیا گفتگۆی کرد و بۆ خۆی و ٧٠٠کەسی دار و دەستەی داوای پەنا بەری کرد. دابز بەو مەرجە موافەقەتی کرد کە ئیتر تورکیا پەلامار نەدات. دابز لێی زیاد کرد و گوتی:« ئەگەر تورکەکان لە بارەی سنووری تورکیا وعیراق مل بۆ بڕیاری کۆمەڵی نەتەوان ڕانەکێشن، ئەو دەم لەوانەیە بەریتانیای مەزن، کوردەکان یاری بدات. (*)

---

*- لێرەدا زیاتر پەردە لە سەر ڕووی سیاسەتی فێلبازانەی ئینگلیز لادەدرێ. شێخ سەعید و ڕێبەرانی ڕاپەڕینی ١٩٢٥ی کوردستان، لە پێناو ئازادی و سەر بەخۆیی

ئەم وتەیەی دابز، کۆتایی پێهاتنی ڕاپەڕینی شێخ سەعید بوو. لە ١٦ی سەپتەمبەری ١٩٢٧، دابز لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە تورکیا بڕیارەکانی ٢٩ی ئوکتۆبر و ١٦ی دیسەمبەری ١٩٢٤ی کۆمەڵی نەتەوەکان لە بارەی سنووری نێوان عیراق و تورکیا قبوڵ دەکات.

هیچ شتێکی باشتر لە دان پێدانانی هێزە چەکدارەکانی تورکیا، ئەژماری هێز و پارە و کەل و پەلێک کە دەوڵەتی تورکیا بۆ سەرکوتکەدنی ڕاپەڕینی کوردان ودامرکاندنەوەی گڕی ناسیۆنالیزمی کورد خەرجی کردوە، ڕوون ناکاتەوە. ئەرتەشی تورکیا دەڵێ: « لە ١٩ شەڕی گەورە، لە ماوەی ١٩٢٤تا ١٩٣٨ حەفدەیان لە کوردستان بوون. بە واتایەکی تر لە ١٩ شەڕی گەورە کە هێزەکانی تورک لە ٢٤ەوە تا ١٩٣٨ تێیدا بەشدار بوون، جگە لە دوانیان هەموویان لە کوردستان و بۆ سەر کوتکردنی ڕاپەڕین و ناسیۆنالیزمی کورد بەڕێوە چوون. دوای شەڕی دووەمی دنیا گریش، جگە لە شەڕی کوریا و شەڕی قیبرس، عەمەلیاتی ئەرتەشی تورک تەنیا دژی کورد بوە. قبول نەکردنی ئەم ڕاستیە لە لایەن مێژوو نووسانی تورکەوە، وەک ئەوەیە کەسێک مێژووی وڵاتە یەککرتوەکانی ئەمریکا موتالا بکات و بەڵام کار کرد و نفوزی کۆمەڵی ڕەش پێست لە بەر چاو نەگرێ، یا مێژووی یەکێتی سۆڤیێتی

---

کوردستاندا سەریان دانا. سەرە ڕای پڕوپاگاندەی درۆی کاربەدەستانی تورک و ڕۆژنامە نووسانی تورک و بێگانە، هۆی سەرەکی ڕاپەڕینی شێخ سەعید دەگەڕێتەوە بۆ زوڵم و زۆرداری و سیاسەتی تواندنەوە و لە بەینبردنی کورد لە لایەن حکوومەتی تورکیاوە. دەگەڕێتەوە بۆ خۆ دەرخستنی تینی ناسیۆنالیزمی کورد کە نەیدەویست سەر بۆ ناسیۆنال فاشیزمی تورک نەوی بکات و ببێتە کۆیلە و ژێردەستی گەلێکی دواکەوتووتر لە خۆی. ئەگەر دواکەوتویی کۆمەڵی کوردەواری و نە بوونی یەکێتی و هاوکاری و هاودەنگی عەشیرەت و تایفە و تاقم و توێژی جۆر بەجۆری کۆمەڵگای کورد و درندەیی و هاریی ناسیۆنالیزمی تورک بکەینە هۆکاری سەر نەکەوتنی ڕاپەڕینی ١٩٢٥ی شێخ سەعیدی پیران، نابێ ئەو ڕاستیەشمان لە بەر چاو نەبێ کە دەوڵەتی بەریتانیاش بە نۆرەی خۆی مەسەلەی کوردی لە پێش ڕاپەڕینیشەوە خستۆتە نێو گەمەی سیاسەتی ئیستیعماری و وەک ئامرازێک بۆ بەرژەوەندی سیاسەت و ئابووری و چارە سەرکردنی مەسەلەی موسڵ بەکاری هێناوە.

تاو وتۆ بکا و باسی کارکردی کۆمەڵی موسڵمانی وێندەرێ بخاتە پشت گوێ.

ئیعدامی شێخ سەعید و زۆربەی ڕێبەرانی ڕاپەڕین لە ٢٩ی یونی لە کاتێکا بەڕێوە چوو کە هێزەکانی تورک بە سەر زۆربەی ناوچەکانی ڕاپەڕیندا زاڵ بوون. شێخ سەعید گەورەترین و بەر دەوامترین ڕاپەڕینی سەربەخۆیی خوزانەی سەدەی بیستەمی ڕێبەرایەتی کرد. ئەو لە ٨ی فیوریە تا١٥ی ئەپریل فەرماندەی ڕاپەڕین بوو، تا دوا هەناسەی بەربەرەکانی کرد. بە دوای مردنیشیدا داستان بڵاو بوونەوە کە دەیانگوت هێشتا زیندوە. ڕێبەرایەتی شێخ سەعید چاوەڕوانیی مەسیحایی و سەر بەخۆیی خوازی لە نێو پێڕەوانیدا ساز کرد. مەرگی شێخ سەعید ئەو مانایەشی هەبوو کە تورکیا و بەریتانیای مەزن و وڵاتانی دیکەش دەبێ لە دوارۆژ و ئەنجامەکانی دنیاگرتری ڕاپەڕینی ئەو بیر بکەنەوە...»

سەرچاوە...:

ڕاپەڕینی شێخ سەعیدی پیران ١٩٢٥ نووسراوەی رابێرت ئولسەن. تاران ١٣٧٧ وەرگێڕانی برایمی یونسی، لە لاپەڕەکانی ٥٣ تا ١٩٢ وەگیراوە.

# له شکانی راپەرینی شێخ سەعیدەوە
# تاپێکهاتنی خۆیبوون

له ڕەوەندی ڕاپەرینی شێخ سەعید دا، هێزی کوردەکانی ناوچەی(بولانغ و مەلازگرد) و هەر وەها دەرسیمیش که له ناوەندی دەسەلاتی ڕاپەرین دوور بوون، و له ڕاپەرینیشدا بەشدارنەبوون، دەستیان لێ نەدرا. هێندێ له بەشەکانی سەرووی تورکیاش وەک سقرد، ماردین، ئورفا، و سورک-یش له دەرەوەی جەغزی ڕاپەریندا مانەوە. ناوچەی هەکاریش هەرچەند له سەرەتاوە نه کەوتە بەر هێرشی هێزەکانی تورک بەلام له قۆناخەکانی دوایی دا بوو بە مەیدانی پێکهەڵپرژان.(٦) لەم ناوەدا تاقه شوێنی دەست لێ نەدراو که بوو بە پەناگای شۆرشگێرانی کورد و مەکۆی دەستپێکی سەرهەڵدانی دوایی چیاکانی ئارارات بوو. لەو شوێنەی کەبرایم (برۆ-حەسکی تێللو) زستانی ١٩٢٥بناخەی ڕاپەرینی دارشت و له ماوەیەکی کەمدا گرنگی زۆری پێدرا. وەک له ڕاپۆرتەکانی نیزامی ئێران دەردەکەوێ، ماوەیەک پێش زستانی ١٩٢٥ دەستەیەک له قاچاغەکانی کەسکۆیی ڕەعیەتی تورک و هێندێ له قاچاغەکانی ئێران که له خاکی تورکیا و له چیای ئاگری دەژین، بە هاوکاری چوار کەس له کوردەکانی چەلیکانلو، لەو مەڵبەندە خەریکی ڕێگرین و له لایەن سنووردارەکانی ئێران و تورکیاوە ڕاو دەنرێن. (٧) بەلام بە ڕەگەڵ کەوتنی(برۆ حەسکی تێللۆ) ئەم یاغی بوونە پچووکە دەوری بەربڵاوتری وەرگرت. ناوبراو له تایفەی (حەسەسوری جەلالی)بوو کە له گۆڕانکارییەکانی ڕابردووی ناوچەدا، دەورێکی گرنگی یاری کرد بوو. هەر چەندە ئەو له ڕەوەندی شۆرشی شێخ سەعید دا، بە فەرمانی دەوڵەتی تورکیا بە هاوکاری

هێزەکانی جەلالی و حەیدەرانلو بۆ پێشگری لە ڕاکردنی شۆڕشگێران بۆ خاکی ئێران، هەنگاوی هاویشتبوو، و یەکێ لە بڕواپێکراوانی تورکەکان بوو، لە کاتی سیاسەتی سەرکوتکردنی دوای ڕاپەریندا، کەوتبوە بەرقین و غەزەبی تورکان. کاتێ ویستبوویان بیگرن، ڕایکرد بوو خۆی گەیاندبوە ئارارات.(٨) لە ماوەی بەهار و هاوینی ١٩٣٦، هەر چەندە هێندێ لە دوور خراوەکانی کورد، وەک شێخ عبدولقادر و سالحی برای لە تاراوگە ڕایانکرد بوو، و خۆیان گەیاندبوە نێو شۆڕشگێرانی ئارارات، بەڵام پێکهەڵپرژانەکان جگە لە پەلامارێکی سەرنەکەوتوانە بۆ سەر بایزید لە بەهاری ئەوساڵەدا پترپەرەی نەگرت. لە ڕاستیدا لە بەهاری ساڵی دوایی دایە بە ئاڵوگۆری تازە لە ڕێکخستنی هێزەکانی کورد، ڕووداوی ئارارات دەبێتە شۆڕشێکی تەواو و پڕ بە پێستی. پاش یەک دوو ساڵ بەرنامە دانان لە مانگی ئاوگوستی ساڵی ١٩٢٧، هێندێ لە تێکۆشەرانی سیاسیٚ کورد بۆپێکهێنانی ڕێکخراوەیەکی نەتەوەیی لە شاری (بحمدون)ی لوبنان کۆ دەبنەوە و پاش زنجیرەیەک وتو وێژ و ڕاوێژ لە سەر ئەم خاڵانەی خوارەوە ڕێک دەکەون:

١ – هەڵوەشاندنەوەی هەموو ڕێکخراوە نەتەوەییەکان، بەمەبەستی دامەزراندنی ڕێکخراوێکی هەموولایەنە.

٢ – درێژەپێدانی خەبات تا وەدەرنانی ئاخرین سەربازی تورک لە سنوورەکانی کوردستان.

٣ – پێش دەستپێکردنی ڕاپەرینێکی سەرانسەری :

ئەلف – پێکهێنانی فەرماندەیێکی سەرانسەری کوردی

ب – ڕێکخستنی نیزامی هێزەکان و پەرداخ کردنیان بە چەک و قۆرخانەی تازە.

ج – پێکهێنانی ناوەندی عاملاندنی عەسکەری لە یەکێ لە چیاکانی بەردەستی تورکان لە کوردستان، کە ناوەندی فێرکردن و هەم پێگەیەکی خەباتی نهایی بێت.

٤ – هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ڕێگای لێک تێگەیشتن لە گەڵ ئەرمەنیان.

٥ – پێکهێنانی پێوەندی دۆستانە لە گەڵ دەوڵەت و میللەتی ئێران. (*)

٦ – خۆپاراستن لە هێنانە گۆڕی هەموو مافێکی سیاسی بۆکوردەکانی نێوچۆمان(بین النهرین) وسوریا، سەبارەت بەپاراستنی پێوەندی دۆستانە لە گەڵ وڵاتانی ناوبراو.(٩)

بەمجورە بە گوێرەی پەسندکراوەکانی سەرەوە، رێکخراوەکانی : کۆمەڵەی بەرزیی کوردستان، کۆمەڵەی تەشکیلاتی کۆمەڵایەتی کورد، کورد میللەت فیرقەسی ، کومیتەی سەربەخۆیی کورد، خۆیان هەڵوەشاندەوە و رێکخراوی خۆیبون – یان راگەیاند. شایانی باسە یەکێک لەو کەسانەی کە خۆی بە پاشماوەی(کۆمەڵەی تەعالی کوردستان)دزانی، هەر ئەو دەم بۆ دژایەتی لە گەڵ خۆیبون دەچێتە بەغدا و لە گەڵ کونسولی ئێران لە بەغدا پێوەندی دەگرێ. سەرکونسولگەری ئێران لە بەغدا ٣ی رەشەمەی ١٣٧٠(١٩٢٨/٢/٢٢) ئەم راپۆرتەی خوارەوە بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئێران دەنێرێ:

---

*-( دوکتور بەلەچ شێرکۆش لە باسی کۆنگرەی خۆیبوون دا، مادە ی چوار وپێنجی بەرنامەی خۆیبووون بەم جۆرە باس دەکات: «... مادەی ٤ دروستکردنی پەیوەندی برایەتی و هەمیشەیی و بۆنەیی دۆستانە لە گەڵ حکوومەتی ئێران و گەلی فارس – ی برا.

مادەی ٥ دروستکردنی پەیوەندی برایەتی و دۆستایەتی هەمیشە لە گەڵ هەر دوو حکوومەتی عیراق و سوریا. لەو سنوورەشدا ئەو مافانە بە بەس بزانن کە لە کەلاڵەی– ئینتیداب – و پەیمانی نێوان دەوڵەتاندا سەبارەت بە مافەکانی کورد هاتوە، لەم دوو دەوڵەتەدا و داوا نە کردنی هیچ مافێکی تری سیاسی لەم دوو حکوومەتە لە وە زیاتر کە هەیە.»

بەبۆچوونی من خاڵی ٤و ٥ و٦ ی ئەم دارشتنە و یا ئەم پرۆگرامە، بەنوختەی لاوازی بەرنامەی خۆیبوون و هەڵوێستی چەوتی سیاسی دامەزرێنەرانی ئەم رێکخراوەیە دەژمێردرێن. دەکرێ بڵێین ئەم دووخاڵە چەوتە و ئەم سیاسەتە هەڵەیە، لەو کاتەوە تا ئێستا بوونەتە بنگەهی سیاسەت و رێبازی هەموو بزووتنەوەکانی کوردستان و رێبەرانی کورد بە سەر ئەم هێڵە خوار و خێچە دا رۆیشتوون . بەرهەم وئاکامی ئەم بۆچوون وسیاسەتەش لە زیان و تێشکان زیاتر چیتری بە دوا وە نە بوە. بەرنامەی خۆیبوون لە جیاتی پێوەندی و یەکێتی و هاوکاری لە گەڵ نەتەوەی کورد لە ئێران، پێوەندی دۆستانە و

**« وەزارەتی دەرەوە، ئیدارەی وڵاتانی ڕۆژهەڵات، ڕوونووسی ڕاپۆرتی نهێنی ژەنراڵ کونسوڵگەری بەغدا، نمرە٧٧٣، تاریخ ٢اسفند١٣٠٧:**

وەزارەتی کـــار و باری دەرەوە. بە دوای ڕاپۆرتی پێـــشکێش کـــراوی ١٢ی ڕێبـەندانی ئەمسـاڵ، نمرە ٧٦٠ لە بارەی بیر و ڕاو ئامـانجی خـەرابی کـوردەکان سـەبارەت بە پێکهـێنـانی دەوڵەتی کـوردی کـە ڕیزی ناوی ئەندامـانی کـومـیتـەی خـۆیبـون و ئەوانیـتـر پێشکێش کـران ڕادەگـەیەنرێ، هەر وەک لە ڕاپۆرتـە نهـێنی یەکانی پێشوو دا ڕوونم کردبۆوە، کومیتـەی خۆیبون کە لە حـەڵەب دامـەزراوە، بۆ پێکهـێنانی دەوڵەتێکی کـورد و ئەرمـەنی خـەریکی تێکۆشـانە. ئەوان لە سـەر ئەو باوەڕەن کە هەموو کورد و ئەرمـەنی یەک بگرن و دەوڵەتی ناوبراو پێکبێنن. چونکە

---

هەمـــیـشـــەیی لە گـــەڵ دەوڵەت ومـــیللەتی ئێـــران یا (حکوومـــەتی ئێـــران و گـــەلی فارس)پێشنیاردەکا. هەر وەک لە ئێران نە کورد هەبێ و نە کوردستان. ئاشکرایە بە کارهێنانی وشەی (میللەتی) ئێران هیچ مانایەکی زانستی نیە و تەنیا شۆڤینیزمی فارس بەکاری دەبا و بەم بۆچوونە دەیەوێ حاشا لە فرە نەتەوەیی ئێران بکا و ئەوە بسەلمێنێ کە گۆیا لە ئێراندا تەنیا یەک میللەت هەیە، ئەویش دەبێ فارس بێ.!!

ڕێبەرانی سیاسی خۆیبون و ڕێبەرانی بزووتنەوەی کورد لەو کاتەوە تائێستا لە هەموو بەشەکانی کوردستان وایان چۆتە دەمێشکی کەگۆیا ئەگەر داوای مافی ڕەوای نەتەوەیی کورد بەگشتی نەکەن و باسی مافی نەتەوایەتی کورد لە هەموو بەشەکانی کوردستان، نەهێننەگـۆڕێ، حکوومـەتە داگـیـرکـەرەکـانی کـوردسـتـان بڕوایان پێدەکـەن وەل بۆداخوازەکانیان ڕادەکێ ؟ن لە کاتێکا بەبۆچوونی من ئەم جۆرە سیاسـەت و بۆ چوونە ئەگەر نەزانی نەبێ ، خۆ فریو دانە. دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان زۆرلە ڕێبەرانی ئێستای کورد ژیرتر و شەیتانترن. ئەوان باش دەزانن یەک گرتنەوەی کوردستان ودامەزرانی دەوڵەتی نەتەوەیی کورد ، ئاوات و ئامانجی هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەرە. بۆیە قەت بەوە فریوناخۆن کە حیزبێک و ڕێبەرێکی کورد ئەگەر لە بەشێکی کوردستان خەبات دەکا، بۆ دۆستایەتی و پێوەندی نابەرانبەر و کوێ لە مستی لە گەڵ حکوومەتی بەشەکەتر. باسی مافی نەتەوەیی میللەتەکەی نەکات لەو وڵاتەدا، و یا کاریان بە سەر بەشەکانی ترەوە نەدابێ و یا لە وەش زیاترڕاویشیان بۆ بکەن و کوردی بەشێکی دیکەیان بۆ بگرن و بکوژن . حکوومـەتانی داگیـرکـەری کوردستـان بە نۆکەری و کوێ لەمستی ڕێبـەرانی کـورد فـریو ناخـۆن و ئەوان مـەسـەلەی کـورد وەک مـەسـەلەی یەک نەتەوە و مەترسیدار بۆخۆیان چاو لێدەکەن. هەرچەند حیزبێک و بارڕێبەرێکی بلیمەتی کورد بۆ

هێندێکی دیکە لە کوردەکان لە گەڵ ئەم هەنگاوانەی خۆیبون یەک نەبوون و یەکێتی لە گەڵ ئەرمەنیان بە دژی بەرژەوەندی خۆیان دەزانن ئەوانیش لە بەرانبەر کومیتەی ناوبراودا تەشکیلاتێکیان پێکهێناوە و دژی خۆیبونی یەکان هەنگاو دەنێن و لە لایەکی ترەوە بۆ پێشکەوتنی مەرام و ئامانجی خۆیان، کە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆیی کوردە، تێدەکۆشن. بە گوێرەی راپۆرتێکی بە من گەیشتبوو ئەو دەستەی دوایی کومیتەی خۆیان ناوناوە(جمعیت تعالی کوردستان) کۆمەڵەی بەرزیی کوردستان. ئەم کۆمەلە دەیەوێ بە پشتیوانی دەوڵەتی ئێران دژی دەوڵەتی تورکیا خەبات بکا و بە ناوی ئەوەی بە ڕوالەت کوردستان دەخەنە ژێر سەرپەرستی(تحت الحمایە)ی دەوڵەتی ئێران، دەیانەوێ بەم چەشنە ئێران لە گەڵ خۆیان بکەنە هاوکار و یاریدەر. پاش دڵنیایی لە ڕاکێشانی موافەقەتی ئێران و یا

---

تۆکەری و یا بە قەولی خۆیان بۆ بەرژەوەندی کاتی و گۆیا ناعیلاجی سەر بۆ حکومەتێکی داگیرکەری کوردستان نەوی بکا، لە سوکی و ملکەچی زیاتر چیدیکەی پێ نابڕێ و کوردیش هەر وا بە لەت وپەتی و دابەشکراوی دەمێنێتەوە.

خۆیبوون بۆ(پاراستنی پێوەندی دۆستانە لە گەڵ وڵاتانی(واتەدەوڵەتانی)عیراق و سوریا)، وازلە هێنانە گۆڕ و باسکردنی مافی سیاسی کوردەکانی ئەم دوو وڵاتە دێنێ. ئەم سیاسەتە پاش ٧٠ساڵ بۆتە بەشێکی سەرەکی لە ڕێبازی ڕێبەرانی بزووتنەوەی کورد لە هەموویەشەکانی کوردستان. ئێستاش ڕێبەرانی بزووتنەوەی کورد بۆ پێوەندی و گوێ رایەڵی بۆ حکومەتانی داگیرکەری کوردستان ملی خۆ دەشکێنن و مافی سیاسی کۆمەڵایەتی ونەتەوەیی داب ونەریتی میوانداری کوردایەتی و پاراستنی هاونیشتمانی(ئەگەر کوردستان بەگشتی نیشتمانی هەموو کوردێک بێ) کوردەکان بە قازانجی بەرژەوەندی دەوڵەتی داگیرکەرانی کوردستان پێشێل دەکەن. ئەم سیاسەتە جگە لە تەقەلا بۆ وەدەست هێنانی یارمەتیەکی ماددی سەرشۆڕانەی کاتی وبەرژەوەندی شەخسی و حیزبایەتی بەر چاو تەنگ، نیشانەی نە بوونی ستراتێژی نەتەوەیی و خۆ فریو دانێکی نەزانانەیە. چونکە هەر چەندی ڕێبەرانی کورد مافی نەتەوەی کورد لە بەشەکانی کوردستان بکەنە فیدای بەرژەوەندی مادی و کاتی، دەوڵەتانی داگیر کەر بروایان پێ ناکەن و هەر بە کوردیان دەزانن و هەر ئەوانیش لەم پێوەندی و سەر و سەودایەدا قازانج دەکەن. هەر وەک لە ڕاپەرینی ئارارات و بزووتنەوەکانی تری کورد دا نیشان دراوە و لە لاپەڕەکانی نووسینی ئاغای کاوەدا تووشیان دەبین.

پاراستني بێلایەني، دژی تورکەکان دەست بە هێندێ کاربکەن. هەرچەندە دەمزاني سەیدتەها یەکێ لە دامەزرێنەراني ئەو کۆمەڵەیە، بەڵام ناوی ئەواني دیکەم نەدەزانی. تاچوار رۆژێش حوسێني خەیات، ئێرانیی ناسراو پێی گوتم کە کۆمەڵەی بەرزیی کوردستان دەیەوێ نوێنەرێک بنێرێ و لە گەڵ ژەنرال کۆنسولگەری وتو وێژ بکا. منیش بۆ چاوپێکەوتن موافەقەتم کرد. هەرئەو رۆژە حاجی برایمی کورد لە هۆزی جاف، هاتە لام و رایگەیاند لە لایەن کۆمەڵی کوردەوە کراوەتە مەئمورکە نیەت پاکی کوردەکان سەبارەت بە ئێران بە ژەنرال کۆنسولگەری رابگەیێنێ و داوبکا کە مەسەلەکە بگەیەنێتە کاربەدەستانی بەرزی دەوڵەتی ئێران. کورتەی قسەکاني ناوبراو ئەوەبوو کە دەوڵەتی ئێران دەسەڵات بدابە ژەنرال کۆنسولگەری کە لە گەڵ کۆمەڵەی ناوبراو وتو وێژ بکات، یانوێنەرێکی دیکە بۆئەم کارەبنێرێتە بەغدا، یا رێگابدا یەکێک لە ئەنداماني کۆمەڵەی بەرزیی کوردستان بچێتە تاران و لە نیزیکەوە مەبەستەکاني خۆیان پێشکێش بکا. من پێمگوت: مادام کە نەزانرێ ئەم کۆمەڵەیە لە کێ و لە چ کەسانێک پێکهاتوە ئامانج و مەرامیان دیار نەبێ، وەڵام دژوارە. بەڵام هەرچۆنیش بێ ژەنرال کۆنسولگەری نوێنەری دەوڵەتی ئێرانە و دەتوانێ وتو وێژ بکات.

کابراگوتی: ئەم کۆمەڵەیە لە هەموو وڵاتاني دنیا دامەزراوە ولە هەموو شوێنێ کۆمەڵێک بەم ناوە هەیە. روونووسی بریارەکاني کۆمەڵەی بە تورکي داپێم و داوای کرد روو نووسی لێ هەڵبگرم و دوایی بیدەمەوە. وەرگەراوەکەی بۆتان دەنێردرێت، بە گوێرەی لێکۆڵینەوەیەکی کردوومە، ئەدهەم بەگ فەرماندەی جەبهەی یونان لە شەری دژی تورکان و عبدولغەني ئەفەندی کە(هەمیشە لەکن فەیسەلن)، زینەلعابدین و حاجی برایم بەگی جاف و مستەفاپاشا لە ئەنداماني ئەو کۆمەڵەیەن. سەید عەبدولا و سەیدتەهای نەوەی شێخ عوبیدولای ناسراو بە ئەندامی بەرزی کۆمەڵە حیساب دەکرێن. هەرچۆنێک بێ کۆمەڵاني ناو براو(خۆیبون وکۆمەڵەی تەعالي کوردستان) هاندەریان بێگانەیە. بە تایبەت دەوڵەتاني بێگانە بۆ پێشچووني ئامانجی خۆیان ئەم کومیتە و کۆمەڵانە پێک دێنن

کە لە لایەک هەرە شە لە دەوڵەتانی ئێران و تورکیابکەن و لە لایەکی دیکەش هەمیشە حکوومەتی عیراق لە ترس و دڵە ڕاوکەدا ڕابگرن، و لەو ڕێگایەوە نیەت و ئامانجی خۆیان لە ئاست ئەم دەوڵەتانەوە بەجێ بگەیێنن.

ئەگەرهاتوو دەوڵەتی کوردیشیان پێکهێنا، بە هۆی ئەو تایفەوە پێشی پەلاماری رووسانیش بگرن، هەر چۆنێک بێ موافەقەتی دەوڵەتی ئێران لە گەڵ ئەم دوو کۆمەڵەیە( خۆیبون و کۆمەڵەی تەعالی کوردستان)بە پێچەوانەی بەرژەوەندی ئێران دەزانم. بە بڕوای من دەبێ پێشی هاندانی ئەو کۆمەڵانە لە نێو کوردەکان بگیرێ و ئاگاداری و زیرەوانی تەواو بۆ پێش نەکەوتنیان بەرێوەبچێ. تەنانەت کوردەکانیش زیاتر لە جاران بە مەرحەمەتی کاربەدەستانی دەوڵەت هیوادار بکرێن کە بە هیچ جور وەدوای ئەم چەشنە بڕوبوچانە نەکەون.» کەفیلی ژنرال کۆنسولگەری نصرالله بهنام (١٠)

ئەمەش روونووسی مەرامنامەی کۆمەڵەی تەعالی کوردستانە (جمعیت تعالی کوردستان) زستانی ١٣٠٧ (١٩٢٨)

« وەزارەتی کاروباری دەرەوە، روونووسی وەرگەراو:

کۆمەڵەی تەعالی کوردستان لە ناوەندی گشتیی خۆیدا لەم دواییانەدا کۆبوونەوەی پێکهێناوە و سەبارەت بە بار و دۆخی سیاسی ئەم بڕیارانەی خوارەوەیان داوە:

١ - کۆمەڵەی تەعالی کوردستان مەرام و مەقسودێکی پیرۆزی هەیە کە هەمیشە بۆ پێگەیشتنی ئەو کاردەکا. مەرامی ئەوئامادەکردنی کەرستە و ئامرازی ئەمنیەت و ئاسایشی کوردانە. ئەم کۆمەڵەیە پێشتر ساڵی ١٩٢٥ لە ئەستەمبوڵ دامەزراوەو ناوەکەی (جمعیت تعاون کردستان) کۆمەڵەی یارمەتیدەری کوردستان بوە. پاشان ساڵی ١٣٢٨ی رۆمی ناوەکەی گۆڕاوەبە (کۆمەڵەی هیوا). ئەم کۆمەڵەیە چەند ساڵان بە رە سمی و غەیرە رەسمی خەریکی بە جێگەیاندنی ئەرکی پیرۆزی نەتەوەیی بوە. ئاخرەکەی ساڵی ١٣٣٤، واتە دوای شەڕی یەکەمی دنیاگرکۆمەڵەی ناوبراو ناوی خۆی ناوە( کۆمەڵەی تەعالی کوردستان و لە ئاست

هەموو جۆرە دژواری و تەنگو چەڵمەیەکدا خۆی پاراستوە.

بە تایبەت دوای شەڕکە تورک ڕایانکردوە، بار و دۆخی نەتەوەیی و هێزی کوردان بەرە و فەوتان چوە، کۆمەڵەی ناوبراو نوێنەری خۆی بۆ(ڤێرسا) دیاری کردوە و ڕایگەیاندوە کە دەتوانێ مافی نەتەوایەتی خۆی بپارێزێ.

٢ – لە ڕۆژهەڵاتی نیزیک قەوم و نەتەوەی جیاواز دەژین. یەک لەو زاتانەی کە دژی ئەم قەوم و نەتەوانە، بە تایبەت دژی نەتەوە موسولمانەکان هەمیشە دەجولێتەوە، نەخۆشە و بیری سیاسی ئوروپا بە شێوەی جۆربە جۆر و جیاواز بە کار دێنێ و دەیەوێ کە لەم ڕێگایەوە بە سەرمانداڕاڵ بێ و دەسەڵاتی ئابووری خۆی پتەو و بەرقەراربکا. بەڵام بە ژیری کارەکانی بە ڕێوە دەبات بۆ ئەوەی نەکا ئێمە لە بیر و بۆ چوونی ئاگاداربین و ڕەخنەی لێبگرین. ئاشکرایە بەم چەشنە دوارۆژ فرە تاریک و بەترسە.

٣ – دوای شەڕی گشتی بار و دۆخی جوغرافیایی و سنووری سیاسی ئێمە وای لێهاتوە کە کاریە دەستانی حکوومەتی ئێستای تورکیا کە لە خزمەتی بێگانان دایە لە ڕادە بە دەر دەست دەخاتە نێوکارەکانی ئێمە، بە رادەیەک کە خۆ دەکار و باری خاو و خێزانی ئێمەش هەڵدەقوتێنێ و هەوای تورانیان بەرز کردۆتەوە. کۆمەڵەی ئێمە کە ئەم ڕەفتار و ئاکاری خەرابی تورکانی دیوە، چارەنووسی خۆی گرتۆتە دەست و بە تایبەت ئەم ئەرکە گرنگ و ویژدانیەی بۆیە قەبوڵ کردوە کە کوردەکان لە بەرنەزانی و دەمارگیری نەبنە دەستەمۆی بێگانان و هیوادارین نەتەوە ڕەسەنەکانی ڕۆژ هەلاتی نیزیک بە گشتی و میللەتی نەجیبی ئێران بە تایبەتی کە هەزاران ساڵە بە هێزی لێهاتووی خۆی وڵاتی خۆی بەڕێوە دەبات، ئافەرین لەوکارەی ئێمە بکات.

٤ – ئێمە نەتەوەی کورد کە لە بواری جوغرافیایی و سیاسی وئابووری شوێنێکی فرەگرنگ و پان و بەرینمان گرتوە، بە ناوی بەرژەوەندی ڕۆژهەڵات، دەستی خالیسانە بۆ لای میللەتی ئێران کە هاو ڕەگەز و هاو دین و برای ئێمەیە درێژ دەکەین وتەواو هیوادارین کە ئەویش بە ڕێزەوە پێشوازی لە دەستی ئێمە بکات.

٥ - پێشتر تورکەکان دەست درێژی و سوکایەتیان بە هەستی ئاینی و نەتەوەیی کوردەکان نە دەکرد. کوردی چارە ڕەشیش لە بەرانبەر ئەواندا بە تایبەت بۆ پاراستنی ناو ونیشانی تورک لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا، لە باکور و باشوری ولات بە خۆرایی خزمەتی ئەوانی دەکرد وەک پاسەوانی و پارێزگاری و لەو پەڕی ڕاستی و شێلگیریدا گیانفیدایی دەکرد.

٦ - ئەگەر میللەتی نەجیب و پایە بەرزی ئێران یارمەتی و دۆستایەتی لە ئاست میللەتی کورد ڕابگەیێنێ، کورد کە ڕێکخراوی کۆمەلایەتی خۆی بەڕێوە بردوە، دەتوانێ لە گەڵ ئێرانیش کە بۆ ئەو لە تورکان نیزیکترە و هاو ڕەگەز ە، دۆستێکی نیزیک و فیداکاربێ لە دەرەوە یان لە نێو خۆدا.

٧ - کۆمەڵەی بەرزیی کوردستان ئەگەر لەم کاردی دواییدا سەرکەوت، خۆی بە بەختەوەردەزانێ، ئەگەرسەریش نەکەوت دەتوانێ بڵێ ئەرکی خۆی لە بەرانبەر مێژووردناسیوە، بەلام نەیتوانیوە تێیداسەرکەوێ وبەم چەشنە پاکانە بۆ خۆی بکات.

کۆتایی - ئەگەر دەولەتی پایە بەرزی ئێران بخوازێ لە گەڵ بیر و ڕای کۆمەڵەی ئێمە بە ڕاستی موافەقەت بکا، دەبێ کەسێکی خاوەن دەسەلات بنێرێتە بەغدا کە لێرە وتو وێژبکرێ و پێوەندیی دابمەزرێت. یان ڕێگابدا ئێمە کەسێکی خاوەن دەسەلات لە لایەن کۆمەڵەوە بۆ ئەم کارە بنێرینە تاران. .کۆبوونەوەی ٧٣کەس، تاریخی بڕیار، ٢١ی ژانویە ١٣٤٣.ڕوونووس وەک ئەسڵەکەیە. ( ١١ )

کومیتەی ڕاپەراندنی خۆیبون بە پەسندی کەسانی وەک جەلادەت و کامران بەدرخان، مەمدوح سەلیم بەگ، شاهین بەگ و چەند کەسیترلە ڕوناکبیر و تێکۆشەرانی سیاسی کورد، ئیحسان نوری پاشای ئەفسەری پێشووی ئەرتەشی تورکیا، کە لە ڕووداوی بەیتولشەباب دا سەر بزێوی کردبوو، کردی بە فەرماندەی گشتی ئەرتەشی میللی کوردستان و برۆحسکی تیللۆش بە ڕێبەری تەشکیلاتی ئارارات دیاری کرا.(١٢)

یەکێ لە تایبەتیەکانی ئەم لێک نیزیکبوونەوەد، نەخشێکی گرنگە کە حیزبی داشناکی ئەرمەنستان بۆپێکهێنان وپشتگرتنی یاریکرد. حیزبی داشناکیش وەک

ناوەندەکانی دیکەی خاوەن مەیل بۆ ئالوگۆڕی ناوچە، هەرلە ساڵەکانی دوای شەڕی یەکەمی دنیاگرەوە مەسەلەی ناسیۆنالیزمی کوردی وەک هۆکارێکی گرنگی سیاسی لە بەرچاو لانەبرد و لە دەرەتانی هاوکاری تێکڕایی دژی تورکیا خافڵ نەبوو. هەرچەند کە هێندێ دەستەی عەشیرەتی کورد لە دەورانی جۆر بە جۆری کوشتاری ئەرمەنیان، بەتایبەت قەڵاچۆکردنی ١٩١٥دا چالاک بوون، بەڵام هەردوای ڕووخانی عوسمانی و دەرکەوتنی بەرژەوەندی هاوبەش بۆ وەڵاتانی ناکۆکی وتو وێژدەستپێکرابوو. پاش شکانی ڕاپەڕینی شێخ سەعید و ساخکردنەوەی تەکلیفی کوردەکان، بە شێلگیری درێژەی پێدرا. بە هەوڵی نوێنەری داشناک لە ئینترناسیۆناڵی دووەم دا، مانگی مارسی ١٩٢٥ کۆبوونەوەی سۆسیالیستەکانی ئیونەتەوەیی بەیاننامەیەکی سەبارەت بە بار و دۆخی داخداری کوردەکانی تورکیا بڵاوکردەوە. تەقەلای نوێنەری حیزبی ناو براو لە زوریخ و لەندەن بۆ لە قاودانی سیاسەتی تورک لەم بوارەدا پاشانیش درێژەی پێدرا. واهان پاپازیان وەک نوێنەری حیزبی داشناک لە کۆنگرەی دامەزرانی خۆیبوندا ئامادەبوو.(١٣) وادێتە بەرچاو کە داشناکەکان لە بواری پێکهێنانی پێوەندیی لە ڕادەی ناوچەدا، بە تایبەت پێوەندی لە گەڵ ناوەندی ڕاپەڕین بارمەتی خۆیبونیان داوە.

پێکهاتنی خۆیبون و لێهاتوویی سیاسی ئەو لە چاو هێندێ کۆمەڵەی سیاسی کوردەکانی پێش ئەو و دوای ئەویش لە مێژووی خەباتی کوردەکاندا شوێنی تایبەتی هەیە. بەڵام تەئسیری کردەوەی ئەولە ڕەوەندی ڕاپەڕینی ئارارات دا، زۆر ڕوون نیە. لە پلەی هەوەڵدا وادێتە بەرچاو کە کۆمەڵ و کەسانی دامەزرێنەری خۆیبون، پتر ویستوویانە لە ڕاپەڕینی پێکهاتوو کەلک وەربگرن، تائەوەی کە خۆیان پێکهێنەر بووبن. وا دیارە نەخشی بنگەهی خۆیبون پتر لە ڕێکخستنی دوای ڕاپەڕین و تێکۆشان بۆ هاندانی هێزەکانی تر و پشتگیری ئەودابوە. یەک لەو هەنگاوانە ورەنگە هەرە گرنگیشیان ناردنی ئیحسان نوری پاشابووبێ بۆ ئارارات.

ئیحسان نوری دوای شکانی ڕاپەڕینی بەیتولشەباب، لە سپتامبری ١٩٢٤ پەنای بۆ عیراق برد و پاشان هاتە ئێران. لە کاتی ڕاپەڕینی شێخ سەعید، چۆوە

تورکیا. بەلام چوونەوە ی لە گەڵ شکانی راپەرین رێکەوت. دیسان گەرایەوە بۆ ئێران. لە ئاخری هاوینی ١٩٢٧ شێخ حوسێن یەکێ لە لایەنگرانی شێخ عەلیرەزای کوری شێخ سەعید بۆ داوەتکردنی ئیحسان نوری لە سوریاوە هاتە ئێران. بەلام ئیحسان نوری بە نامەیەک شێخ عەلیرەزای کردە نوێنەری خۆی و بەرە و ئارارات کەوتە رێ. شێخ حوسێنیش لە رێگای کوردستانی عیراقەوە گەرایەوە بۆ سوریا.

( بەنەقڵ لە پێشەکی شەریف وانلی لە سەر وەرگێرانی فەرانسە:(ڕووداوەکانی ئارارات). لە سەرچاوەیەکی کوردیدا گوتراوە کە ناوبراو لە گەڵ دوو کەس لە هاورێیانی بە ناوی راسم و خورشید بە بێ ئاگاداری کاربەدەستانی ئێران بۆ ئارارات رۆیشتوون. لەم سەفەرە لە پێکهەڵپرژانێکدا لە گەڵ هێزەکانی ئێرانی راسم کوژراوە. خورشید گەراوەتەو مبۆ عیراق. ئیحسان نوری بە زەحمەت و دژواری خۆی گەیاندۆتە ئارارات.(١٤)

بە گوێرەی بەڵگەکانی بەردەست وادێتە بەرچاو کاربەدەستانی ئێرانی ماوەیەک دوای ئەو سەفەرە واتە لە سەرەتای زستانی ١٩٢٧ لە بوون و تێکۆشانی کەسێک بە ناوی ئیحسان نوری ئاگادار بوون. لە ژانویەی ئەو ساڵەدا، وەزارەتی نێوخۆ خەبەردەداتە حاکمی کرماشان کە لە رێگای کۆنسولی ئێرانەوە لە بەغدا ئاگادار کراوە کە:« کومیتەیەکی نهێنی سەر بە ئەرمەنی داشناکی بەغدا و هیتر، لە کرماشان دامەزراوە. ئیحسان ناوێک، مین باشی ئەفسەری تورک» و دەستەیەکی تر لەو کومیتەیەدا تێدەکۆشن. (١٥)

ئەبولحەسەنخانی نیساری حاکمی کرماشان لە وەلامی وەزارەتی نێو خۆدا رادەگەیێنێ کە لە هەبوونی کومیتەیەکی ئاوائاگادارنیە.

# راپەرینی ئارارات

لە و ماوەیە و لە کاتێکا هێشتا خۆیبون لە سەرەتای پێکهاتنی خۆی دابوو ، لە ئاخری بەهاری ١٩٢٧ دەوڵەی تورکیا ١٠هەزار عەسکەری بۆلێدانی راپەرینی ئارارات خستە ڕێ. هێزی تورک لە لای (ئیگدر وبایزید)ەوە کوردەکانیان پەلاماردا. بەڵام بە ناچاری بە بەجێهێشتنی ٢٠٠کەلاک و٤٠٠دیل و ١٢تۆپ و ٤٦شەست تیر، پاشەکشەیان کرد. بە گوێرەی راپۆرتی شارەوانی ماکۆ کوردەکان لەم شەڕەدا نیزیکەی ٦٠٠عەسکەری تورکیان خستە گەمارۆ و لە بەینیان بردن. نیزیکەی ٥٠کەسیشیان بە دیل گرت و گوللە بارانیان کردن. دووکەس لەو دیلانە ڕزگاریان دەبێ و خۆ دەگەیێننە نێو ئۆردوی ئێران و لە وێوە دەچنەوە لای لەشکری تورک. ( ١٦)

وا دیارە ئیحسان نوری پاشا دوای ئاگاداربوون لەم شەرە، لە ڕۆیشتن بۆ کۆنگرەی خۆیبون پەشیوان دەبێتەوە و دەچێتە ئارارات. دەبێ دوای ئەم شەرە گەیبێتە ئارارات، چونکە لە نووسینەکانی خۆیدا باسی ئەم شەرە ناکات.

دوای ئەوەی دەرکەوت کە هەنگاوی عەسکەری بۆ سەرکوتکردنی راپەرین سەرکەوتو نیە، دەوڵەتی تورکیا ڕێبازی سەرکوتکردن بە ڕێگای هێمنانە دەگۆرێتەوە. بە راگەیاندنی لێ خۆشبوونی گشتی ڕێگای دڵدانەوە دەگرێتەبەر. زۆرلەو کوردانەی کە لە ساڵەکانی دواییدا بە دیل گیرابوون و دوور خرابوونەوە، دەگەڕێنەوە بۆ جێگای خۆیان. ڕابەریوەکانیش ڕێگادەدرێن کە لە ماوەی ٣مانگدا خۆ بەدەستەوە بدەن و ئەمینی وەربگرن. هەرچەندە بە ڕوونی دیارنیە کە ئەم سیاسەتە بە گشتی چەندە کاری کردۆتە سەرکوردەکان، بەڵام کارێکی ئەوتۆی

نەکردۆتە سەر هێزی سەر هەڵداوانی ئارارات. بە گوێرەی نووسراوەی ئیحسان نوری پاشا جگە لە سەید عەبدولوەهاب و تەمرشکی کە بە ئەمری فەرماندە بۆ ڕاکێشانی هێزی زیاتر خۆیان ئەمین کردەوە و چوونە ناوچەکانی دیکە، تەنیاشێخ عەبدولقادر لە سەرۆکانی (ساکان)لە گەڵ چەند کوردێک چەکیان دانا و تەسلیمی هێزەکانی تورک بوون.( ١٧)

بێجگە لە ئیحسان نوری و برۆحسکی تێللۆ کە بەرپرسی عەسکەری و ئەهلی بوون، بەرپرسایەتی دیکە بەم جۆرە دیاری کرابوون: « تەیموراغا فەرماندەی ژاندارمەری، مەلاحوسێن ئەفەندی مودیری ناوچەی کورخان، برایماغا مودیری ناوچەی بوتێ، حەسەن ئەفەندی مودیری ناوچەی ئۆرتی، موسابرکلی ئاغامودیری ناوچەی کوری، عەمریناغا مودیری ناوچەی کواخان.»

لە کاتێکا کە تەقەلای تورکەکان بۆ بڵاوە پێکردنی لایەنگرانی کوردە ڕاپەریوەکان درێژەی هەبوو، وەک لە نووسینی ئیحسان نوری داهاتوە، بەشێکی گرنگ لە هێزەکانی کورد لە تەواوی ناوچەدا بە شێوەی دەستەی پارتیزانی لە تێکۆشاندابوون.

چەند دەستەی دیکە بە فەرماندەیی دەمیرپاشا(تمرشکی)، مەمۆ(مەحمودبەگ) و نادربەگی کورانی حوسێن پاشاکوڕەی حەیدەرانلو، فرزندە بەگی حەسنانلو، خالیدبەگی جەلالی و سەیدرەسول لە ئاراراتەوە بگرە تاچیاکانی (تەندروک وئالاداغ و زینوێ میلیش و ئەرجیش و زیلان و ئاباقا و بارگیری و دیادین لە خەبات و چالاکیدا بوون.(١٨) ( ئاغای بەهات لەجیاتی چالاکی وخەبات، وشەی (راو رووت وتالآن مبرۆ) بەکاردێنێ. ک. ح )

وادێتە بەرچاو تورکەکان بەمحالەش هێشتاهیوادار بوون کە لە ڕێگای وتو وێژەوە کۆتایی بەم کێشەیە بێنن. لە نیوەی مانگی سپتامبری ١٩٢٨ دوونوێنەری مەجلیسی بەرزی تورکیا و والی قەرەکلیسا و فەرماندەی هەنگی ٢٩ی ئەرتەش و هەنگی ژاندارمەری ناوچە و حاکمەکانی دیادین و بایزید و چەند کەسیتر داوای وتو وێژیان کرد. ئیحسان نوریش ئامادەبوو لە گەڵیان دانیشێ. هۆی ئامادەیی

ئیحسان نوری بۆ وتو وێژ لە گەڵ تورکان روون نیە. نازانین مەبەستی کات رابواردن بوە، یاوەک پاشان لە زمانی خۆیەوە باسکراوە، دەستپێکردنی شەڕی بێ زوو بوە و درێژە پێدانی خەباتی چەکداری بێ کارێکی بێ ئاکام بوە.

لە قەولی ئیحسان نوری دەگێڕنەوە کە:«ئەوەی کاربەدەستانی خۆیبون بە نووسین یابە پەیام بۆیان ناردوە، وادە وبەڵێنی زۆرباش بوون، بەڵام لە کردەوەدا دیتم کە بڕیارێکی بێ جێ یان داوە. بەرلە دەستپێکی شەڕ هەموو مەسەلەکانم لە گەڵ شاندەی ئەوان باسکرد و کەم و کوڕی و ناتەواوی گیر و گرفتی کارم پێراگەیاندن. دەمزانی کە مەسەلەی ئێمە لە ڕێگای نیزامی یەوە چارە سەرناگرێ. دەبێ ڕێگاچارەی سیاسی بدۆزینەوە. هەر وەک خۆم لە گەڵ نوێنەرانی دەوڵەتی تورکیا کەوتمە وتو وێژەوە.(١٩)

ئیحسان نوری لە گەڵ شەست سوار لە گوندی(شێخی کۆیرۆ)لە٢٠کیلۆمیتری بایزید چوە دیدەنی دەستەی ناوبراو. وادێتە بەرچاو کە تورک و یستوویانە بە جۆرێکی شەخسی و هێندێ سەر پشکی و زێدەیی بدەن بە خودی ئیحسان نوری و کۆتایی بە ڕاپەرین بێنن. دیارە وەڵامی ئیحسان نوری کە پێداگرتن بوە لە سەر ویستی گشتی کوردەکان، نەیدەتوانی ببێتە ڕێگاچارە. ئاخافتنیان بێ ئەوەی ئاکامی هەبێ بە ڕێگایەکی دیکەدا درێژەی کێشا.(٢٠)

لە پابزی ئەو ساڵەدا هەر چەندە سەبارەت بە وتو وێژی ناوبراو چالاکی عەسکەری دەستەکانی کورد تا ڕادەیەک لە کورتی دابوو، هێزەکانی تورک ناوچەی (کورک)یان پەلاماردا و تا ڕادەیەکیش سەرکەوتنیان هەبوو. بەڵام دوای دژ پەلاماری کوردەکان ناچاربوون بکشێنەوە. چالاکی دەستەی پارتیزانی کورد دەست پێکراوە.(٢١) لە ماوەی بەهار و هاوینی ساڵی ١٩٢٩ئەم شێوەیە کەم و زۆر درێژەی هەبوو. بە قسەی ئیحسان نوری لە گۆڕانکاری ئەم ساڵەدا، بە ڕوونکردەوەی کردەوەی چەند کەسێک لە کەسایەتیە ناسراویەکانی کورد لە دەور و بەری مەسەلەکە، ڕاپەرین تەنگەبەر بوە.(٢٢)

# ئاخرین هەوڵ وتەقەلا

ساڵی ١٩٣٠لوتکەی توند و تیژی ڕاپەرینی کوردەکانە. لەم ساڵەدا تورکەکان لە گەڵ زنجیرە وتووێژێک و فشاری سیاسی لە بواری پێوەندیی ناوچەیی کەش و هەوایان بۆ گەمارۆدان و سەرکوتکردنی کوردەکان ئامادە کرد بوو. لە ڕوانگەی عەسکەریشەوە لە بەهاری ئەو ساڵەوە جێگیربوونی هێزێکی پەرداخیان بە فەرماندەیی سالح پاشا دەستپێکرد.(٢٣) لە بەرانبەر ئەوەدا ئیحسان نوریش لە گەڵ درێژە پێدانی شێوەی ئازاردانی پێشوو، واتە ناردنی دەستەی پچوکی پارتیزانی بۆ ناوچەکانی جیاواز و سەر گەرمکردنی هێزی دوژمن و پێشگری لە کۆبوونەوەیان لە شوێنێکدا، بڕیاریدا بە کردنەوەی جەبهەیەکی تازە لە دەوەری ئەرجیش و پانتوس، کلکەی ڕاپەرین بگەیێنێتە بەشەکانی خوارووی ڕۆژئاوا، واتە دڵی کوردستانی تورکیا و ناوچەی ڕاپەرینی شێخ سەعید و کار تەواو بکات.

بڕیار وابوو هۆزی حەیدەرانلو بە هاوکاری هۆزی خەلیکانلو لە دەشتی زیلان و چیای سیپان دەست بە ڕاپەرین بکەن و ئاڵقەی پێوەندی پێک بێنن. هەر لەو کاتەشدا بەشی سەرەکی هێزی ئارارات بە پەلاماردانی پاسگای نیزامی دەورو بەر و ناوەندی باشکەند لە سەرو، و چیای تەندروک لە خوارو، شارەکانی ئیگدیر و بایزیدیش بخەنە مەترسی یەوە. جگە لەوە دەستەیەکیش بە سەرکردەیی تەمرشکی دەبوایە بە گرتنی قلب، ڕێگای قارس و ساری قامیش بەرەو ئارارات ببەستێ.(٢٤)

ئەنجامدانی بەرنامەیەکی ئاوا ئازایانە پێویستی بە هاو ئاهەنگی تەواوی دەستەکانی چەکدار هەبوو. ئەمەش سەبارەت بە داب و خەسڵەتی عەشایری و

نارێکی هێزەکانی کورد و نەبوونی ڕایەڵکەی پێوەندی ، فرە سەخت و دژوار بوو.
پەلاماری هێزەکانی کورد لە ئاخری مانگی جۆزەردان و نیوەی پوشپەڕی ۱۹۳۰، لە گەڵ ڕاپەرینی پێشکاتی زیڵان دەستپێکرا. هاوکات شارەکانی ئەرجیش و بارگیری -یش پەلامار دران و سەرەرای بەربەرەکانی هێزەکانی تورک، سەرکەوتنی بەر چاویان وەدەست هێنا. کوردەکان باتنووس-یشیان گرت و پادگانی شار گەمارۆ درا. لە مەلازگرد-یش شەڕ دەستپێکرا. کاتێکی ئیحسان نوری لە دەستپێکی ناوەختی هێرش ئاگاداربوو، فەرمانی دا بە هێزەکانی ئارارات بۆ کەمکردنەوەی فشار بۆ سەرجەبهەی زیلان، هێزەکانی تورک پەلاماربدەن. لەم پەلامارەشدا کوردەکان سەرکەوتنیان هەبوو. پاش ماوەیەکی شەڕ تورک لە لای ملازگرد و ئوزاڵپەوە، کوردەکانیان پەلاماردا. هێزێکی عەسکەری لە قەرەکۆسەوە، واتە لە بنکەی هێزەکانی ساڵح پاشاوە بەرەو بایزید چوونە پێش و ڕێگای پاشە کشەی کوردەکانیان بۆ لای ئێران خستە مەترسییەوە. کوردەکان لە گەڵ زیانێکی قورس لە دەشتی زیلان بۆ ناوچەی سەرووی ڕۆژهەلات پاشە کشەیان کرد. دەستەیەکیان لە دەو ر و بەری ئاواجیق لە سنووری ئێران پەڕینەوە و دەستەی سەرەکیش گەرانەوە بۆ ئارارات.(۲۵)

کاتێ لە ئاخری مانگی پوشپەڕ و نێوەراستی گەلاێز توند و تیژی شەڕ لە کورتیدا ، سەرە رای خەساری قورسی تورکەکان و دەسکەوتی زۆری کوردەکان(۲٦) بەشکانی جەبهەی زیلان و ئەرجیش، دەرفەتانی پەرەگرتنی شۆرش بۆ ناوچەکانی تری کوردستانی تورکیا کە تاقە شانسی درێژە پێدانی ڕاپەرین بوو، لە بەین چوو. لەم قۆناخەدا نەک هەر تێکۆشان بۆ پەرە پێدانی راپەرین بێ ئاکام بوو، بەڵکوو تێکۆشانی هێزەکانی تری کوردیش بۆ پشتیوانی لە ڕاپەرین نەگەیشتە ئامانج. لە سەرەتای مانگی خەرمانان نیزیکەی ۲۰۰کەس لە کوردەکانی سوریا بە ڕێبەرایەتی حاجۆکەلەلایەن بەدرخانەکانەوە پشتیواتی دەکرا سنووریان بەزان و گوندی(حبات)یانگرت. ئەوان دەیانویست بۆ پشتیوانی لە ڕاپەرینی ئارارات هێزکۆبکەنەوە و دەست بە شەڕ بکەن. بەلام زۆر زوو لە لایەن هێزەکانی تورکەوە سەرکوتکران.(۲۷)

له کوردستانی عیراقیش کوڕی حوسێن کوێر توانی نیزیکەی ٥٠٠سوار لە کەسانی شێخ ئەحمەدی بارزانی بۆ یارمەتی ڕاپەڕینی ئارارات کۆبکاتەوە. ئەوان لە سەرەتای مانگی گەلاوێژ لە عیراقەوە(ئۆرامار)ی تورکیایان پەلاماردا. بەڵام ئەم تەقەلایەش لە لایەن هێزەکانی تورکیاوە سەرکوتکرا. هاوکات لە گەڵ ئەم تەقەلایانە لە ناوچەکانی دیکەی کوردستانی تورکیاش تێکۆشانی لێک بڵاو بۆ پشتیوانی لە ڕاپەڕینی ئارارات دەست پێکرا. بەڵام هیچیان بە ئاکام نەگەیشتن.

یەکێ لە گۆڕانکارییە گرنگەکانی ئەوماوەیە گۆڕانی هەڵوێستی ئێران بوو. کاربەدەستانی تاران کە تائەو دەم زیاتر ڕەوتی بێلایەنیان گرتبوەپێش، ئێستا بە زیادکردنی هێزی نیزامی خۆیان لە ناوچە و تەنگ پێهەڵچنینی هێندێ عەشیرەتی سەر سنوور، سیاسەت و هەڵوێستێکی تازەیان گرتە بەر.

کاتێکی دوای نیزیک بە مانگێک ڕاوەستان، لە سەرەتای مانگی سپتامبر پەلاماری سەرانسەری هێزەکانی تورک بۆ سەر پێگەی سەرهەڵداوان دەستپێکرا، لە گەڵ پێشڕەوی لەشکری تورک لە بەشی ڕۆژهەڵاتی ئاراراتەوە، واتە لە خاکی ئێرانەوە، هێزەکانی ئیحسان نوری گەمارۆ دران و ڕاپەڕینی ئارارات پاش ٢٠ڕۆژ شەڕ و بەربەرەکانی توند تووشی شکان هات. هەرچەندە هێندێ لە دەستەکانی پاشماوە، تێکۆشان لە قۆناخی دوایشدا، خەبات درێژە پێبدەن، وەک هێرشی بیستەمی ئۆکتۆبری برۆحسکی تێللۆ لە دەور و بەری ئارارات، بەڵام ئیتر کار لە کار ترازا بوو. (٢٨)دوای ئەم قۆناخە لە ڕاستیدا دەبێ لە ئێران بە دوای ئەنجامی ڕاپەڕینی کوردەکاندا بگەڕێین کە بەشێکی گرنگ لە هێزی شکاو، بە ئیحسان نوری پاشا و سەرۆک عەشیرەتەکانی هاوکارییەوە، پەنایان بۆ ئێران برد. بەڵام پێش ئەوەی وە دوای ئەم ڕوو داوانە بکەوین، جێی خۆیەتی لە دەستپێکی کارەوە، واتە لە شێوەی هەڵوێستگرتنی دەوڵەتی ئێرانەوە لە بەرانبەر شکانی ڕاپەڕینی شێخ سەعید، لە مەسەلەکە بکۆڵینەوە. پاشانیش کارکردی ئاڵوگۆڕ و کارەساتی دوایی- واتە ڕاپەڕینی ئارارات - لە سەر پێوەندی دەرەوەی ئەم دوو وڵاتە (ئێران و تورکیا) تەماشا بکەین.

سەرچاوەکان :

1- Martin van Bruinessen , Agha, Shaikh andstate ,Thesosial and political Stracture of Kurdistan, zed Book-sLid. London, 2991, p.672.

٢ - کەندال و دیگران، کردها، ترجمە ابراهیم یونسی،تهران، انتشارات روزبهان، فارسی ١٣٧٠، ص ص ٧٩-٨٣

3 - Siyamend Othman, "Kurdish Nastionalism Instigators and Historical Influence" reproduced in Armenian Review ,Spring 2891 ,vol.42.no,1\561.pp.53- 54.

٤ - کەندال، پیشین، ص ص ٩٩__ ١٠٢،

5 - van Bruinessen,op.cit.pp,279- 81, Robert Olson. The Emergence of Kurdish Nasionalism.1880-1925, Univercity ofTexas Oress,1991,pp-46-

6-van Bruinessen,op,cit,pp-281-284, Olson,op,cit,pp-92.

٧ - لە راپۆرتێکی کارگوزاری ورمێ بۆ وەزارەتی دەرەوە تارێخی ٢١خردادی ١٣٠٥باسی شەری شێخ مصلح الدینی شەمزینی لە گەل هێزی تورک و عملیاتی هێزەکانی تورک لە دەور و بەری باشقەلا دەکات، لەوانەیە هەر ئەو پێکهەلپرژانەی ناوچەی هەکاری بووبێ. بروانە بەلگەکانی پاشکۆ، بەلگەی ژمارە ٢

٨ __ بۆ ئاگاداری زیاتر لەم رووداوە، بروانە ( رووداوەکانی ئارارات) بیرەوەریەکانی ئیحسان نوری، رۆژنامەی کوهستان، ١٣٢٤

9 - Dr.Bjech Chirguh, La Question Kurde, ses orgines rt ses causes,Le caire, 1930,p.34-35.

١٠ - اسناد ملی ، ١٧٧٩ ـــ ٢٩٣

١١- اسناد ملی ، ١٧٧٩ ـــ ٢٩٣

12 – Arshak Safrastian, Kurds and Kurdistan, London, the Harvill Press ltd,1984, p, 84

١٣ - کاروساسونی، بزوتنەوەی نیشتمانی کورد و پێوەندی ئەرمەنی و کوردەکان، بی جابی تابی نا. ص ٨(نامیلکە لە٤٠ لاپەرەدا کەبەگوێرەی روونکردنەوەی هەوڵی کتێبە وەرگێرانی کورتەیەکە لەفەسڵەکانی ١٢و١٤ کتێبی ناوبراو بەو ناوە: Karo Sassion az≠gayin Sharjounmner yer Hsya Kurdakan Haraberoutunner, Irvan, 1956.

١٤ - زناو سلوبی، فی سبیل کردستان(مذکرات) ترجمە ر.علی. المکتبە التقدمیە الکردیە . دارالکتاب

١٥ - وزارت داخلە، ادارە غـــرب، نمرە ١٠٧٠، تاریخ ٢٦دی مـــاە ١٣٠٦ اسنادملی، ک(٢) ٦٧٤٧ بروانە بەڵگەکانی پاشکۆ، بەڵگەی ژمارە ٧

١٦ - وزارت داخلە، ایا لت ازربایجان، سواد راپورت(نظمیە ماکو)بدون نمرە١٦مهر(١٣٠٦) اسنادملی (ن)٩٠٠١/٢٢٤٩٠١٠٢٠١٠بروانە بەڵگەکانی پاشکۆ ، بەڵگەی ژمارە ٤

١٧ - رووداوی ئارارات، کوهستان، ژمارە ١٩، ٢٤/٤/١١

١٨ - رووداوی ئارارات، کوهستان، ژمارە ٢٥ / ٢٤/٥/٢٢

١٩ - سرهنگ ستاد عیسی پژمان، کوردەکان و کوردستان، رابردوەکانی مێژوویی، هەڵکەوتی جوغرافیایی، بارودۆخی ئابووری، مەسەلە کۆمەڵایەتیەکان و رێکوپێکی ئارمانەکان و گۆرانکاری یە سیاسی یەکان، ٣ج،ج٣(سیاسی)، پاریس، شهریور ١٣٧١ ١٩٩٢، لە بڵاو کراوەکانی ژین، ل ١٥٨

٢٠ - رووداوەکانی ئارارات، کوهستان، ژمارە ٢٠ - ٢٤/٤/١٨

٢١ - هەرئەو ژمارەیە، ژمارە، ٢١ - ٢٤/٤/٢٥ هەرلەو رۆژانەدا شارەوانی

بازرگـان له راپۆرتێکدا دەڵێ: دوو فـڕۆکـەی تورکیـا شـوێنی سـەرهەڵداوانیـان بۆمباران کردوە. سەیری بەڵگەکانی پاشکۆ بکەن، بەڵگەی ژمارە ١٧.

٢٢ – ڕووداوەکانی ئارارات، کوهستان، ژمارە ٢٤ –٢٤/٥/١٥ و ژمارە ٢٥– ٢٤/٥/٢٤.

٢٣ – سەرچاوە کوردیەکان ژمارەی هێزەکانی تورکیان لەم قۆناخەدا بە٦٠ هەزارکەس داناوە، بەلام سەرلەشکر حەسەن ئەرفەع لە شیکردنەوەی ئەم ڕووداویەدا، ژمارەی ئەوان بە ١٢هەزارکەس دادەنێ.

٢٤ – ڕووداوەکانی ئارارات، کوهستان، ژمارە ٢٩ – ٢٤/٧/١٦... ساسونی، پێشین، ص ص ٣٣ ـــ ٣٠

25 – Arfa , op. cit, p, 40

٢٦ – لە سەرچاوە کوردیەکاندا دەستکەوتی ئەم شەڕە ٦٠ ڕەشاش، ٦٠ئەزار فیشەک، ٢٤تۆپ، ١٨٠ خێوەت باسکراوە. خەساری تورکەکان ٢٨٠٠ کوژراو، بریندار ٤٠٠، دیل ١٧٠٠، خەساری کوردەکانیش ٢٨٠٠ کوژراو و٤٠٠ بریدار و٣٦٠ بێشوێن. Chirguh,op ,cit , p, 93

27 – Arfa, The Kurds , pp , 41 –

پاش ئەم گۆڕانکاری یە دەوڵەتی فەرانسە کە ئەو دەم سەرپەرشتی سوریای بەدەستەوە بوو، لە سەر داوای دەوڵەتی تورکیا، بەدرخانیەکان و سەرۆکانی تری کوردی خستە ئاستەنگەوە.

٢٨ – ڕووداوەکانی ئارارات، کوهستان، ژمارە ٢٣ –٢٤/٨/١٣، ساسونی، پێشین، ص ص ٣٨ – ٣٤

## بەشی دووەم

# ناکۆکی یەکانی سنوور و ڕکە بەری هۆزەکان

هەڵکەوتی ئاقاریی و بار و دۆخی سیاسی و کۆمەلایەتی ئارارات و دەشتەکانی دەور وبەری، کـەش و هـەوایەکی لە باریان بۆ هەڵدان و بەردەوامیـی کـۆچەری پێکهێنابوو. چونکە جگە لە لەوەڕگەی زستانی و هاوینی، هەڵکەوتی سیاسی ناوچە وەک مەیدانی کێشەی هێندێ دەسـەڵاتەکانی ناوچەیی، لە گەڵ ئەزمی عەشایری لە گۆڕانهاتوو ڕێک دەکـەوت. هۆزە خاوەن دەسـەڵاتە کانی ئەم ناوچەیە کە کـار و کردەوەی مـێژوویی ئەوان مەسـەلەی سـەرەکی ئەم لێکۆڵینەوەیە پێک دێنێ، بریتی بوون لە : عێلەکانی کوردی جەلالی، میـلان، حەسـنانلو و حەیدەرانلو. بەشـێکی گرنگی ئەم هۆزانە(وەک تایفەی جەلالی و میلان)، تاپێش پەیمانی تورکمـانچایی لەو بەری ئاراز، واتە لە ناوچەی ئێرەوان دەژیان کە دوای سـەرکەوتنی رووسـەکان، لە گەڵ ژمارەیەک لە عەشیرەتی دیکە و موسڵمانی دانیشتووی شار و گوندی ئەو مەڵبەندە هاتنە ئێران.(١)

جەلالی یەکان لە گەڵ تیرەکانی وەک: مسـرکانلو، خـەلیکانلو، حەسۆ خـەڵف و سـاکـان، هاوینان لە دەور وبەری ئاراراتی بچـوک و زسـتـانانیش لە ناوچەیەکی بەربلاوی گوندەکـانی دەور و بەری چەمی قەرە سـو، و ناوچـەی خـوارووی ماکۆ لە دەور و بەری قـەرەعـەینی(کـانی رەش) بـڵاو دەبوونەوە. هۆزی مـیـلانیش لە پەنا جەلالییەکان لە ڕۆخەکانی چەمی ئاراز و چیای سـوکاری ماکـۆ دەژیان. جگە لە هۆزی عروسانلو، یەکی ترلە هۆزەکانی گرنگی ناوچە، هۆزی حەیدەرانلوبوو کە بە

دوو هەزار ماڵەوە گەورەترین هێزی کورد لە ناوچەی نێوان موش و ورمێ دا دەژیا. یەکی دیکەش حەسنانلوبوو لە نێوانی بتلیس و ئێراندا نشتەجێ بوو.(٢)

دەسەڵاتی سەرەکی مەڵبەند، بە دەست تایفەی بەیات ماکۆ وە بوو، کە لە زەمانی شاعەبباسی سەفەوی یەوە، نیزیکەی ٣٠٠ ماڵیان لە ناوچەی چخورسەعدی نیرموانەوە هێنابوونە ماکۆ.(٣) پاش ئەو تاریخە خانگەلی ماکۆ بە درێژایی مێژووی هەوراز و نشێوی ئەو مەڵبەندە بە کەڵک وەرگرتن لە هێزی عەشیرەتگەلی ناوچە، بە تایبەت جەلالی و عروسانلو کە بەتایفەی دەوڵەتخوای ماکۆ حیساب دەکران، لە سنووری سەرووی رۆژئاوای ئازەربایجان بە کۆڵەکەی گرنگی دەسەڵاتی ئێران دەژمێردران. لە قۆناخی هەوەڵی سەردەمی باسەکەی ئێمەشدا، اقبال السلطنەی ماکۆیی، جڵەوی کار و باری ناوچەی بە دەستەوە بوو.

## سنوورەکانی ئێران وعوسمانی (*)

بە دەستپێکی تەقەلای نێوە راستی سەردەمی قاجاریۆ دیاریکردن و سەپاندنی سنوورەکانی ئێران و عوسمانی، هەڵکەوتی سیاسی هۆزەکانی ناوچەش گۆرانی بە سەرداهات. ئازادی کردەوە کە لە مل بە ملەی دەسەڵاتەکانی دراوسێدا، دەگرا کەڵکی لێ وەربگیرێ، تەنگە بەر کرا.

بە تایبەت پاش هێنانە گۆری کەلالەی پێویستیی نیشتەجێکردنی هۆزەکانی ناوبراو، وەک پێش مەرج بۆ رێکوپێکی سنوورەکان.

لە ساڵی ١٨٤٣زایینی کە وتووێژی ئێران و عوسمانی بۆ دیاریکردنی

---

*-خوێنەری بەرێز باش دەزانن کە هەموو کێشە لەسەرلێفەی مەلایە. هەموو سنووروناوچەومەڵبەندی کەلێرەدا باسدەکرێن، خاکی کوردستانەو بەئێران وعوسمانی ناودەبرێن وکێشەیان لەسەرە .

هەرچی وشەگەلی:عەشایرسنوورنشین، ئەشرار، یاخی، رێگر، تالانچی و...هتد لەم نووسراوە فارسی یەداهاتوە ، چ هی خودی ئاغای بەیات بێ ویاوەرگیرابێ، هەمووی مەبەستی کوردە و لە جیاتی ناوی کورد ئەم وشانە بەکارهاتوون .

سنوورەكان بە بەشداریی نوێنەرانی رووسیا و بەریتانیا دەستپێكرا (كۆنفرانسی ئەرزەرۆم) مەسەلەی تابعیەتی عەشیرەتەكانیش باسكرا. سەر بە قەومی بوون و رێبازی كۆچی سالانەی هێندێ لەو تایفە سنوورنشینانە جۆرێك بوو كە زۆر جار دیاریكردنی سنوورلە گەڵ رێباز و شێوەی ژیانی ئەوان جۆرنەدەهاتەوە. جگە لەوە سوننەتی كەلك وەرگرتن لە مل بەملەی دەسەلاتەكانی دراوسێ ئەوەندە كۆن و ریشەداربوو، كە هێندێ لە هۆزەكانی ئەم مەڵبەندە ئەگەرلە بواری لەوەرگە و كوێستانیشەوە پێویستیان بە كۆچ و كۆچبار نەبوایە، لە بواری پێویستی سیاسی یەوە ئەویەرەو بەریان دەكرد.

بە گوێرەی بەندی هەشتەمی پەیمانی ئەرزەرۆم(١٨٤٧ ز) بۆ نەهێشتنی تالان و بڕۆی هۆزەكانی سەر سنوور، بڕیاردرا:« ئەو هۆزانەی كێشەیان لە سەرە و دەوڵەتیان دیارنیە، تەنیایەكجار دەسەلات بدرێ بە خۆیان ئەم شوێنە دیاری بكەن كە دەیانەوێ لە مەودوا لێی نیشتەجێ بن. ئەو هۆزانەی كە دیارە سەر بە كام لان بە زۆری ببردرێنە خاكی ئەو دەوڵەتەی كە سەربەوین. (٤) بەلام هەروەك لە رەوەندی ئاڵوگۆڕەكانی دواییدا دەركەوت ، بە جێگەیاندنی نێوەرۆكی پەیمانی ناوبراو، و مەسەلەی دیاریكردنی تەكلیفی هۆزەكانی سەر سنووریش توشی تەنگ و چەڵەمەی زۆر بوو. لە سەرەتاوە كاربەدەستانی ئێران و عوسمانی هەریەكە تێدەكۆشان بە نیشاندانی ژمارەیەك لە عێل و عەشیرەتی سەر بە خۆیان، مەسەلەكە بە شێوەی دیپلۆماتی چارە سەر بكەن. (٥) بەلام لە بەر ئەوەی شوێنی نیشتەجێیی زۆر لەو هۆزانە جێگای ناكۆكی بوو، مەسەلەی تابعیەتی هێندێ لە ئەوانیش، بە تایبەت جەلالی و حەیدەرانلو لە ناكۆكی ئێران و عوسمانی زیاد بوو.

لە نیوەی دووەمی سەدەی ١٩ی زایینی، واتە دوای شەڕەكانی كریمە١٨٥٤و شەڕی ئێران و ئینگلیز لە سەرمەسەلەی هرات ١٨٥٦ كاری كومیسیۆنی دیاریكردنی سنوور دەست پێكراوە. كاربەدەستانی عوسمانی هەوڵیاندا لە ڕێگای هانداانی نیزیكەی ٢٠٠ماڵی هۆزی جەلالی بۆ هاتنەدەر لە ژێرتابعیەتی ئێران و نیشتەجێ بوون لە خاكی عوسمانی، هەڵكەوتی سنووری خۆیان قایمتربكەن. بەلام

زۆری پێ نەچوو کە بە گەڕانەوەی زۆریان بۆ خاکی ئێران، تەقەلای عوسمانی بێ ناکام بوو.(٦) بە گوێرەی هێندێ ڕاپۆرتی دیکە، وادێتە بەر چاو کە یەکێ لە ئەرکە سەرەکیەکانی کومیسیۆنی هاوبەشی ١٨٩٢ز، کە بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەکانی سنوور پێکهاتبوو، دەبوایە بە گیر و گرفتی هۆزی جەلالی و حەیدەرانلو ڕابگات. بە تایبەت کە عوسمانیەکان هەوڵیان دەداکە هەڵکەوتی خۆیان لە ڕێگای ڕاکێشانی هێندێ هۆزەکانی سنوور پتەوبکەن. لە بەرئەوە کاتێک دەستەیەک لە عەشیرەتی جەلالی بە سەرۆکایەتی مستەفا بەگ چوونە خاکی عوسمانی، اقبال السلطنەی ماکۆیی هەولی دا بە هێنانی محەممەد سەدیق بەگ یەکی دیکە لە سەرۆکانی حەیدەرانلو، لە خاکی عوسمانی، تۆڵە بستێنێتەوە. محەممەد سەدیق بەگ ساڵی ١٩٠٢ لە گەڵ نیزیکەی ٥٠٠ ـــ ٦٠٠ ماڵی سەربەخۆی هاتە خاکی ئێران. اقباڵ السلطنە کردی بە حاکمی قەرەعەینی و ئەویش بەڵێنیدا کە نیزیکەی ٥٠٠ماڵی دیکەش بێنێتەوە ئێران.(٧)

لە گەڵ هەمووی ئەم ناکۆکی بیر و ڕا و مل بەملەی عەشیرەتی، کاری کومیسیۆنی دیاریکردنی سنوورەکانی ئێران درێژەی هەبوو. ئەوەش لە سەر پێداگرتنی نوێنەرانی رووسیا و بەریتانیابوو کە بە لە بەرچاوگرتنی ئاڵوگۆری سیاسی لە ئوروپا و ڕەنگە لە ناوچەکانی تری جیهانیش کێشە و هەراسازێ، دەیانویست بە خێرایی ئەو مەسەلەیە چارەسەربکرێ. لە تەواوی ئەم قۆناخانەدا سیاسەتی بەریتانیا دەیویست مەسەلەکە بە قازانجی دەوڵەتی عوسمانی(هاوگری سوننەتی بەریتانیا) لە ناوچە ببڕێتەوە. لە ناوچەکانی سەرووی سنوورەکان، واتە ئەو ناوچانەی نیزیک سنووری رووسیا، رووسەکان ناڕادەیەک دەبوونە بەرهەڵست. لە گەڵ ئەوەش دیاریکردنی ئەم سنوورە بە ناتەواویشەوە لە گەڵ مافی مێژوویی ئێران یەکی دەگرتەوە. لە سەر بنچینەی بڕیاری کومیسیۆنی تێکەڵی دیاریکردنی سنوور کە لە نوڤمبەری ١٩١٣دەرچوو: دەختی سنوور لە باکور لە نیشانەی نمرە٧٧ سنووری رووس و عوسمانی کە لە نیزیک سەرداربلاغ و سەرووی لوتکەی نێوان ئاراراتی گەورە و ئاراراتی پچوک دەست پێدەکات. پاشان

بۆلای باشور بە سەرلوتکە جیاکاندا تێدەپەڕێ، دۆڵی دامبات وناوچەی یسارینج و زنجیرە شاورێژەکانی یارم قیا دەگرێتەوە و بە لای ئێراندا دێت. پاشان خەتی سنووری ناوچەی بولاغباشی بۆ ئێران بە جێ دێڵێ و بەر دەوام بە سەر بەرزترین لوتکەدا تێدەپەڕێ و بۆلای ڕۆژئاوا و باتلاغی ڕۆژئاوای یارم قیا دەور دەداتەوە و لە چەمی ساری سوو دەپەڕێتەوە و بە نێوان گوندی(کوردباران)کە هی عوسمانییە و بازرگان کە هی ئێرانە، تێدەپەڕێ بە لوتکەی ڕۆژئاوای بازرگاندا سەردەکەوێ و لە درێژایی دا بەشبوونی ئاوی لوتکەکانی باشور، درێژە پێدەدا.(٨)

عوسمانیەکان هەرچەند لەو کومیسیۆنەدابوون و نوێنەریان زیرەوانی هەموو قۆناخەکان بوون و پەسندیان کردبوو، بە کردەوە هەڵوێستی دژی ئەم ڕێککەوتنەیان گرتە پێش. جگە لە بەشێکی بەرینی سنووری ڕۆژئاوای ئێران کە تەنانەت کاتی تێکۆشانی کومیسیۆن لە ژێر دەستی عوسمانی دابوو، بە دەستپێکی شەڕی یەکەمی دنیاگر و یەکێتی عوسمانی لە گەڵ دوژمنانی رووس و بەریتانیا، نەک هەر بڕیارەکانی کومیسیۆن لە لایەن دەوڵەتانی ئێران و عوسمانی بە ڕەسمی پەسند نەکران، بەڵکوو هێزەکانی عوسمانی لە کاتی پێشڕەوی بۆ ناوچەکانی ڕۆژئاوای وڵات ، هەموو نیشانەکانی سنووریان تێکدا کە کومیسیۆنی تێکەڵ دایبنابوو.

# کۆتایی شەڕی دنیاگر ودەستپێکی دەورەیەکی دیکە لەگیروگرفتی سنوور

ئاژاوەی لە شەڕ هەڵگیرساو، تەنیادوای شەش ساڵ بە شکانی هێزی سمایلاغای سمکۆ هاوینی ۱۹۲۳ و جێگیربوونی هێزەکانی دەوڵەتی لە ناوچەکانی ئازەربایجان دامرکایەوە. لەم دەورەیەدا، لە کاتێکا سەبارەت بە کردەوەی عوسمانیەکان و درێژەی دەست تێوەردانیان لە کار و باری عەشیرەتگەلی سەرووی رۆژئاوای ئێران ( بەتایبەت پشتگری ئەوان لە سمکۆ)دڵە راوکە هەبوو، هەرلەو کاتەشدا دەسەڵاتی لە زێدەیی کەمالیستەکان بۆ هێندێ لە کۆڕە سیاسییەکانی تاران مزگێنی پێوەندیی تازەی نێوان ئەم دوو وڵاتەی پێوە بوو: وەک نموونەیەک لەم گۆرانکارییە دەکرێ ئاماژە بۆ راپۆرتی باڵیۆزخانەی ئێران لە فەرانسە بکرێ کە بە سەرنجدانی هاوکاری سیاسی تورک و بۆڵشەویکەکان لەو کاتەدا وریایی دابوو بە کار بەدەستانی ئێران(۹):«مەعمورەکانی عوسمانی ئەوەندەیان رووسیابە هاوپاری خۆ دەزانی دەیانویست بە بیانووی ئەوە کە خاکی ماکۆ بەرێژەوە و بۆ ژیانی ئەناتولی پێویستە، بەڵێنی دژایەتی نەکردنی رووسیا بۆ داگیرکردنی ماکۆ وەربگرن..»(۱۰) هەر وەها لە هەیئەتێک یادبکرێ کە هەرلەو رۆژانەدا بۆپێکهێنانی پێوەندی دۆستانە لە گەڵ کەمالیستەکان و بە تایبەت پچڕانی پشتیوانی لە سمکۆ بۆئانکارا ناردرا.(۱۱)

لە کاتێکا کە پێوەندی ئێران و تورکیا هێشتا روون نەبوو، زنجیرەیەک پێکهەڵپرژان و مل بە ملە ی سنوورلە هەرتک لا دووبارە سەریان هەڵداوە. لە سەرەتای خاکە لێوەی ۱۹۲۳لە نێوان تایفەی وەلایی و شێخیکانلو شەڕسازبوو. اقبال السلطنە حوسێن پاشاخانی ماکۆیی و ئەبولحەسەنخانی ئێلخانی نارد ئاشتیان کەنەوە. دوای ماوەیەک کە هێشتا ئەم کێشەیە نەبرابۆوە، لە سەرەتای

مانگی بوشپەڕدا لە نێوانی تایفەی خەلیکانلو، و مرکانلو(هەرتک لە عێلی جەلالی)شەڕێکی گەورە سازبووکاتێ کە مرکانلومکان لە سەر ڕێگای کوێستانێ لە سێ فرسەخی ماکۆ خستبوویان، خەلیکانلو پەلاماریان دان و مەڕ و مالاتیان بە تالان بردن. تاهیراغا سەرۆکی هۆزی مرکانلو، لای اقبال السلطنه شکایەتی کرد. ئەویش بۆ نەهێشتنی کێشە و ناخۆشی، ناردیە کن خالیداغا سەرۆکی هۆزی خەلیکانلو. معتمدالوەزارە، کومیسەری سنووری ئێران لە راپۆرتێکدا بۆ وەزارەتی دەرەوە دەنووسێ: «ئەگەرقەرارێ تایفەی خلیکانلو سەرە ڕای کەمی خەلک و ئەژماریان دەست بە شەرارەت بکەن و سزادان و بەرپرسییەک نەبێ، وێدەچێ عەشیرەتەکانی دیکەش بە گوێرەی سروشتی وەحشیانەیان چێتربن.» وەک تێبینی کرد بوو، هەر واشی لێهات. پاش ئەوەی کە خەلیکانلو مەڕ و مالاتی تایفەی بلغ کانلویان تالان کرد، ئەوانیش لە گەڵ تایفەی جنگانلو پەکیان گرت و دژی خەلیکانلو کەوتنەشەڕ. وردە وردە هێندێکیتر لە تایفەکانی دیکەش ڕەگەڵ شەڕکەران کەوتن.

ئەم هەرایە لە ناوچەی سەرسنووری ماکۆ نە دەکرا کارنەکاتە سەر پێوەندیی ئێران و تورکیا. تورکەکان کە بە هیچ جۆر اقبال السلطنەیان نە دەویست، هەرا وئاژاوەی ناوچە و ڕەنگدانەوەی لە نێو عەشیرەتگەلی سەر بە خۆیان کردەبیانو، وئەوەیان بە دنەدانی اقبال السلطنه دەزانی. داوایان لە دەوڵەتی ئێران کرد:..«پێشی ئەو کەسانە بگیرێ کە هێمنایەتی سنوور و پێوەندی دۆستانە تێکدەدەن»(١٢) پاش ماوەیەکی تر ئیدیعایان کرد کە تایفەی قەرەباش ئۆغلو، بە هاندانی اقبال السلطنه لە نیزیک بایزید سنووری مەجلیسی مەزنی تورکیایان پەلامار داوە و تالانیشیان بردوە.(١٣).

معتمدالوەزارە کومیسەری سنووری ئێران لە سەرئەو باوەڕە بوو کە بزۆزی خەلیکانلو، و پەلاماردانی تایفەکانی دیکەی هۆزی جەلالی بۆتە شتێکی ئاسایی: «.. وادیارە خەلیکانلو هێندێ خەیاڵیان هەبوە کە نوێنەریان بۆ تەورێز نە ناردوە. ماوەیەکیش خەریکی کۆکردنەوەی چەکو جبەخانە بوون.(١٤)ناوبراو لە

راپۆرتێکدا، لە گەڵ ئاماژە بۆ بوونی دەستی عەشایری عوسمانی لەم کارەدا، گۆڕانکاری ناوبراو بە کارێکی زیاترلە ڕوو داوێکی ناوچەیی دادەنێ:« وا دیارە کوردەکانی ئەم مەڵبەندە لە دەرەوە و نێوخۆ پێکەوە ڕێک کەوتوون و بە دوای خەیاڵێکدا بۆ ئەو مەسەلانە هەنگاو دەنێن«(١٥) هەرلەم بوارەدا ئەمیرلەشکرئیسماعیلخان(امیرفضلی) حاکمی ئەیالەتی نیزامی ئازەربایجان داوای لە وەزارەتی خۆجێی کرد:..« یادداشتێک بۆباڵیۆزخانەی عوسمانی بنێردرێ کە بۆپێشگری لەم جۆرە ڕووداوانە فەرمانی پێویست بدەن بە مەعمورەکانی سەر سنووری خۆیان.» لەم ناوەدا گۆڕانێکی تازە پەیدابوو کە ڕەنگە بوویێتە هۆی ڕوونکردنەوەی گەلێک لە ڕووداوەکانی دوایی. لە نێوەی پوشپەری ئەو ساڵەدا، تورکەکان خەریک بوون لە بولاغباشی، یەکێ لە پاسگاکانی سنووری ئێران لە دەور و بەری یارم قیا قولله و بنایەک دروست بکەن. اقبال السلطنه لە راپۆرتێکدا بۆ ئەمیرلەشکر ئیسماعیلخان، دوای پێداگرتن لە سەر گرنگیی سنوری ئەم ناوچەیە و ئەمەش کە لە کۆنەوە بەشێکی خاکی دەوڵەتی ئێران بوە و، لە دیاری کردنی کومیسیۆنی سنووریشدا وەبەرئێران کەوتوە، داوای کرد کە لە گەڵ شایەندەری عوسمانی وتو وێژبکا و نەهێڵێ ئەم قوللەیە دروست بکرێ. ناتوانین ئەم شوێنە لە کیس خۆیدەین..» ناوبراو وەبیری دەخاتەوە هەرچەند خۆی دەتوانێ خەڵک کۆبکاتەوە و لەم سنوورەیان دابنێ، بەڵام لە بەرئەوەی فەرمووتانە بە بێ ئاگاداری هەنگاوێک هەڵناهێنم، چاوەڕوانی فەرمان ئەنجامی لێبراوم. خێراوەڵام بدەنەوە. ئەگەرعوسمانیەکان ئەم قوللەیە قایم بکەن، نەهێشتن و وێرانکردنی دژوارە.«(١٦)

ئەمیرلەشکرلە راپۆرتێکدا بۆ سەرۆک وەزیر دەنووسێ:« لە وانەیە پێشگری اقبال السلطنه دژواری پێک بێنێ. تکایە خێرا فەرمان بدەن تادرنگ نەبوە پێشی بگرین» هەرچەند وەزارەتی دەرەوە لە لایەن سەرۆک وەزیرەوە ئاگادار کراوە، بەڵام لە بڕیاری وەزارەتی دەرەوە ئاگاداریەکمان بە دەستەوەنیە. لە ڕاستیشدا ئەو دەم بە لە بەر چاوگرتنی هێزەکان تەنیاکەسێک کە توانیبای ئەم کارەبکات، هەراقبال السلطنه بوو. وەک دەبینین کاربەدەستانی ناوەندی لە بەر دژایەتی تورکەکان و

بابەرژەوەندی دیکە، کە روون نیە، رازی بە دەست تێوەردانی ئەو نە بوون. اقبال السلطنە کە لای وابوو هیچ دەست درێژییەک بۆ سەرخەڵکی سەر بە دەوڵەتی عوسمانی نەکراوە، لە هاوکاری نەکردنی کاربە دەستانی عوسمانی بە تایبەت لە والی بایزید بە گلەیی بوو. بە قسەی ئەو، تورک پێوەندی دۆستایەتی لە بەر چاو ناگرن و بە ئاشکرا دوژمنایەتی نیشان دەدەن و دەست درێژیان بۆ سەر بولاغباشی ئاشکرایە. ئاخرییەکەی دوای گۆڕینەوەی چەند نامە لە نێوان وەزارەتی دەرەوە و باڵیۆزخانەی عوسمانی، لە هەوڵی پوشپەردا، ئەمیرلەشکری سەرووی رۆژئاوا لە گەڵ شابەندەری عوسمانی بۆ چارەسەرکردنی سنووری ماکۆ و پێشگری لە دەست درێژی عەشایری عوسمانی و کوردەکانی ئێران، چوونە ماکۆ. لە ئەنجامی ئەو سەفەرەدا تارادەیەک ئاکۆکی نێوان سنوورنشینەکان و سەقامگرتوویی ئەمنیەت دابینکرا. لەم سەفەرەدا بە بەشداری میرئالاحەیدەربەگ فەرماندەی هێزەکانی تورکیا و والی بایزید، کومیسیۆنێک بۆ پێراگەیشتن و داواکاری هەر تک لا پێکهات. پاش ماوەیەک دەوڵەت بە دانانی سەرباز لە بازرگان و شەیتاناوا، پارم قیا، قۆینبلاغ، نفتو، جەمالکەندی، پیرامن کەندی، (سنووری ناواجیق،)، عەرەب (بەرانبەرشاتەختی)و قۆیون قشلاق (بەرانبەر بە نەخچەوان زنجیرە پاسگایەکی سنووری دروست کرد. (۱۷)

## حکوومەتی نیزامی

لە گەڵ پتەوبوونی هەڵکەوتی دەوڵەتی ناوەندی و دامەزرانی پاسگاکانی نیزامی سنوور، سەردەمی دەسەلات و حوکمرانی چەند سەد ساڵەی اقبال السلطنە وبنەماڵەی لە ماکۆ کۆتایی پێهات. لە دوای سەفەری ئەمیرلەشکر عەبدولاخانی تەهماسبی حاکمی نیزامی ئەیالەتی ئازەربایجان بۆ ماکۆ، شەوی ۲۹ی مهری ۱۳۰۲( ئوکتۆبری ۱۹۲۳ )اقبال السلطنە گیرا و بۆ تەورێز رەوانە کرا. لە ئاگاداری رەسمی ئەمیرلەشکردا، سەبارەت بە گیرانی ناوبراو گوترابوو: لەم دواییانەدا دەستی بە هێندێ کاری چاوەروان نەکراو کردبوو. ویستوویەتی لە نێوانی تایفەی

کوردەکانی ماکۆ ئاگری شەڕ و کێشە هەڵبکات و هانیان بدابۆ شۆڕش و سەربزێوی.»(١٨)

بەڵگەی سەرەکی گرتنی اقبال السلطنه هەرچی بووبێ، ئەوەندەیە ناوبراو پاش ماوەیەکی کورت بە شێوەیەکی گومان لێکراو لە زینداندا مرد. پاش گرتنی اقبال السلطنه ئەمیرتەهماسبی ماوەیەکی کورت لە ماکۆمایەوە. حکوومەتی ماکۆی دابە یاوەرمعین السلطنه و ئێلخانیگەری عەشایریشی دا بە سولتان حەسەنخانی جەلیلوەند فەرماندەی نیزامی خۆیە. وادیارە بە دامەزرانی هێزەکانی ئەرتەشی لە ناوچەکانی سەرووی ڕۆژئاوای ئێران کە هاوکاتە لە گەڵ حکوومەتی ئەمیرتەهماسبی لە ئازەربایجان، پێکهەڵپرژانی سنووریش کەم دەبێتەوە. بۆ نموونەی ئەم هاوکارییە دەکرێ ئاماژە بۆ نامەیەکی باڵیۆزخانەی تورکیا بکرێ، کە لە بەفرانباری ١٩٢٥دا بۆ وەزارەتی دەرەوەی نووسیوە. لەم نامەیەدا باڵیۆزی تورکیا دەنووسێ:« حکوومەتی تورکیای دۆست ڕادەگەیێنێ کە بۆ پاراستنی هێمنی و ئاسایشی سنوورلەم دوییەدا فەرمانی پێویست دراوە بە مەعمورەکانی تورکیا...»(١٩)

وادێتە بەر چاو کە ئەو هێمنایەتییە نیسبییە، بەر لە وەی بەرهەمی جۆرە تێگەیشتنێک بێ زیاتر بەرهەمی کۆمەڵێک گیر و گرفتی خۆجێی و دەرەوە بوو، کە حکوومەتی تازە پێکهاتووی تورکیا لە گەڵیان پێوە ببوو. مستەفاکەماڵ پاشا لەو کاتەدا کە خەریکی قایمکردنی بناخەی حکوومەتی تازە بوو، لە بواری پێوەندی دەرەوەشدا لە گەڵ مەسەلەی کۆنفرانسی لۆزان و بەتایبەت مەسەلەی موسڵ پێوە ببوو.(٢٠) لەم قۆناخە تایبەتیەدا، واتە لە ساڵەکانی ٢٥ ـــ١٩٢٤ تورکیاهەوڵیداوە هەموو هێزەکانی لە سنووری موسڵ کۆبکاتەوە ولەم ڕێگایەوە کاربەدەستانی ئینگلیزی بۆلابردنی هێزەکانیان لە موسڵ بخاتە ژێرگوشارەوە. بەشێکی گرنگی ئەو هێزانە لە هۆزەکانی کورد پێکهاتبوون کە بەشێکیان لە وانە پێشتر بۆپشتیوانی لە ئارمانی تورکەکان لە سنووری ڕۆژئاوای ئێران چالاکیان هەبوو.(٢١) بەڵام ڕووداوێک هاتە پێش کە پێوەندی ئاسایی کورد و تورکی بە

جارێک گۆڕی. له گەڵ ڕاپەڕینی شێخ سەعید، ساڵی ١٩٢٥ که بوو بەهۆی سەرهەڵدانی بەربڵاوی کوردەکان و ئەنجامەکەشی سەرکوتکردنی به سامی ئەوان بوو، قەڵشتێکی ئەوتۆ کەوتە نێوان کار بەدەستانی تورک و هێزەکانی کورد که له مەو دوا کەلک وەرگرتن له هێزی عەشایری کوردی بۆ دەسەڵات نواندنی خۆجێی که یەکێک له کۆڵەکەی گرنگی ڕێبازی ناوچەیی تورکەکانی عوسمانی بوو، هەرگیز وەک خۆی لێ نەهاتەوە.

## سەر چاوه کان


1– G,A.BournoutianEastern Armenia in theLast de-. sades

ofPersisnRule,1807,18828.UndenaOublications,Malibu,California, 1982, pp71 –73

٢ – هنوزدرموردتأریخ وجغرافیای عشایه مناطق شمالغرب.آذربایجان بررسی جامعی صورت نگرفته است. برای آگاهی بیشتر بنگرید به ابراهیم اسکندری نیا، ساختار سازمان ایلات و شیوه معیشت عشایر آذربایجان غربی ارومیه انتشارات انزلی،١٣٦٦،ص ص٦٢ــــ٥٠.

٣– شێخ محمد مردوخ کردستانی، تاریخ کرد و کردستان وتوابع یا تاریخ مردوخ، سنندج، کتابفرۆشی غەریقی، ١٣٥١، ٢ ج،ج١، ص ص٨٦ــــ١١٤.

٤– واسیلی نیکیتین، کرد و کردستان،ترجمة محمد قاضی، تهران، انتشارات نیلوفر، ١٣٦٦ ص ٣٥٠.

٥– محمدد ڕەحیم نصرت ماکۆیی، تاریخ انقلاب ازەربایجان وخوانێن ماکۆ، چاپخانەعلمیه، قم، بی تا، ص ص ٢٤–٢١

MarkSykes, The Caliphs Last Heritage,Argi Oress,N,Y,1973,pp, 554–86.

٦ –نصرت ماكۆيی، پێشين، ل ٣-٤

٧ – دوكور آزەرمیدخت مشایخ فریدونی، مسایل مرزی ایران و عــــراق وتأسیری آن در مناسبات دو کشور تهران، انتشارات امیرکەبیر، ١٣٦٩ ، ل،٢٢١

٨ – برای ئاگاهی از فهرستی که ایران ارائه داد که عه شایر میلان، جه لالي و حه یدەرانلونیزدربر دارد بنگرید

Extracts from Correspondence Relative to the Turco –persian Boundary Relations 1843 _45, 2Parts, part 1,00910275,p,51

٩ – گزیدەی اسنادسیاسی ایران وعثمانی. واحدنشر اسناد دفتر مطالعات سیاسی وبین المللی. تهران، ١٣٦٩، ج٢. ص ١١٦

١٠ – گزیده اسناد سیاسي ایران وعثماني، ج٤ . ١٣٧٠ ص ص ٨٣–٢٨٠

١١ – مشایخ فریدونی، پێشو، ص ص ٢٢٨

١٢ – برای ئاگاهی بیشتر ازاین همکاری بنگرید به کاوقیباتەتبانی شوروي وتورکیا، فروپاشی جمهوری تازقربایجان١٩٢٠، مجله نگاهنوشمارة١٠مهروابان ١٣٧١، ص ص ١٤٩ــــ١٣١

١٣ – سوادراپورتی کەبەوزارت امورخارجه فرستاده شده، ٦اوریل ١٩٢٢(فـــــروردین ١٣٠١) Ambassade Extraordinaire de pre- 0 seNo 2

ارشیو موسسه مطالعات وپژوهشهای فرهنگی

١٤ – مهدی اعتماد مقدم. یادی ازگذشته، چاپ ایران. تجریش ١٣٥٤، ص ص ٩٧ –٥٩٥

١٥ – وزارت امورخارجه سواد یادداشت سفارت عثمانی نمره ٢٠٢ سلخ رجب ١٣٤١ اسناد ملی

١٦ – وزارت امورخارجه، سوادمراسله سفارت عثمانی، نمره ٢٦٨/٤١، مورخه ٤ رمضان ١٣٤١(٣١ فرومردین ١٣٠٢) اسناد ملی، ک (٢)٥٧٧٠.

١٧ – وزارت امورخارجه،اداره دوم سیاسیسواد مشروحه اقای

معتمدالوزاره،نمره ۱۹۹مورخه ۱۱به‌ج جوزا۱۳۰۲،اسنادملی،ک(۲)،۸۰۹۹۰
۱۸ - وزارت امورخارجه اداره‌ی دوم سیاسی سوادراپورت اقای معتمدالوزاره، نمره ۲۲٤سرطان ۱۳۰۲،اسنادملی،ک(۲)۵۷۷۰
۱۹ - ریاست وزرا ورقه تلگرافی،استخراج رمز تبریز، شماره ٤۲۵ جوزا ۱۳۰٤، موسسه مطالعات، ۱۲۲۹۲
۲۰ - ایالت نظامی ازربایجان، نمره۵۲٤۳،به‌تاریخ برج سنبله ۱۳۰۲، اسنادملی،ک(۲) ۵۷۷۰
۲۱ - رۆژنامه‌ی ستاره‌ی ئیران، ۱٦ عقرب ۱۳۰۲

## بەشی سێیەم

# دۆستایەتی دژوار

لە بەشی دووەمی ئەم توێژینەوەدا، پاش چاو گێرانێکی سەرپێیی بە ڕەوتی دژوارییەکانی مێژوویی سنووری ئێران وعوسمانی لە سنووری سەرووی ڕۆژئاوای ئێران، واتە کێشەی هۆزەکانی سەر سنوور و ناکۆکی دەوڵەتەکان لە سەرخاوەن ملکیەتی هێندێ بەشی ناوچەکانی سنوور و درێژەی کەم و زیادی ئەو مەسەلەیە لە ساڵەکانی هەوەڵی بزووتنەوەی کەمالیستەکانی تورکیا، ئاماژە بۆ دەستپێکی دەورەیەکی کورتی هێمنایەتی پێوەندی سیاسی و سنووریی دوو وڵاتەکە کرا. هێمنایەتیەکی کە زیاترلە گیر و گرفتی گرنگتری خۆ جێیی و دەرەوی تورکیا سەرچاوەی دەگرت، تاجۆرە ڕێککەوتنێکی ڕوناکی نێوان ئێران و تورکیا. لە گەڵ ئەوەش لەم ماوەیەدا بۆ جۆرە ڕێککەوتنێک هێندێ هەنگاو هاوێژرابوون کە گرنگترین بەرهەمی ئەو هەنگاوانە پەیمانی(دۆستایەتی و ئەمنیەت) ی ئێران و تورکیابوو کە لە ٢٢ی ئەپریلی ١٩٢٦ لە لایەن محەممەدعەلی فروغی سەرەک وەزیری وەختی ئێران و مەمدوح شەوکەت بەگ بالیۆزی تورکیا واژۆ کرا.(١) نصرالله‌انتظام کە وەک نووسەری دەستەی نوێنەرایەتی ئێران لەم ئامەنگەدا بەشداربوو، لە بیرەوەرییەکانیدا باسی نەخشی کاریگەری مەمدوح شەوکەت بەگ دەکات، لە واژۆ کردنی ئەم پەیمانەدا. بەرلە دانانی ئەو لە باڵیۆزخانەی تورکیا، محێدین بەگ کە عەسکەرێکی ناقوڵا بوو، بۆپاشبوونی پێوەندیی دوو وڵات تێ نەدە کۆشا. بەڵام بە دانانی مەمدوح شەوکەت بەگ لەم بارەوە پێشکەوتن هاتە دەست.

لە گەرتی ٥وەای ئەم پەیمانەدا کە پێشنووسەکەی بە خەتی تەیمورتاش نووسرابوو، بۆپێشگری لە پێکهاتن و ڕاگرتنی دەستەکانی نەیار لە خاکی دوو

دەوڵەت هەر وەها هاوکاری ئەوان بۆ پێشگری لە خلافکاری و کردەوەی تایفەکانی دانیشتووی دەور و بەری ناوچەکانی سنوور، هێندێ ئەرک و بەڵێنی لە بەر چاو گیرابوون.(۲)

دوای ماوەیەک لە۲۱ی بانەمەردا، کە هێشتا ئەم پەیمانە بە یەکجاری پەسند نەکرابوو، وەزارەتی نێو خۆ لە ئاگادارییەکدا بە تەواوی کار بە دەستانی حکوومەتی ئازەربایجان و خەمسە و گیلان ونوستراباد و مازندەران و قەزوین و محالی سەلاسەی تونکابن ڕاگەیاند کە بە فەرمانی موبارەک، ڕوونووسی ئەم پەیمانە لە ژێرموتالا دایە، بە تەواوی وریابن کە مەعمورەکانی دەوڵەت بەپێچەوانەی ئەو هەنگاو هەڵنەهێنن.(*)

لە ڕاستیدا ڕاگەیاندنی ئەم ئاگادارییە زۆر بە جێ بوو. چونکە بە شکانی ڕاپەڕینی شێخ سەعید زۆر لە کوردەکانی لایەنگری ئەو ڕایانکردبوە ئێران و مەسەلەی کۆنی پەنا بەری عەشایری هەرتک لا دوو بارە زیندوو کرایەوە و بە کەمبوونەوەی گیر و گرفتی خۆجێیی ئانکارا، دەورەیەکی تازە لە نائارامی سەر سنووری تورکیا دەستپێکرا. لە ئاخری هاوینی ۱۹۲۵ درێژەی لێدانی کوردەکان گەیشتە سنووری ڕۆژئاوای ئێران. کاتێ کە کوردەکان دەیانویست لە ڕێگای ئاواجیقەوە بێنە نێوخاکی ئێران، تەقەلای سوڵتان عیزەتولاخانی فەرماندەی پاسگای سنووری ئێران بۆ چەک کردنیان، تووشی هێندێ پێکهەڵپڕژانی

---

*- دەقی ئەم پەیمانە کە ڕاست بۆ دژایەتی و سەرکوتکردنی کوردەکان گرێدراوە و بەڵام ناوی ناهێنن بەم جۆرەیە:«... ئەم دوو دەوڵەتە هیچ کارێکی دژی یەکتری ناکەن. هیچ پەیمان و قەرارداێکی نیزامی و سیاسی و ئابووری نە بەستن کە بە زیانی ئەویتریان بێ. لە کاتی پەلاماری نیزامی بۆ سەر یەک لەم دوو دەوڵەتە ئەویتر بێلایەنی خۆی بپارێزێت. ڕێگا نادەن لە خاکی یەک لەم وڵاتەوە چالاکی دوژمنانە دژی وڵاتەکەی تر بکرێ. هیچ یەک لەم دوو وڵاتە ڕێگانادەن بە تێکۆشان و چالاکی هیچ دەستە و ڕێکخراوەیەک کە لە خاکی ئەوانەوە دژی یەک لەم وڵاتانە بەڕێوە بچێت. هەر وەها دژی ئەمجۆرە هەڵسوورانەی عەشیرەتەکانی سەرسنوور بە توندی هەنگاو دەنێن » بڕوانە کەریمی حسامی، پێداچوونەوە، بەرگی یەکەم، لاپەرە

توندبوو.(٤) لە گەڵ ئەوەش ژمارەی ئەوانەی دەیانویست پەنا بۆ ئێران بێن ڕوو لە زیادی بوو.

لە ئاخری بانە مەڕی ١٣٠٥کارگوزاری ورمێ لە ڕاپۆرتێکدا لە گەڵ خەبەری هاتنی ژمارەیەک پەنابەری کورد بۆناوچەی قەتور، باسی دەستەیەکی دیکە دەکات کە دەیانەوێ بێنە ئێران. فەرماندەکانی نیزامی سەڵماس و ورمێ نازانن کە پەنابەریی ئەوانە لە گەڵ کەرتی پێنجەمی پەیمانی دۆستایەتی دێتەوە یان نا؟(٥) وەڵامی سەرۆک وەزیر ئەوە بوو: « کە ئەگەر ئەوانەی تازە دێن چەک بکرێن و دوور لە سنوور ڕابگیرێن و نەهێڵن کاری نابەجێ بکەن، لە گەڵ بەندی پێنجەمی پەیمانی ناوبراو ناکۆکی نیە »(٦) وردە وردە ژمارەیەکی بەرچاو لە کوردەکانی ئەو دیوی سنوور لە ئێران بوونە پەنابەر، لە وانە تایفەی عروس وتاکوری و جبران لە ناوچەکانی ماکۆ، بەشێک لە تایفەی تیلدن و سقری و شمسک لە قەتور وتایفەی بۆتان و هیتریش لە چاریە و شپیران لە کن سمکۆ جێگیر بوون. (٧)

هەوەڵین مەسەلە کە بۆ هەڵسەنگاندنی نرخی ڕاستەقینەی پەیمانی (دۆستایەتی و ئەمنیەت )ی ئێران و تورکیا، هاتە پێش، مەسەلەی عەشیرەتەکانی ناوچە بوو. چ مەسەلەی پەنابەریی ڕاکردوەکانی بزووتنەوەی شکاوی شێخ سعید وچ مەسەلەی سەربزێوی سەرلە نوێی سمکۆ، موشتەری قەدیمی تورکەکان و هەڵوێستیان لە بەرانبەر ئەودا. بەشی هەوەڵی ئەم مەسەلەیە، واتە چۆنیەتی دامەزراندنی عەشایری پەنابەر بەبێ دژواری چارە سەرکرابوو. ئێستا دەماوە مەسەلەی پاراستن و درێژە پێدانی هێمنایەتی مەوجود. بەڵام بار و دۆخی وڵات بە گشتی و، وەزعی ئازەربایجان بە تایبەتی، لەو ڕۆژانەدا، جۆرێک نەبوو کە پاراستن ودرێژەپێدانی هێمنایەتی هاسان بکات.

## زەمینەی خۆجێیی قەیران

لە ڕاستیدا ئێران لەو ڕۆژانەدا دەورەیەکی قەیرانی تاقی دەکردەوە. مەسەلەی گۆڕینی پاشایەتی هەرچۆنێک بێ کارێکی دژواربوو. بەشێکی گرنگ لە هێزە

پێشکەوتنخوازەکان هیوایان بە جۆرە کۆمارێک بوو. لە بەرانبەردا بەشێکی بەرچاوی هێزەکانی سوننەتی و خۆپارێز لە درێژە پێدانی پاشایەتی قاجار ئیرادێکیان نە دەبینی، هەردووکیشیان لەو کارە نارازی بوون. لە باری ئابووریشەوە بەسترانەوەی بەشەکانی گرنگی ئێران بە بازرگانی سۆڤێتەوە و ئەم دژواریانەی لە ڕێکوپێک کردنی پێوەندییەکانی تازەی بازرگانی هاتبوە پێش، یەک لە مەسەلەکانی ڕۆژ بوو. ئازەربایجان یەکێ لەو خاڵە گرنگانە بوو کە هەم لە باری زۆری هێزەکانی پێشکەوتوو خواز و هەم زۆری خەڵکی کۆنە پەرست، و لە ڕوانگەی سیاسی و هەم لەبواری ئابووری و بەر بڵاوی پێوەندی بازرگانی لە گەل سۆڤێتئامادەیی و زەمینەی پەیدا بوونی قەیرانی هەبوو.

لە هەوەلی پوشپەری ئەو ساڵەدا، بە ڕاپەرینی سەربازانی پادگانی سەلماس، هەوەڵین نیشانەی ئاشکرای ئەم قەیرانە گشتییە خۆی نواند. هەرچەند بە لابردنی محەمەد حوسێنخانی ئایروم لە فەرماندەیی لەشکری سەرووی ڕۆژئاوا و دانانی ئەمیرلەشکرئەحمەدی لە جێگای ئەو، ڕاپەرینی سەربازان سەرکوتکرا و بۆ ئەزمی گشتی ناوچە هەنگاوی بەربڵاو هاوێژران، بەلام قەیرانێکی ئەم مەڵبەندەی داگرتبوو، لە نارەزایی نیزامی زۆر زیاتر بوو.

شەریفودەولەی بەنی ئادەم والی ئازەربایجان لە ئاخری گەلاوێژی ١٣٠٥ لە ڕاپۆرتێکدا لە بارەی بار و دۆخی گشتی ئازەربایجانەوە دە نووسێ :«...سەبارەت بە بەسترانی ڕێگای بازرگانی هەژاری گشتی، بێکاری خەڵکێکی زۆر، بێزاری لە دادگە وهۆکاری دیکە، زۆری مردنی گاو وگۆل لە دەور و بەر، لە سەریەک باش نیە. تەبلیغاتچیەکانی بێگانە و ئاژاوە چیەکانی هەلپەرستیش ئاگری فەساد خۆش دەکەن. ناوبراو لە درێژەی ڕاپۆرتەکەیدا نووسی :«... منیش بە گوێرەی توانا بۆپێشگری لە ئاگری فەساد وئامۆژگاری پێویست و بە کارهێنانی نفوزی ئەخلاقی دریخی ناکەم. بەلام کاتی ئەوە هاتوە کە کاربە دەستانی دەوڵەت بۆ کار و باری ئابووری و نەهێشتنی کەم و کوڕی مەسەلەکانی دیکەی ئەم ئەیالەتە گرنگە هەنگاوێکی بنچینەیی باوێژن.

خاڵێکی هەرە گرنگ کە ناو براو لە ڕیزی مەسەلەکانی ناوچەدا باسی نەکرد بوو، مەسەلەی عەشایر، بە تایبەت کوردەکانی ئازەربایجان بوو. ئەو مەسەلەیە هەرئەو دەم سەرنجی نصروڵا بهنام، کارگوزاری دەوڵەتیی لە ورمێ ڕاکێشا و بوو بە مەسەلەی ڕاپۆرتێکی ئەو بۆ وەزارەتی دەرەوە. ناوبراولە بانەمەری ١٣٠٥، دوای ئامـاژە بۆشـەڕەکـانی دوایی لە کـوردسـتـانی تورکـیـا و سـەرکـوتکردنی توندی کـوردەکـان، نووسی:«...چونکە دەوڵەتی تورکـیـا سـەبارەت بە وەزعی خـۆی لە کوردەکان ناهومێد بوو، بە باشیش تێگەیشت کە ئێستا کوردەکان ڕوویان لە دەوڵەتی ئێرانە، مەعمورەکانی تورکیا کەوتنە کار تاهەر چۆنێک بێ دەوڵەتی ئێرانیش هەر ئاوا لە گەڵ کوردەکان بجوڵێتەوە تا لەم بارەوە خەیاڵی ئەوان ئاسودەبێ ولە پێشکەوتنی سیاسەتی دەوڵەتی ئێرانیش سەبارەت بە کوردەکان پێشگری بکرێ...» ناوبراو پێشبینی کرد کە ئێستا تورکەکان تێدەکۆشن:«...هەر چۆنێک بێ دەوڵەتی ئێرانیش لە گەڵ چەک کردنی کوردەکان موافەقەت بکا. ئەگەر لەم کارە ناهومێدبن، مەعمورەکانی تورکیا دەست دەکەن بە هاندانی کوردەکان کە ئاژاوە بنێنەوە و دەوڵەتیش ناچاربێ لێیان بدات.» ناوبراو بە سەرنجدانی سەفەری جۆربە جۆری حسامەدین بەگ وابەستەی نیزامی تورک بۆ ناوچە جیاوازەکانی مەڵبەند و هاتوچۆی دەستەیەک لە کوردەکانی تورکیا بە ناوی ڕاکردوو بۆ کن سمایلاغا، زەمینەی سەرهەڵدانی جموجۆڵی باسکراوی ناسیبوو.(٨) بەڵام بەرلەوەی باسی مەسەلەی سمکۆ، و تەئسیری ناله باری ڕاپەڕینی ئەو لە سەر پێوەندی دووولات بکەین، جێی خۆیەتی دوو هۆکاری دیکەش کە کاریان کردۆتە سەر ئاڵۆزی ناوچە، باس بکەین. یەکەمیان مەسەلەی زیندوو بوونەوەی بزووتنەوەی پانتورکیسمتی لە ناوچە و ئەویتریشیان تەقەلای سەرلە نوێی تورکەکان بۆ ئیدیعای ئەرزی خۆیان لە سەرناوچەکانی سنووری ئێران.

## هۆیەکانی دەرەوی قەیران

پان تورکیزم کە لە ساڵەکانی ئاخری شەڕدا ببوە ڕێبازی سەرەکی تورکەکان و

له پەرەپێدانی قۆناخی کۆتایی شەڕدا بەرە و ئێران و قەفقاز دەورێکی سەرەکی هەبوو، لە گەڵ شکانی عوسمانیەکان لە شەڕی یەکەمی دنیاگردا، بۆ ماوەیک لە باوکەوت. لە ڕاستیدا زۆر لە تورکان —بە تایبەت لایەنگرانی مستەفاکەماڵ پاشا -گەیشتبوونە ئەم نەتیجەیە کە ئەو بەڵاو موسیبەتەی هاتۆتە پێش، جگە لە بەرهەمی سیاسەتی پان تورکیستی سەردەمی شەڕ شتێکی دیکەنیە. بۆیە لە سەردەمی شەڕی سەربەخۆیی و تەقەلای کەمالیستەکان بۆ پتەوکردنی دەسەڵاتی خۆیان، واتە هەرئەو سەردەمە کە ئێرانیش هیوای بە دارشتنی بناخەیەکی تازە هەبوو لە پێوەندی ئێران و تورکیادا، بزووتنەوەی پێشووی پان تورکیستی نیشانێکی وای نەمابوو. بەڵام بە نەمانی قەیرانی سیاسی و سەقامگرتوویی ڕێژیمی تازە، هێندێ لە دەستە پان تورکیستەکان سەر لە نوێ کەوتنەوە خۆ. لە ١٩٢٤دا تەشکیلاتی تورک ئوجاقی کە کۆلەکەی گرنگی ئەم بزووتنەوەیە بوو، دوای چەند ساڵ وێستان کەوتەوە کار. لە پەنا ئەویشدا هێندێ دەستەی پاشماوەی حیزبی مساوات لە باکۆ و دەور و بەر کە خۆیان خزاند بوە تورکیا، سەرلە نوێ دەستیان پێکردەوە.(٩)توندبوونی تاقمەکانی پان تورکیستی کە ئێستا بە گوێرەی پێویست پترکولتوری بوو، بە خێرایی ئاکامی کردەوەی خۆی نیشاندا. وەک دەزانین قورسایی گرنگی ئەو تێکۆشانە کەوتبوە سەر زمانی فارسی لە ئازەربایجان وتورکی جێی ئەوبگرێتەوە. سەرنجدەرەکان لەم بزووتنەوەیە ئاگاداربوون و دەیانویست بۆ بەربەرەکانی لە گەڵ ئەو تەگبیری پێویست بکرێ. لە ڕاپۆرتێکدا کە لەو ڕۆژانەدا بۆ وەزارەتی دەرەوە ناردرابوو، لە گەل پێداگرتن لە سەر پاراستن و پەرەپێدانی زمانی فارسی لە ئازەربایجان، داواکرابوو کە تێکۆشان و تەشکیلاتی کومیتەکانی تورک ئوجاقی لە ئێران و بڵاو کردنەوەی ڕۆژنامەی عوسمانی و قەفقازی کە هەستی تورکایەتی دەهارووژێنن، لە ئێراندا قەدەغە بکرێن.» (١٠) بە گوێرەی ڕاپۆرتێکی دیکەی کە بۆ تاران ناردرا،ناوەندی ئەم تەبلیغاتە کونسولخانەی تورکیا بوو لە ورمێ. « سەرنجێکی کورت لە تەشکیلاتی گەورەی ئەوان لە ورمێ و زۆری ئەندامانی کونسولگەری و پتشکەوتنی

ڕوتبەی کۆنسولی ورمێ لە هی تەوریز کە ناوەندی ئەیالەتە و تەبلیغاتی بەر دەوام کە بۆ یەکێتی تورک زمانان دەکرێ و ئیعتبارێکی کە بۆ پروپاگاندەی ئەو مەسەلەیە دەدرێ بە کۆنسولی تورکیا، باشترین شاهید و پشت ڕاستکەری ئەم ئیدیعایەن. لە تالاری میوانداری کۆنسولخانە و لە سەر دەرگای ئاپارتمانەکە بە خەتی ڕوون و ئاشکرا نووسراوە:« تورک زمانەکانی زەوی یەک بگرن.» ئەگەر کابرایەکی بێگانە بێتە ورمێ، کۆنسولخانەی تورکیا بە ناوەندی هێز و دەسەڵات دەزانێ.»(١١)

مەسەلەیەکی ترکە بوو بە هۆی زیادکردنی ناکۆکی ئێران و تورکیا، تازە کردنەوەی ئیدیعای تازە تورکان بوولە ناوچەکانی سنووری ئێران کە لە قۆناخەکانی پێشوشدا باسیان کراوە. لە ڕاستیدا هەر وەک کارگوزاری ورمێ لە هەوەڵی خەرمانانی ئەو ساڵەدا بۆ وەزارەتی دەرەوەی نووسیبوو:«... سەرەڕای بەستنی پەیمانی ناوبراو لە کار و کردەوەی مەعمورەکانی دەوڵەتی تورکیا دەردەکەوێ کە بیر و بۆچونی ئەوان گۆڕانی بە سەردا نەهاتوە و بەستنی پەیمانە کەشیان کردۆتە ئامرازی ئەنجامی ئامانجی قەدیمی خۆیان. چونکە سەر لە نوێ مەسەلەی دیاریکردنی سنوور، کە کومیسیۆنی تێکەڵ دیاری کردوە، دێننەوە گۆڕێ و بە جۆرێک دەری دەبڕن کە دیاریکردنی پێشوویان قبوڵ نیە...» لە بەرئەوە جگە لە وەی بەشێکی ناوچەی دراوسێی سوماو برادۆستیان لە بەر دەست دایە، داوای(قازلی گۆل و قولاغ بولاغباشی(لە سنوری ماکۆ) درێژە پێدەدەن. تەواوی بیر و ڕاشیان هەڵوەشاندنەوەی دیاریکردنی سنووری پێشوە. ئەگەر بێتو ئەم سێ خاڵە بە قازانجی ئەوان تەواو بێ، ورده ورده داواکاری خۆیان درێژە پێدەدەن تائەو کاتەی سیاسەتی خەرابی کۆنی خۆیان سەبارەت بەم سنوورە دەبەنە سەر.(١٢)

بەمجۆرە هەر وەک چاوەڕوان دەکرا و کارگوزاری ورمێ -ش پێشتر ڕایگەیاند بوو، جمو جوڵی سمکۆ ڕۆژ بە ڕۆژ دڵەڕاوکەی زیاتر دەکرد. هەڵوێستی تورکەکانیش لەم بوارەدا، گرنگی بنچینەیی هەبوو. لە ئاخری خەرمانای ئەو ساڵە دەرکەوت، سمکۆ کەپاش نیزیکەی ساڵێک ئەمین ببۆوە، و خەریکی گوزەرانی خۆی بوو، سەرلە نوی خەیاڵی بەربەرەکانی هەیە. لە ڕاستیدا بار و دۆخی عەشایری

سنووری ڕۆژئاوای ئێران بە گشتی ئاڵۆز بوو. زۆربەی هێزەکانی عەشایری ئەم ناوچەیە، کورد یا شاسەیوان و یا تایفەکانی دیکە لە ئاڵۆزی دابوون. هێندێ لەو بزووتنەوانە وەک هێرشی پشدەرییەکان بۆ سەردەشت ڕاستەو خۆ پێوەندیان بە ڕەوەندی گۆڕانی پاشایەتی و تەقەلای سالاردولە بۆ گێڕانەوەی تاج و تەختی قاجارە وە هەبوو. هێندێکیشیان هەر بزووتنەوەی نارەزایی بوون. هەرای سمکۆش کە لە کۆنەوە لە چوارچێوەی پێوەندی ئێران و عوسمانیدا گرنگی تایبەتی هەبوو، تێکەڵێک بوو لە هەلپەرستی و نارەزایی.

باڵیۆزی تورکیا پێشنیاری کرد بوو کە هێزەکانی تورک و ئێرانی لە سەر کوتکردنی کوردەکاندا پێکەوە هاوکاری بکەن. لەشکری سەرووی ڕۆژئاوای ئێران لە گەمارۆ دان و قەلاچۆکردنی کوردەکانی ئارارات یارمەتی تورکان بکات. تورکەکانیش لە بەرانبەر ئەوەدا لە سۆماو برادۆست بۆ سەرکوتکردنی سمکۆ یارمەتی هێزەکانی ئێرانی بدەن. بەڵام ئەمیرئەحمەدی بە سەرنجدانی پێوەندی کۆنی سمکۆ لە گەڵ تورکان و ڕاپۆرتی گەیشتوولە بارەی پێوەندی نیزیکی سولەیمان سەبری، سنووردارى تورکیا لە گەڵ سمکۆ، دەرمتانی هاوکاری دوو دەوڵەتی بە مەرجێک دەبەستەوە. ئەوترسی ئەوەی هەبوو:« کە ئەگەرلە سەرەست نەبین و ڕێگا بکەینەوە، لە وانەیە لە بنەوە لە گەڵ سمکۆ ڕێک کەون و لە جەنگەی شەڕدا لە جیاتی سەرکوتکردن هاوکاری بکەن و پێکەوە بە گژلەشکری ئازەربایجاندا بێن و تا شاری تەورێز بچنەپێش.»(١٣)

تورکەکان پێشنیاریان کرد بوو، کە ئەوان بە عەمەلیاتێکی هاو ئاهەنگ لەو دیوی سنوور، و ئێرانیەکانیش لە مدیوی سنوور هێزە سەرەهەڵداوەکانی کورد پەلامار بدەن. بەڵام ئەمیرئەحمەدی پێشنیاری کرد کە ئێران تیپێکی سوار دەنێرێتە ئەو دیوی سنوور، تالە گەڵ هێزەکانی تورک سمکۆ پەلامار بدەن، تورکەکانیش تیپێکی پیادە بنێرنە ئەمدیوی ئێران، تالە گەڵ هێزەکانی ئێرانی، بەشی ڕۆژهەڵاتی ئارارات گەمارۆ بدەن. بەڵام لە بەرئەوەی مەسەلەکە تەنیا بە سەرکوتکردنی ئەشڕار(مەبەستی کوردەکانە ح )تەنگە بەرنەدەکرا، تورکەکان

قبوڵیان نەکرد.(١٤)
کاتێکی لە ئاخری ڕەزبەری ئەو ساڵە دا، ئەمیرئەحمەدی لە گەڵ هێزێکی سوار بە فەرماندەیی مەحمودخانی ئەمین و سێ فرۆکەی نیزامی و دەستەیەک چەکداری کورد(ئەمەرخانی شکاک) و شاسەیوان، سمکۆیان پەلاماردا و تورکەکان ڕێگای هەڵاتنیان بۆکردەوە، گومان و دردۆنگی کار بەدەستانی ئێرانی سەبارەت بە ناراستی تورکان وەراست گەڕا.(١٥)

## دوڵەتە بچوکەکانی بەرەگەز ئێرانی

دوکتورمەحمودی ئەفشار لە بانەمەری ١٣٠٥(١٩٢٦) لە وتارێکدا لە بارەی نرخی ڕاستەقینەی پەیمانی(دۆستایەتی و ئەمنیەت)لە گەڵ دەربڕینی سەر سوڕمانی لە « دەرخستنی شادمانی» ڕۆژنامەکانی تاران سەبارەت بە بەستنی ئەوپەیمانە نووسی:«... ئەگەرلە کاتی بەستنی پەیمانی دۆستایەتیدا، دەربڕینی وشەی دۆستانە بۆ بە هێزبوونی سیاسەتی حکومەت باشە و گوناهی نیە، فریودانی میللەت لە ڕێگای دەربڕین و شاردنەوەی ڕاستی و هێندێ(درۆی تێکەڵ بە مەسلەحەت) بە حەرام دەزانم. (*).. بەڵام بە داخەوە ئەوەری دنیای ئیمرۆ جۆرێکە کە دەتوانن درۆی( بەمەسلەحەت بڵێن) بەڵام ڕاستی( فێتنە هالایسێن)

---

*-(درۆی مەسلەحەت ئامیز) !! وەک ئێستا لە سەردەمی ڕادیۆ و تەلەفیزیۆن و فاکس و ئینترنێت دا، هێندێ ڕێبەری حیزبە کوردییەکان ئەندامیان دەگێڕن، چەک دەکرێن، دەدرێتەوە بەحکومەتی کۆنەپەرستی خوێنڕێژ، بەڵام گۆیا لە بەر (مەسلەحەت) باسیان ناکەن و ڕاستی لە خەڵک دەشێرنەوە و میللەت بدرۆ فریودەدەن و هەمووشی گۆیا بە خاتری (مەسلەحەتە)!! بەو درۆ گۆیا مەسلەحەتیانە ئەندامانی حیزبەکەیان لە سەرلێ شێواوی و بێخەبەری دارادەگرن و مێشکیان لە قالب دەدەن و بەم « درۆ مەسلەحەتی یانە» ناوی پاک بە تاوانباردا دەکەن. فریو دانی( مەسلەحەتی!!)

ناتوانن دەر ببڕن . ڕاستی ئەک هێندەش (فیتنە هەڵایسێن) ئەوەیە ئەم پەیمانە پێشی هیچ مەترسیەکی نەگرتوە کە لە لایەن ڕۆژئاواوە هەرەشە لە ئێران دەکا. هیچ دەردێکی پێوەندی نێوان ئێران وعوسمانی دەرمان نەکردوە. پێوەندیی باشی ئێران وعوسمانی کاتێ وەراست دەگەڕێ کە عوسمانیەکان دەست لە داوای بەشێک لە ولاتی ئێمە هەڵبگرن. ئەوەش سەرناگرێ مەگەر بە وازهێنان لە تەبلیغات وبڵاوکراوەکانی تورانیەت.»(١٦)

دکتورئەفشارلە سەرمەیلی پەرەخوازی تورکەکان، واتە پان تورکیزم و کردەوەی ئەوان لە سەرووی ڕۆژئاوای ئێران پێی دادەگرت. مەسەلەیەک کە باس و لێکۆلینەوەی ئەو، بتەوی و ئەتەوێ هێندێ هۆکاری بەربڵاوتری ناوچەیی ولە وانە مەسەلەی کوردیشی دەهێناگۆڕێ. دوکتور مەحمودی ئەفشار لە وتارێکی دیکەداکە ماوەیەک پێش بەستنی پەیمانی ئاویراو، لە پوشپەری ١٣٠٤ لە بارەی ڕاپەرینی کوردەکانی عوسمانییەوە نووسیبووی، وەبیری خستەوە، ئەگەر لە بواری پێکهێنانی پێوەندییەکانی کولتوری و ئابووری ناوچە کورد نشینەکانی ئێران و نێو ولات دا تێکۆشانێکی بەربڵاو ئەنجام بدرێ:«...ئەو دەم بۆ ئێمە هیچ زیانی نابێ ئەگەر ڕۆژێک کوردستانی عوسمانی سەر بەخۆ بێ و لە نێوانی ئێمە و دەوڵەتی تورک دا، دەوڵەتێکی بچوکی بە ڕەگەزئێرانی لەو سنووره لە پەینماندا بێ. هەروەک پێکهاتنی دەوڵەتی ئەرمەنستان لە سەرووی ڕۆژئاوای ئێمە کە کۆنگرەی ئاشتی پاریس لە بەرچاوی دەگرت ئێمەی بە جارێک لە عوسمانی جیا دەکردەوە و تاڕادەیەک لە مەترسی زەرد ئاسودەی دەکردین. (١٧)

بێجگە لە دوکتورمەحمودی ئەفشار چەندکەس لە کاربەدەستای دەوڵەتیش کە سەبارەت بە هەڵکەوتی کاریان لە ئاڵوگۆڕەکانی سنووری ولات ئاگادار بوون و ئەزموونیان هەبوو، لەم بارەوە بیر و ڕایەکی ئەو تۆیان دەربڕیبوو. لە بارەی مەسەلەی تازە بوونەوی تێکۆشانی سمکۆ و هێنانە گۆڕی تازەی داوای ئەرزی تورکەکان، ئاماژە بۆ ڕاپۆرتی ئەسرولابەهنام کارگوزاری ورمێ کرا. جگە لەوە ئاویراو لە ڕوو داوەکانی دوایی تورکیە و سەر کوتکردنی کوردەکان، نیشانەی لە

ئاڵوگۆڕێکی بنچینەیی و دەرمەتانی هەڵوێستێکی تازەی ئێرانی هاتە بەر چاو، و نووسی:« پاش ئەوکارەی تورک لە گەڵ کوردانیان کرد، شێخەکانی ئەوانیان لە داردا و بە گوێرەی وتەی خودی کوردەکان، تورک سەبارەت بە بنچینەی ئایینی ئیسلامیش لالوت بوون، بە جارێک لە دەوڵەتی تورکیا ناهومێد بوون و هەموو کات لە دەرفەت دەگەڕێن تۆڵە بستێننەوە...» لە بەر ئەوە ناویراو وریایی دا لە ئاست تەقەلای تورکەکان بۆئەوەی کە هەر چۆنێک بێ دەوڵەتی ئێرانیش هەروالە گەڵ کوردەکان بجولێتەوە کە لەم بارەوە خەیاڵیان ئاسودەبێ و پێشکەوتنی دەوڵەتی ئێران سەبارەت بە کوردەکان پێشی بگیرێ.(١٨)

یەکێ دیکە لەو کەسانەی کە سەبارەت بە ئەزموونی زۆری لە کار و باری سنووری ئێران و عوسمانی لەم بارەوە بیر و ڕای تازەی دەربڕی، میرزا نەسروڵاخانی خەلعەتبەری(اعتلاالملک)بوو کە ئەو دەم حکوومەتی کوردستانی( **کوردستان مەبەستی سنەیەک. ح** )بە دەستەوە بوو. ناویراو لە ڕاپۆرتێکی درێژدا کە لە پوشپەڕی ١٣٠٥ لە سنەوە بۆ تارانی نارد، پاش ئاماژە بۆ مێژو وجوغرافیایی کوردستان، لە گەڵ پێداگرتن لە سەر کولتور و ڕەگەزی ئێرانیی کوردەکان بار و دۆخی نێونەتەوەیی ناوچەو هەڵوێستی دەسەڵاتە جۆر بە جۆرەکانی لە بەرانبەر ئەو مەسەلەیەدا، ڕوونکردەوە. بەشی سەرەکی ئەم ڕاپۆرتە بۆپێشنیارەکانی جیاواز تەرخانکراوە کە بۆ چاک کردنی کار و باری ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتوری کوردەکان بە پێویست دەزانی. چونکە ئەو لە سەرئەو باوەڕە بوو کە:«... بێگومان ئەگەر ئەم وەزعەی ناهومێدی بەر دەوام بمێنێ، لە کاتی خۆیدا لە گەل دەنگێکی بچوک دەبنە هاو ئاواز. بە حوکمی سیاسەت لە گەڵ ویلایەتێکی ئەوا(**مەبەستی کوردستانە ح**)دەبێ بە مودارا ڕەفتار بکرێ و ئەوان حاڵی بکرێن کە ڕەگەزی کورد ئێرانییە و خوێنی ئەوان خوێنی ئێرانییە و ئەوان لە خاکی ئێران دادەنیشن و دەوڵەت بۆ ئاسایشی حاڵ و وەزعی ئەوان لە هیچ کات و شوێنێکدا درێخی ناکات..» ئەگەر دەوڵەت لە ئیسلاحاتێکی ئاوادا سەربکەوێ، جگە لە وەی لەنبەرێکی توند لە بەرانبەر پروپاگاندەی ئەم وڵاتەدا دەکێشرێ ، سەرنجی

کوردەکانی نێوچۆمانیش(بین النهرین)بۆلای خۆی رادەکێشێ.»(١٩)

له ڕاستیدا وا دێته بەر چاو کە لانی کەم هێندێ لە خاوەن ڕایانی بەرپرسانی وڵات، بە سەرنجدانی گۆڕانکارییەکانی دوایی مەسەلەی کوردیان نەک هەر بە نوختەیەکی لاواز نە دەزانی، بەڵکوو بە دووریشیان نە دەزانی کە دەرمتانی ئەوە هەیەببێتە نوختەی دەسەلاتێکی ناوچەیی. چارەنووسی ئەم بیرو ڕایە، وئەسڵەن خودی کوردەکانیش لە ڕەوەندی گۆڕانکارییەکانی دوایی سنوورەکانی سەرووی ڕۆژئاوای وڵات، مەسەلەیەکە لە بەشەکانی دواییدا شی دەکرێتەوە.

## سەرچاوەکان

١ – اسناد معاهدات دوجانبه ایران باسایردول – واحدنشر اسناد، دفترمطالعات بین المللی، تهران ١٣٧١ج٥ص ص ٢١– ٢٨

٢ – اسناد معاهدات دوجانبه، پیشین، ص ٢٣

٣ – وزارت داخله، اداره شمال، شمارەهای ١٩٩٤تا ١٠٠٠، تاریخ اردیبهشت ١٣٠٥،اسنادملی ک(٢) ٦٦٧٤

٤ – ڕۆژنامەی حبل المتین، ٩ مهر، ١٣٠٤

٥ – وزارت امورخارجه، اداره دوم سیاسی، نمره ١٨٤، مورخ ٢٤اردیبهشت ١٣٠٥ اسنادملی

٦ – ریاست وزرا، نمره ٩٠٤ مورخ ٢٧اردیبهشت ١٣٠٥

٧ – وزارت امورخارجه، سوادراپۆرت کارگذاری رضائیه نمره،٢٥٤،مورخ ٣١خرداد، ١٣٠٥ اسنادملی ک(٢)٢٠٩٠٢بڕوانه بەڵگەکانی پاشکۆ، بەڵگەی ژمارە ٢

٨ – وزارت امورخارجه، اداره دوم سیاسی، سواد راپۆرت کارگذاری ارومیه، نمره ٥٧٠ مورخه ٨شهریور ١٣٠٥ موسسەمطالعات مرحله سوم ٣٨٤

9 –JACUB M ,LANDAU,PAN–TURKISM IN TURKEY,A

STUDY OF IRREDENTISM ARCHON BOOKS, CONNECTICUT,1981,PP,74–75

۱۰- وزارت امورخارجه نمره ۹۱۷۳کەطی نامەشماره۲۵۰٤۹۰دراول حوت ۱۳۰۲برای استحضاروزارت معارف ارسال شدەاست اسنادملی ۱۱ - گزارش بدون تاریخ تحت عنوان«افکارعمومی ازربایجان» کەمربوط بهمین دوره است. موسسه مطالعات،۲٤۲۰٥ -ق

۱۲ - سوادراپورت کارگذاری ارومیه، موسسه مطالعات، ۲٤۲۰٥

۱۳- احمدامیراحمدی خاطرات نخستین سپهبدایران،۲جع۱، بەکوشش غلامحسین زرگری نژاد، تهران، موسسەپژوهش ومطالعات فرهنگی ۱۳۷۳ص۸۷ . ۲۸٦

۱٤ - امیر احمدی ، همانجا

۱٥ - امیر احمدی همانجا

۱٦ - مجله اینده دورەاول، شماره ۱۰، اردیبهشت ۱۳۰٥ ص ص۷۱___٥۷۰

۱۷ - همان شماره، اول تیر ۱۳۰٤ ص ٦۲

۱۸ - سواد راپورت کارگذار ارومیه، موسسه مطالعات ۲٤۲۰٥ ___ق

۱۹ - وزارت داخله، سواد راپورت حکومت کردستان از سنندج نمره، ٦۹۲، تیرماه ۱۳۰٥، موسسه مطالعات، ۲۸و۲٥و۵۸۰۲٥ .

# بەشی چوارەم

## نارەناری سیاسی

وەک باسکرا لە پایزی ۱۳۵۰(۱۹۲٦)بە سەربزێوی سمکۆ و هاوکاری نەکردنی تورک بۆ سەرکوتکردنی ئەو، بەکردەوە بۆ کاربەدەستانی ئێرانی دەرکەوت کە پەیمانی« دۆستایەتی و ئەمنیەت » نرخێکی ئەوتۆی کردەوەیی نیە. نوکتەیەکی ترکە لەم قۆناخەدا روون بۆوە، ئەوە بوو کە تورک ئامادە نەبوون بریاری کومیسیۆنی سنووری سالّی ۱۹۱۲بۆ دیاریکردنی سنوور قەبولّ بکەن. لە ئاخری.جۆزەردانی ۱۳۰٦(۱۹۲۷)تەیمورتاش بە رۆبیرت کلایڤ، وەزیری موختاری بەریتانیا لە تارانی راگەیاند کە:»دەولّەتی تورکیا بە ئێرانی راگەیاندوە پرۆتکۆلی ۱۹۱۲ی قەبولّ نیە. لە ئەنجامدا پاسگاکانی سنووری لە ناوچە جیاوازەکانەوە هێناوەتەوە سەرخەتی قەدیمی سنوور و دەستەی تالآنچی کوردیشی هانداوە ئێران بەلامـاربدەن.« بە قسەی تەیمورتاش سالّی رابردوو بژیشکری لەم جۆرە روو داوانە پەیمان ئیمزاکرابوو. هەرچۆنێک بێ دەولّەتی ئێران بە سەرنجدانی ئەم وەزعە کە هەم لە گەلّ داگیرکرانی هێندێ ناوچەی سنوور و هەم لە گەلّ دەست وەشاندنی هۆزەکانی کوردی سەر بە تورکیا روو بە روو ببوو، لە بواری خۆجێی و دەرەوەدا هێندێ هەنگاوی هاویشتن.

لە روانگەی خۆجێییەوە، دانانی ئەمیرلەشکر ئەمیرئەحمەدی بە سەرپەرشتی کار و باری لەشکر و دانانی عەلی مەنسور بە ئەیالەتی ئازەربایجان لە بەهاری ۱۳۰٦، نیشانێکی رووناک بوو لەم گرنگیە کە دەولّەت بۆ گۆرانکاری ئەو سنوورەی دادەنێ. ئەمیرئەحمەدی لە بوونی شەریفودەولە رازی نەبوو. ئەولە خاکە لێوەی ئەو سالّەدا، وەلانرا و مەنسوور کە یەکی لە پیاوە بە تەجروبەکانی بە توانای ولآت بوو،

کرابە والی ئازەربایجان.

لە نیوەی هەوڵی ساڵ بە سەرنجدانی پەرەگرتنی ڕاپەرینی ئارارات ، هەڵویستی تورکەکان لە بەرانبەر گۆڕانکاری سنووری ئێراندا، زۆر چالاکانە نەبوو. وەک باسکرا ڕاپەرینی ئارارات لە بەهار و هاوینی ١٣٠٦(١٩٢٧) لە بواری نیزامی و سیاسیدا چالاکی خۆی گورج وگۆڵترکرد. تەقەلای هێزەکانی تورک بۆ سەرکوتکردنی کوردەکان کە چەند جارێکیش گەیشتە دەست درێژی پان بۆ سەرخاکی ئێران، ئاڵۆزییەکی پێکهێنا کە بوو بە هۆی ئیعترازی دەوڵەتی ئێران. بەم حاڵەش سەبارەت بە بالادەستی کوردەکان و شکانی هێزەکانی تورک، ئاڵۆزی سەر سنوور لە باری عەسکەرییەوە زۆرگرنگ نە بوو. تەنانەت لە هەوڵی گەلاوێژی ١٣٠٥ لە ماکۆوە خەبەریاندا کە تورکەکان « پاسگای عەسکەری گورجی بولاغ و بولاغ باشی و هێتریان لە سنوورلابردوون، تەنیا کەمێکیان ماون.» گیر و گرفتێکی هاتە پێش زیاترمەسەلە دیپلۆماسی بوو. دەوڵەتی ئێرانیش دەیویست لەم چوارچێوەیەدا چاری بکات. لە نێوە ڕاستی بانەمەردا ڕاگەیەنرا کە میرزامحەمەد سادقی تەباتەبایی باڵیۆزی ئێران لە ئانکارا بانگ کراوەتەوە. کاتێکی خەبەری دانانی محەمەدعەلیخانی فروغی، یەکێ لە گرنگترین کە سانی دەزگا بۆ باڵیۆزی ئێران لە تورکیا بلاوکرایەوە گرنگی مەسەلەکە لە ڕوانگەی دەوڵەتەوە تەواو دەرکەوت. لەم ناوەدا مەمدوح شەوکەت بەگیش گەڕایەوە بۆ تورکیاو حەسەن وەسفی بەک کار و باری باڵیۆزخانەی تورکیای لە تاران گرتە ئەستۆ. لە لایەکی دیکەوە تەیمورتاش وەزیری دەرباری پەهلەوی کە ڕێبەری بەشێکی گرنگی سیاسەتی دەرەوەشی بە دەستەوەبوو، لە وتو وێژێکدا لە گەڵ دەوڵەتانی بەریتانیا و سۆڤیەت هەوڵی دا مەسەلەی ناکۆکی سنووری ئێران و تورکیا بێنێتە گۆڕێ و پشتیوانی دەوڵەتانی ناوبراو بۆ چارەسەرکردنی ئەو ناکۆکییە ڕابکێشێ (*)

---

(*)- لێرەدا نووسەری بەرێز لاپەرەکانی ٧٤و٧٥و٧٦ی بۆباسی سیاسەت وناکۆکی ئێران وئینگلیز وبۆچوونیان سەبارەت بەکێشەی سنووری ئێران وتورکیا وسنووری ئێران وعیراق

هەرچەند لە ڕەوەندی ئەم وتو وێژەدا سەبارەت بە باشبوونی پێوەندی ئێران و سۆڤیێت پێشکەوتنێک هاتە دەست و بە چەشنێکی گشتی لە بە هێزبوونی هەڵکەوتی نێو نەتەوەیی ئێراندا کاریگەر بوو ، بەڵام لە ڕوانگەی چارەسەرکردنی مەسەلەکانی سنووری ئێران و تورکیا ، یالانی کەم بۆ ویستی ئێران کە وەدەست هێنانی پشتیوانی هێزێکی دیکە بوو بۆپاراستنی مافەکانی، ج گرێی ئەوتۆی نەکردنەوە. چونکە سیاسەتی دەرەوەی سۆڤیێت سەبارەت بە کوردەکان لە بناغەوە لە سەر پشتیوانی لە تورکیا داڕژابوو. هەروەک تەنانەت لە جەنگەی قەیرانی ڕاپەرینی شێخ سەعیدیشدا ڕۆژنامەی ئیزڤێستیا بە ئاشکرایی وریایی دابە ئێران کە:«...دەوڵەتی ئێران ناتوانێ لەم کیشەیە هیچ وەدەست بێنێ. چونکە پشتی ڕاستەقینەی ئەو هەر ئەو ئیمپریالیزمەیە کە جیاخوازی کوردەکانی لە تورکیا هێناوەتە گۆڕێ و لەم ڕێگایەوە نەک هەرتەنیا بۆ کوردستانی ئێرانیش مەترسی پێکهێناوە کە کوردستانی ئێران سەرلە نوێ بکەوێتەوە سەر بزووتنەوەی جیاوازیخوازی، بەڵکوو بۆ نەخشەکانی ئینگلیزیش لە کێشەی موسڵ دەبێتە جێگای ڕاو ڕاوێن.»(١)

لە ڕاستیدا یەکێ لە ئامانجە هەرە گرنگەکانی سیاسەتی دەرەوەی سۆڤیێت لەم قۆناخەدا، بریتی بوو لە نیزیکی و یەکیتی پتری ئێران و تورکیا و کەلک وەرگرتنی

---

ونیگەرانی ئینگلیز لەنیزیکی ئێران وئەفغانستان وسۆڤیێت وتورکیا وگیروگرفتی بازرگانی نێوان ئێران وسۆڤیێت وهیتر تەرخان کردوە کەپێوەندیان بە کوردو مەسەلەی کورد لەتورکیاوئێرانەوە نیە. لەبەرئەوەی مەبەستی سەرەکی بەکوردی کردنی نووسراوەکەی ئاغای بەیات، ئاگاداری یەلەباروودۆخی کوردستان لەوسەردەمەداو ڕوونکردنەوەی مەسەلەی کوردوکێشەی نێوان ئێران وتورکیا لەسەرزێدونیشتمانی کوردە و ڕوونکردنەوەی ئەم واقعیەتە یەکەچۆن ئەم نەتەوە کەوتارایە بۆتە کەمەی نێوان ئەم دوودەوڵەتە شۆڤێنیستییە ودەوڵەتەکانی زلهێز. بۆیە بەنیجازەی خوێنەرانی بەرێز و لە کاڵ داوای لێبووردن لە نووسەری هێژا، ئەم چەندلاپەرە هەلداوێرم و لە نیوەی لاپەرەی ٧٧وە کەباسی کورد و سیاسەتی سۆڤیێت سەبارەت بەکورد دێتەگۆڕێ، باسەکەمان درێژە پێدەدەین.

موسکۆ لەو نیزیکیە. هەر لەو رۆژانەدا چیچرین ( وەزیری دەرەوەی سۆڤیێت) بە بۆنەی بەستنی قەراردادەکانی ئیران و سۆڤیێت لە وتارێکدا گوتی : «.. لە هەل و مەرجی ئێستادا کە ئیمپریالیزمی جیهانی لە هەموو وڵاتەکانی دنیا بۆ پێکهێنانی جەبهەیەکی دژی ئێمە، هێزەکانی هانداوە، بەستنی ئەم پەیمانە رووداوێکی سیاسی گرنگە لە سەر هەموو جێگایەک شوێنی قووڵ دادەنێ.» رۆژی دوایی قەرمخان یاریدەری وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیێت لە دیدارێکی چاپەمەنیدا لە گەڵ ئاماژە بۆئاڵۆزی بار و دۆخی نێونەتەوەیی و دوژمنایەتی دژی سۆڤیێت رایگەیاند: «... ئێستا تەنیا بار و دۆخی جێگای هیوای رۆژهەلات و بە تایبەت ئێران و تورکیا - ئەم دوو وڵاتەی کە بە هەردایەکی هاوبەشی ئەمنیەتی پێکەوە پێوەندییان هەیە- لە پەشێوی بار و دۆخی کەم کردۆتەوە .»(٢) هەرچەند ئالوگۆری ناوبراو لە بواری هەڵکەوتی ناوچەیی ئێرانەوە بە هەنگاوێکی گرنگ دەژمێردرا، بەلام ئەوەی تەیمورتاشیش بە هەرەشەی لاتاویی بە وەزیری موختاری بەریتانیای راگەیاند کە: ئەگەر دەوڵەتی ئێران نەتوانێ لە سەر پشتیوانی بەریتانیا حساب بکا، ناچارە بۆ بەرگری لە خۆی رووبکاتە رووسیا، هیچی بە دواوە نەبوو. نەخشی رووسیا هەرئەوەندە بوو کە بە سەرنجدانی بار و دۆخی نێونەتەوەیی تەنیا لە توندبوونی ناکۆکی دوو وڵات پێشگری بکا کە بەشێکی خوارووی سنووری ئەوان دەپاراست. بەم حاڵەش گۆرانکارییەکی کە لە رادەی ناوچەیی و بە تایبەت لە سنووری ئێران و تورکیا لە گۆرێدابوو، رەوەندێکی دیکەی هەبوو.

## قەیرانی سنوور

وادیارە لە نێوە راستی خەرمانانداء وەزیری موختاری تورکیا بە وەزارەتی دەرەوەی راگەیاند کە دەوڵەتی ئەو دەیەوێ بۆ سەرکوتکردنی کوردەکانی ئارارات هێزێک بنێرێ. داواشی کرد کە دەوڵەتی ئێران پێشی راکردنی کوردەکان بگرێ بۆ وڵاتی خۆی.( یانی شتێکی وەک ئەوەی دەوڵەتی ئێران بۆ سەرکوتکردنی سمکۆ لە وانی ویستبوو، ئەنجامیان نەدابوو.) دەوڵەتی ئێرانیش وەلامی دایەوە، سەرەرای

بەر تەنگی کات تێدەکۆشێ کە نەهێڵێ لە لایەن کوردەکانی ئێرانەوە یارمەتی بە ڕاپەڕیوەکان بکرێ و، هەوڵیش دەدا:« هۆزەکانی سنوورنشینی خۆی لە هێڵی سەرسنوور دوور خاتەوە و بۆ نێو وڵات ڕایان گوێزێ »(٣)

بەقسەی کار بەدەستانی ئێران جگە لەو هەنگاوانە دەوڵەت ئەفسەرێکی بەرزیشی ناردە ئەم ناوچەیە کە لەم کارەداله گەڵ فەرماندەی هێزەکانی تورکیا هاوکاری بکات. (٤) لە وانەیە مەبەست سەرتیپ حەسەنخانی موقەدەم، فەرماندەی تیپی یەکەمی لەشکری سەرووی ڕۆژئاوا بوو بێت کە فەرمانی پێدرابوو تایفەی سکان و قزڵباش بۆ ناوچەکانی ناوەوە باربکات، تاپێوەندییان لە گەڵ قاچاغان نەمێنێ. (٥)

سەرەڕای ئەم ئامادەییە کە لە کاتی عەمەلیاتی تورکە دژی کوردان بەڕێوە دەچوو، نەک هەرکلکەی عەمەلیاتیان بۆنێوخاکی ئێران پەرەی گرت و ناوچەیەکی وەک سەرداربولاغ بۆمباران کرا، بەڵکوو تورک ئیدیعایان کرد کە کوردەکان هێندێ عەسکەری ئەوانیان بە دیل گرتوە و بردوویاننە خاکی ئێران و ئەگەرلە ماوەی دوو ڕۆژانداپلەکان بە چەکەوە نەدرێنەوە و قەرەبۆی زیانەکەش نەکرێتەوە، لە وانەیە « پێوەندی سیاسی قوت بکرێت.»(٦) تەنیاشتێکی لەم ئاگاداریە دا باس نەکرابوو، هۆی ڕاستەقینەی تورکەکان بوو. بە گوێرەی بیرەوەرییەکانی ئەمیرئەحمەدی وادیتە بەر چاو کە تورکەکان پێش ئەوەی بیانەوێ سنوورەکان ببەسترێن و هاتوچۆی کوردەکانی تورکیا پێشی بگیرێ، زیاتر ئەوەیان دەویست کە لە ڕێگای خاکی ئێرانەوە ڕاپەڕیوەکان گەمارۆ بدەن. بە گوێرەی نووسراوەی ئەمیرئەحمەدی«... تورکەکان دەیانویست لە خاکی ئێرانەوە، واتە لە بناری ئاراراتەوە لەشکر بێنن. چونکە جگە لەوە ڕێگای دیکەیان نەبوو. بەلام ئەو لە گەڵ هێزی نیزامی و سوارانی جەلالی و میلان و سکانەکانی خاکی ئێران ڕێگای لێگرتن و ڕایگەیاند:« ڕێگا نادەم بە چەکەوە بە خاکی ئێراندا تێپەڕن. ئەوان بە ڕێگای دژوار و کوێرە ڕێداچوون و دەستیان نەگەیشتە سکانەکان و هێزی تورک توشی شکانێکی ئەوتۆ بوو کە لەشکرێکی تەواوی لە بەینچوو.»(٧)

به گوێرەی ڕاپۆرتێکی دیکە لەو عەمەلیاتەدا«...کوردەکانی تورکیا نیزیکەی ٦٦٠عەسکەری تورکیان لە چیا گەمارۆدا و لە بەینیان بردن. ٥٠کەسیش دەگرن و کشتیان تیرە باران دەکەن. لە نێو ئەوانەدا دوو کەس نەجاتیان دەبێ و پەنا بۆ ئۆردووی ئێران دەبەن و لە وێوە دەچنەوە نێو لەشکری خۆیان.»(٨) لە وەلامی ئێعترازی تورکیادا بە قسەی مین باشی شوکری بەگ، یەک لەوئەفسەرانەی کە بۆ ئێران ڕایکرد بوو، دەوڵەتی ئێران وەبیری خستەوە کە شەڕی باسکراو لە خاکی تورکیادا قەوماوە و ئێران بەرپرس نیە و مۆڵەتی ناو براویش قەبوڵ ناکات. لە گەڵ ئەوەش ئامادەیە دەستەیەکی پێکهاتوو لە نوێنەرانی هەرتک لا لەم مەسەلەیە بکۆڵێتەوە. شتێکی دیکە کە لە ئاگاداری ڕەسمی دەوڵەتی ئێراندا باسکرابوو، مەسەلەی ناکۆکی سنوور و پێویستی چارەسەرکردنی بوو، بۆ پێشگری لەو جۆرە ڕووداوانە. دەوڵەتی ئێران لە سەر ئەو باوەڕە بوو، مادام ناکۆکی سنوور کە لە لایەن دەوڵەتی تورکیاوە سازکراوە، کۆتایی پێنەیە و دەست درێژی سنوور دارەکانی تورک بۆ سەر خاکی ئێران ڕانەگیرێ و مەسەلەی سنوور چارنەکرێ، و هەر وەها لە لایەن دەوڵەتی تورکیاوە پێشی دەست درێژی دەستەی ئەشراری تورکیا بۆ خاکی ئێران نەگیرێ، هاوکاری جیددی دەوڵەتی ئێران لە گەڵ تورکیا دەست نادات.

## فروغی لەتورکیا

دوای ڕوو داوەکانی سەر سنووری خەرمانان و قەیرانی پەیدابوو لە پێوەندی ئێران و تورکیادا، فروغی کە بۆ بەشداری لە کۆمەڵی نەتەوەکان چوبوە ئورووپا فەرمانی پێدرا، بچێتە تورکیا. ناوبراو لە پاریسەوە گەیشتە ئانکارا و بە بەشداری مەمدوح شەوکەت بەگ(بالیوزی تورکیا لە تاران)لە گەڵ توفیق روشدی بەگ دەستی بە وتووێژکرد. فروغی لە سەر ئەو دژواریانە پێی داگرت کە لەو سالانەی دواییدا لە نێوان ئێران و عوسمانی پەیداببوو. ناوبراو لە سەرئەو باوەڕە بوو کە لە دەرفەتی پێکهاتوو، بۆ بە هێزبوونی بناخەی دەسەلات و سەربەخۆیی هەرتک وڵات

و خۆ دوور خستنەوە لە پێکهەڵپڕژان کەلک وەر بگیرێ. چونکە ئەو مەسەلە» پاش وتو وێژێکی زۆر چارەسەرکرابوو، ئێستا دە بینین دەوڵەتی تورکیا ئەوەی نوێ دەکاتەوە. ئەو مەسەلەیە ئێرانیەکانی نیگەران کردوە کە دەوڵەتی تورکیا مەبەستی چی یە....مەسەلەیەکی تردەست درێژی عەشایری سەرسنووری تورکیایە بە خاکی ئێران و هێندێ ئاکاری دزێوی مەعمورەکانی دەوڵەتی تورکیان دەبێ چاریان بکرێ.

توفیق روشدی بەگ لە گەڵ پشتگری لە قسەکانی فروغی سەبارەت بە پێویستیی پێوەندیی دۆستانەی نێوانی دوووڵات، بە ئاشکرا رایگەیاند: کە تا مەسەلەی ئەمنیەتی سنوور روون نەبێتەوە، چارە سەرکردنی مەسەلەکانی دیکە سەرناگرێ. بۆئێمە مەسەلەی گرنگ ئەوەیە کە سنووری ئێمە ئەمین بێ و مەجبور نەبین لەشکر لە وێ رابگرین و خەرجێکی زۆربکێشین. دەمانەوێ بزانین ئێوە لەم بوارەدا هاوکاریمان دەکەن. یانا؟ توفیق روشدی بەگ رەخنەی لەوە هەبوو کە لە وتووێژی پێشوودا نوێنەرانی ئێران ویستبوویان لە پێشدا خەتی سنوور روون بکرێتەوە پێشنیاری کرد کە هەرتک لایان پێکەوە چاریکرێن و بە چارێکی ئاسودە بین. لە بارەی چۆنیەتی چارەسەرکردنی مەسەلەی کوردەکانیش داوایەکی نامەعقولی لە ئێران نەبوو. توفیق روشدی بەگ گوتی:« هیچ تەکلیفی سەخت لە ئێوە ناکەین، نامانەوێ لە گەڵ کوردەکان شەڕ بکەن. نامانەوێ چەکیان بکەن. نا. هیچی دیکەمان ناوێ. تەنیا دەمانەوێ ئێوە رێگا مەدەن عەشایری خۆتان بێتە خاکی ئێمە. عەشایری ئێمەش بێتە خاکی ئێوە. ئەگەر هاتیشن، لە ناوچەی سنوور رایان مەگرن. مەسەلەن، سەد یا ١٥٠کیلۆمیتر، دووریان خەنەوە.» «(٩)

پاش ماوەیەک فروغی لە گەڵ شارەزا بوونی زیاتر لە گۆڕانکاری تورکیا لە سەرماوەزی ١٣٠٦راپۆرتێکی درێژی لە سەرەهەڵوێستی تورکیا سەبارەت بە گۆڕانکاری سنووری سەرووی رۆژئاوای ئێران نارد و رێگای چارە سەریشی پێشنیارکرد.یەکەم ئەوەیە: «مەسەلەی کوردەکان گەلێک لەوەی ئێمە بیری لێدەکەینەوە، لێرە گرنگی پتری هەیە. تورکەکان لە رابردوو دا یونانی و ئەرمەن و

سرب و بولغار و عەرەبیان بە هۆی چارەرەشیی خۆیان زانیوە و تێدەکۆشن نەهێڵن لە ژیانی تازەیاندا ئەوە زیندوو بێتەوە. سرب و بولغار و عەرەبیان لە دەست چوو، ئەرمەنیشیان لە تورکیا نەهێشتوە، یونانیەکانیش وادەر دەکەن....» تائەوەی پێش سێ ساڵە.لە پرتووشی سەربزێوی کوردان و کێشەی شێخ سەعید بوون.
ئەوە بەلایەکی زۆرگەورە بوو، بوونی تورکیای خستبوە مەترسییەوە... سەبارەت بەو هەلانەی کە پێش ئەوکارەساتە و دوای ئەویش کردوویانە، ئەم کێشەیە کۆتایی پێ نەهاتوە.

لە لایەکی دیکەوە بە سەرنجدانی ئەوەی کە فروغی لە سەر ئەو باوەڕە بوو:« بیری چەوتی کوردستانی سەربەخۆ ئینگلیزەکان خستوویانەتە مێشکی کوردەکان و لەم بارەوە دڵە ڕاوکەیان خستۆتە دەوڵەتی تورکیا. دیارە ئێمەش دەبێ وەک ئەوان نیگەران بین، بەڵام بەداخەوە لەم کێشەیەدا تورکەکان لە جیاتی ئەوەی ئێمە بە هاو دەردی خۆیان بزانن، بە تەرەفمان دادەنێن. واتە لە لایەکەوە وەک رووسەکان، یابە لاساکردنەوەی ئەوان ئێمە سەر بە ئینگلیز دەزانن، لە لایەکی ترەوە لەم وتو وێژەی لە تاران لە گەڵ مەمدوح شەوکەت بەگ کراوە، واتێگەیشتوون کە ئێمە دەمانەوێ لە نێوان ئێران و تورک دا ناوچەیەکی کورد نشین پێک بێنین...» لە بەرئەوە نیگەرانیان هەبوە لایان وایە«...کە دەوڵەتی ئێران نایەوێ لە دابینکردنی سنوور هاوکارییان لە گەڵ بکات، وئێران بە پەیمان شکێن دەزانن..» مەبەستی سەرەکیشیان لە بەستنی پەیمان ئەوە بوو کە بە یارمەتی ئێران«... لە شەڕی ئەوان ڕزگاربن و سەبارەت بە بوونی کورد ئەو هەموو زەحمەتەیان بە خۆڕایی نەڕوا کە بۆ پێکهێنانی تورکیایەکی تازە و خاڵی لە بێگانەیان کێشاوە. چونکە نە دەتوانن کورد وەک ئەرمەنی ببڕنەوە، نە دەتوانن وەک یونانیان دەریان بکەن. موسڵمانە و ئاسیایی و لە گەڵ تورک هاو ئایین و حەشیمەتێکی زۆر و چاری نایە. بۆ ئەوەی کە ناچار نەبن هەمیشە لەشکرێکی زورلەم سنوورە ڕابگرن و خەرجێکی زۆر بکێشن، دەیانەوێ بە یارمەتی ئێران بە شێوەیەکی خۆش کۆتایی بەو بەلایە بێنن. ئەو ئولتیماتۆمەی دایان بە ئێرانیش لە ژێر تەئسیری ئەم بیر و بۆ

چوونەی سەرەوە دا بوو. ئەگینا ئەوە هەر سیاسەتی تورکییە کە مەبەست و ئامانج باش لە بەرچاو دەگرن، بەلام ئامراز و رێگای بە کارهێنانی خەراپ هەڵدەبژێرن. هەر وەکوو ئەو شەیتانیەیەی لە ئێرانیش کردوویانە، لە بەرئەوە بوە. دیارە مەعمورەکانیشیان ئاقڵ و سالح و پاک نین. چەوتی و خەتایان لە هەڵەی دەوڵەتەکەیان زیاد کردوە..»(١٠)

هەڵسەنگاندنی گشتی فروغی لە بارەی قەیرانی سنووری ئێران و تورکیا ئەوە بوو کە هەر چەند هەرگیز نە دەکرابڕوابە نیەت و ئامانجی تورکان بکەی و ئەو خۆشی:«... هیچ دڵنیانیم کە ئەوان چاویان نە بڕیبێتە خاکی ئێران ولانی کەم تەمایان دەشازەربایجان نەکردبێ...» بەلام لە بەر ئەوەی ئێستا زیاتر گیرۆدەی دژوارییەکانی خۆجێیی و مەسەلەکانی خۆیانن و لە گەڵ ولاتانی مەڵبەندی دەریای رەش و مێدیترانە و هێزەکانی تری ئوروپاییش پێوە بوون، جارێ نایانەوێ لە گەڵ ئێرانیش بەرەو ڕوو بن. بە تایبەت کە «... مستەفاکەماڵ پاشا هەڵوێستێکی ئاقڵانەی گرتۆتە پێش و بەرزە فڕی تورکەکانی پێشووی وەک پان ئیسلامیزم و پانتورکیزمی وەلا ناوە و هەموو تێکۆشانی خۆی بۆ پتەوکردنی بناخەی دەوڵەتو میللەتی تورک تەرخانکردوە...» هەر چەند لە وانەشە بەر دەوامی و بە هێزی زیاترلە دوا ڕۆژدا بۆ ئێران مەترسییەک پێک بێنێ و تورکیایەکی بە توانای دوا ڕۆژ کە لە دژوارییەکانی خۆجێیی و دەرەوە ڕزگاربێ، ئامانجی کۆنی خۆی لە بارەی ئێرانەوە درێژە پێبدا . «... لە گەڵ ئەوە مەترسی نیزیک نابینم و لە سەر ئەو باوەڕەم کە ئێستا لە سەر کێشەی سنوور، تورک نایانەوێ شتێک لە خاکی ئێمە ببچڕن. بەم ڕوونکردنەوە بڕوام وایە کە مەسەلەی خەتی سنوور و ئەمنیەتی سنوور، بە زووترین کات کۆتایی پێبدرێ و درێژە پێدانی لە وانەیە کێچەڵێکی لێ سازبێ.»(١١)

لە بەرئەوە داوای کورد بوو بە زوویی لەم بارەوە و بە تایبەت سەبارەت بە کوردەکانیش مافی وتووێژ و دەسەلاتی تەواوی بدرێتێ. وادێتە بەرچاو سەرەرای ئەوەش کە تەیمورتاش وتووێژی سەبارەت بە «سیاسەتی کوردیشی» وەک مەبەستێک لە بەرچاو گرتبوو کە دەبوایە ئەو باسی بکا، بەلام وا دیارە لە

قۆناخەکانی دیکەدا دەوڵەت مسۆگەری نە کرد بۆوە کە لە بارەی کوردەکانیش وتووێژبکات. هەر چۆنێک بێ ئێستاگەیشتبوە ئەم نەتیجەیە کە«... ئەگەر بەڕەسمی دەسەلاتی ئەدرێتێ کە مەسەلەی کوردیش باس بکا، تورک پەرێشان دەبن و گومانیان بە هێزتر دەبێ کە ئێران نایەوێ لە سەر مەسەلەی کورد لە گەڵیان ڕێک بکەوێ. بە تایبەت ئەگەر من بێ ئاکام لێرە بڕۆم هەڵکەوتی ئەوان زۆر خەراپ و ناکۆکی و دڵ ئێشی نێوان دوو دەوڵەتان زیاتردەبێ.» ناوبراو لێی زیادکرد: «ئەگەر دەوڵەت لەوە نیگەرانە کە تورک داوای لێ بکەن کە کوردەکان نابود بکەین، جێی خۆی نیە، ئەوان داوای واناکەن ورەنگە لە سەر چەک کرنیشیان پێ دا نەگرن. چونکە دەزانن و تێگەیشتون کە ئەوە کارێکی دژوارە و بەم زوانە دەرمتانی نیە. داوای سەرەکی ئەوان ئەوەیە کە لە نێوان دوو دەوڵەت دا هاوکاری هەبێ. لە لایەک کوردەکان نەبنە هۆی زەحمەت دانی تورکیا، لە لایەکی تریش کوردەکان خۆیان نە توانن ئێران بکەنە پەناگای خۆیان دژی تورکیا. کە وابوو بۆ ئەم مەبەستە زیانی چییە کە هاوکاری بکەین ...»(١٢)

فروغی گۆڕانکاری خۆجێی شانۆی سیاسەتی تورکیاشی بە لە بار دەبینی. دەستەیەک لە بەرەهڵستکارانی مستەفاکەماڵ «دەیانویست مەسەلەی سنوور بکەنە ئامرازی پێشەوە چوونی ئامانجی خۆیان و سیاسەتی ڕۆژ هەلات بە چەوت نیشان بدەن و بڵێن دۆستایەتی لە گەڵ ئێران فایدەی نیە. بە تایبەت ئەم بیر و ڕایە لە وەرا لایەنگری پەیدا دەکرد کە سیاسەتی ڕۆژهەلات وپاڵدان بە رووسیش بۆ تورک بێفایدەیە و دەبێ لە ولاتانی ڕۆژئاوا و بە تایبەت لە ئینگلیز نیزیک بنەوە. هەربۆیەش رووسەکان سەریان لێ شێوابوو، هەولیان دەدا ئێران و تورکیا نێوانیان زوو چاک بێتەوە.» ئەوە بوو کە دەوڵەتی عیسمەت پاشا و توفیق روشدی بەگ-یش مەجبور بوون لە ژێر گوشاری نیزامییاندا ئولتیماتۆم بدەن بە ئێران. بەلام ئێستا بە گەیشتنی ئەو بە ئانکارا و دەستپێکی وتوێژ هەڵکەوتی دەوڵەتی عیسمەت پاشا سیاسەتی ڕۆژهەلاتیی ئەو باشتر بوە و فروغی هیوادارە گیر و گرفتەکانی مەوجود چارەسەربکرێن.

## ڕەنگدانەوەی خۆجێیی وتووێژی فروغی

وادیتە بەرچاو کاربەدەستانی تارانیش بە هێنانەوەی خێرای ئەمیرئەحمەدی بۆ تاران، دوای قەیرانی سەر سنووری ناوبراو، نیگەرانی خۆیان لەم گۆڕانکارییە نیشان دابوو، و ئامادەییان هەبوو ڕێبازی پێشنیاری فروغی قەبوڵ بکەن. دانانی ئەمیرلەشکر خزاعی کە کەسایەتییەکی هێندە بە توانا نە بوو لە جێگای ئەمیرئەحمەدی بە سەرۆکی لەشکری سەرووی رۆژئاوا، نیشانەی ئەم نەرمییە بوو. لە لایەکی دیکەوە هەرلەم قۆناخەدا بوو کە سیاسەتی ناسین و سەرکوتکردنی بزووتنەوەکانی خۆجێیی کە پێوەندی یان بە شۆڕشی ئاراراتەوە هەبوو، دەست پێکرا. بە ئاگادارییەکی کە ئاغابکۆف، سەرپەرشتی رێکخراوی جاسوسی و ئاگاداریی سۆڤیێت لە ئێران لە بارەی نەخشی داشناکەکان بۆ ئامادەیی و رێکخستنی ڕاپەرینی ئارارات وەدەستی هێنابوو، و بە هۆی داویتیان باڵیۆزی سۆڤیێت درابوو بە تەیمورتاش(١٣)بۆ پێشگری لە تێکۆشانی داشناکەکان هێندێ هەنگاو هاوێژران. لە سەرەتای بەفرانباری ١٣٠٦(١٩٢٧)وەزارەتی نێوخۆ داوای لە نەسروڵا خەلعەتبەری حاکمی کوردستان کرد، دوکتور ظهرابیان کە، بۆ تەبلیغاتی کورد و ئەرمەنی گومانی لێدەکرێ، و لەم دواییەدا چۆتە سەقز و لە گەڵ پەروێزی وێنەگرپێوەندی گرتوە، بخەنە ژێرچاوە دێری(١٤) حکوومەت وەڵامی دایەوە کە هەرتکیان لە ژێرچاوە دێری دان. لە گەڵ ئەوەش وەزارەتی نێو خۆ پاش ماوەیەک فەرمانی دا بە حاکمی کوردستان کە هەرتکیان ڕابگرن و لێیان بکۆڵنەوە و نەتیجەش ڕابگەیێنن. ئەوان هەر دووکیان گیران و پاش پرسیارلێکردن، فەرمان درا کە بە حەپسی بیاندەن بە ئوستانداری ئازەربایجان.(١٥) لە ئازەربایجانیش مەنسور لە سەر ئەو باوەڕەبوو کە یەکێتی ئەرمەنی و کورد دژی تورکان، بە دژی ئێرانیش تەواو دەبێ. لە ڕاپۆرتێکدا ڕایگەیاند کە هەر دووکیان لە ژێرچاوە دێری دان. دوای چەند ڕۆژ لە وەڵامی پێداگرتنی سەرۆک وەزیرلە سەر وەدواکەوتنی مەسەلەکە، ڕاپۆرتی دا کە تائێستا لە سنوورەکانی ماکۆ، خۆی، ورمێ، ٩ کەس لە

تەبلیغاتچیەکانی ئەرمەنی گیراون و لە تەوریز لە ژێر پرس و جۆ دان. ئەو کەسانەش کە دەوڵەت ڕایگەیاند بوو لە ساباڵاغ وەدوایان کەوتن دەگیرێن. بێجگە لەوە فەرمان درا بە کاربەدەستانی حکوومەتی ئازەربایجان، بە هاوکاری کار بەدەستانی پۆست بڵاو کردنەوەی« ڕۆژنامەی نیشتمانی ئەرمەنیان» لە ناوچەدا پێشی بگیرێ.(١٦)

لە لایەکی دیکەوە وەزارەتی نێو خۆ ئاگاداری دا بە ئەمیرحەشمەتی نیساری حاکمی کرماشان کە بە گوێرەی:« ڕاپۆرتی ژەنراڵ کۆنسولگەری ئێران لە بەغدا، کومیتەیەکی نهێنی سەر بە ئەرمەنی داشناکی بەغدا و هیتر، لە کرماشان دامەزراوە و بینباشی ئەفسەری تورک بە ناوی ئیحسان نوری و تورکێکی دیکەی کاراژ دار کاری تێدا دەکەن . داوای کرد بوو لەو مەسەلەیە بکۆڵنەوە. دیارە ئیحسان نوری پێش چەند مانگ، واتە لە پایزی ئەو ساڵەدا خۆی گەیاند بوە ئارارات. بۆیە حکوومەتی کرماشان لە وەڵامی وەزارەتی نێو خۆدا بێ خەبەری خۆی لە بوونی کومیتەیەکی ئەوتۆ، ڕاگەیاند بوو. هەروەک باسکرا ئەم گۆڕانکارییە ڕەنگدانەوەی ئەم وتووێژانە بوو کە ئەو دەم لە نێوان کار بەدەستانی تورک و ئێرانیدا بەڕێوە دەچوو. دوو ڕۆژ دوای بڵاو بوونەوەی ئاگاداری دەوڵەتی ئێران سەبارەت بە پێوەندی ئێران و تورکیا، ڕۆژنامەی ئیتلاعات لە ١٨ی ڕەزبەردا بە نەقڵی قەول لە دەنگوباسی مۆسکو نووسی: کار بەدەستانی ئانکارا یادداشتی دەوڵەتی ئێرانیان بە خۆشی وەرگرتوە و بە شوێن هەنگاوەکانی ئێراندا، دیلەکانی ئەرتەشی تورکیا ئازاد کراون. لە ئاخری ئەو مانگەدا ڕاگەیەنرا کە بە دوای وتووێژی فروغی و کار بەدەستانی تورکیا دا لە بارەی مەسەلەکانی سنووریش ڕێککەوتنێک وە دەست هاتوەو« لەو نیزیکانە مەسەلەکانی ناوبراو کۆتاییان پێدێت.......»

بەڵام هەر وەک باو بوو ڕاگەیاندنی ڕەسمی دەزگای دەوڵەتی ڕاست نەبوو. بە گوێرەی ڕاپۆرتی نوێنەری سیاسی بەریتانیا لە ئەستەمبوڵ ، وتووێژی نێوان فروغی و کار بەدەستانی تورک، بۆ مەسەلەی کوردەکان و ناکۆکی سنوور تەرخان

کرابوو، بە گوێرەی ڕاپۆرتی ناو براو تورکەکان نەک هەر پرۆتوکۆڵی ١٩١٣یان قەبوڵ نەبوو، بەڵکوو تا ڕادەیەک ئیدیعای سەردەمی شەڕیشیان سەبارەت بە ئازەربایجان سەر لە نوێ زیندوو کرد بۆوە. فروغی کە پاش٢٥ڕۆژ وتووێژ لە ئانکارا وە چوو بۆ ئەستەمبوڵ و چاوەڕوانی گەیشتنی فەرمانی کاربوو، بە باڵیوزی بەریتانیای گوتبوو:« لە تورکیا پانتورکیزم گیانی سەختە.» بەمحاڵەش لە ڕاپۆرتێکدا کە هەر ئەو ڕۆژانە، فروغی بۆ تارانی ناردوە، نەک هەر سەبارەت بە « گیان سەختی» پان تورانیزم نیگەرانی نابینرێ، بەڵکوو بە پێچەوانە سەبارەت بە چارە سەرکردنی ناکۆکی بیر و ڕای نێوان ئێران و تورکیاش هیوادارە. فرۆغی لە ٢٩ی ژانویەی ١٩٢٨دا لە ڕاپۆرتێکدا بۆ تارانی نووسی:« لەو ماوەیە کە لە تورکیابوەم مەستەکان زۆرگۆڕاون و تەنانەت نیزامیەکانیش کە بەر هەڵست و کۆسپی گەورە بوون، ئێستا نەرم بوون.» بە بڕوای ئەو هەر چەند لە وتووێژی سەبارەت بە سنوور و بولاغباشی هەر وتەکانی پێشوو دوو پات کراونەوە، بەلام فەرقەکە هەست پێدەکرێ و لە ئاخریدا دڵنیابوە کە:«...ئێمە دەتوانین لەم بوارەدا بە گوێرەی مەبەستی خۆمان موافەقەت وەربگرین. بەلام مەسەلە بەستراوەتەوە بە پێشەوە چوونی کاری ئاگری داغ و تایفەی جەلالی...» و لە درێژەدا پێی داگرت کە چارەسەرکردنی مەسەلەکانی ئێستا بەستراوەتەوە بە هاوکاری دەوڵەتی ئێران:«... لە سەر دەوڵەتی ئێران واجبە کە هەرچۆنێ بێ پێشی جەلالیەکان بگرێ و بە هۆی دوور خستنە وەیان لە سنوور تەگبیری دیکەش بکرێن کە لەم بەهار و هاوینە دا لە لایەن جەلالیەکانی ئێرانەوە و یا ئەوانەی سەر بە تورکیا کە هاتبنە ئێران، زیان بە تورکیا و تورکەکان نەکات. ئەگەر خوا بکا ئەم مەقسودە پێک بێت و پاشان لە بارەی هاوکاری دوو دەوڵەتەکە لە بارەی ئەمنیەتی سنوور موافەقەت پێک بێ، هیواداری تەواوم هەیە کە ئێمە بە ئامانجی خۆمان بگەین و پێوەندی ئێمە زۆر دۆستانەبێ»(١٧) سەرەڕای گیروگرفتی مەوجود، ڕەمنگە سەبارەت بە نەرمی و هەلپەرستی فروغی بوو بێ لە وتووێژی ئێران و تورکیا دا کە زیاتر لە دەور و بەری بەندی ٤ وەی پەیمانی ١٢٠٥(١٩٢٦)، واتە ئەو بەندانەی پێوەندیيان بە تێکۆشانی

دەستە و گرۆی نەیار لە خاکی یەکتردا دەسوڕاوە، پێشکەوتنێک هاتبوە دەست. لە ئاخری خاکە لێوەی ۱۳۰۷(۱۹۲۸)باڵیۆزی بەریتانیا لە ئاشکرا لە راپۆرتێکدا بۆ کار بەدەستانی لەندەن رایگەیاند کە لە بارێدەری وەزارەتی دەرەوەی تورکیای بیستوە، تورکەکان و ئێرانیەکان بە تەواوی گەیشتوونەتە یەک و ئەم رێک کەوتنەش نەک وەک پەیمانی تازە، بەڵکوو وەک پاشکۆی پرۆتکۆڵێکی جیا لە پەیمانی ۱۳۰۵دا رەنگدەداتەوە. گۆیا رێک کەوتوون کە سنوورەکانی دوو وڵات بە گوێرەی پرۆتوکۆلی ۱۹۱۲دیاری بکرێن. (۱۸)

مەسەلەی دیاریکردنی سنوور و سەرەرای راپۆرتی جۆر بە جۆر کە لە بارەی پێشکەوتنی وتووێژ و تەواو بوونی ئەویلاو کرانەوە، هەر وەک خۆی چارە سەر نەکرا. راستییەکەشی ئەوە بوو کە دەوڵەتی ئێران بڕوای بە نیەتی واقیعی تورکان نە دەکرد. هە ر وەکو کاتێ لە ۲۵ی مانگی مای ۱۹۲۸ پەیمانێکی دۆستی و هاوکاری ئابووری لە نێوان دەوڵەتی تورکیا و ئەفغانستاندا بەسترا، تەیمورتاش لە چاوپێکەوتنێکدا لە گەڵ داویتیان باڵیۆزی سۆڤیت لە ئێران رایگەیاند کە بەستنی ئەو پەیمانە لە روانگەی دەوڵەتی ئێرانەوە جگە لە پەیمانێکی نیزامی شتێکی ترنیە. وەک نیشانەی نیەتی دوژمنانەی دەوڵەتانی ناو براو سەبارەت بە ئێران وەردەگیرێ. جگە لەوە وەبیری هێناوە کە ئەگەر دەوڵەتی سۆڤیت تەواویەتی عەرزی ئێران لە بەرانبەر « دەست درێژی پانتورانیزم» ی تورکەکان دەستەبەر نەکا، ئەو دەم چارەی دیکە نامێنی جگە لە وەی بۆ دابینکردنی ئەمنیەتی وڵات لە گەڵ دەوڵەتی بەریتانیا بکەوینە وتووێژ. بە گوێرەی ئاگاداریە بەر دەستەکان، وا نایەتە بەر چاو کە رووسەکان ئەم هەرەشەیان بە جیددی وەرگرتبێ، چونکە رایەڵکەی جاسووسی ئەوان لە چەند و چۆنی بار و دۆخی سیاسی وڵات و دژواریەکانی نێوان بەریتانیا و ئێران ئاگادار بوو. هەر چۆنێک بێ رووسەکان بە کۆکردنەوەی هێز لە سەر سنوورەکانی نەخجەوان لە گەڵ ئارارات و درێژە پێدانی گوشاربۆ سەر ئەرمەنیەکانی ئێران، نیشانیان دا کە تورکەکان لە مەسەلەی راپەرینی ئارارات و ئەنجامی گریمانیی ئەو بە پشتیوانی مۆسکۆ پشت ئەستوورن.

لە هەوڵی بانەمەردا راپۆرت درا کە دەوڵەتی سۆڤیێت بۆ پێشگری لە هاتوچۆی کوردەکان هێزی لە سنووری نەخچەوان کۆ کردۆتەوە(١٩) جگە لەوە هاوکات لە گەڵ تەقەلای کاربەدەستانی تورک بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە لە ڕێگای وتووێژەوە لە گەڵ سەرۆکانی کورد، راپۆرت درا کە دەوڵەتی سۆڤیێتیش بۆ ئەم مەبەستە دەستەیەکی ناردۆتە کن سەر هەڵداوانی کورد کە ئەوانیش هەر وەک هەیئەتی نادرداوی تورکان وەلامێکی لێبڕاویان وەرنەگرتەوە.(٢٠)

هەرچەند ئێران لە بواری هەڵکەوتی ناوچەییدا، لە بار و دۆخێکی جێگای هیوادا نە بوو، و هەر یەک لە دەسەڵاتە خاوەن بەرژەوەندەکان هەوڵیان دەدا بە کەلک وەرگرتن لەو هەل و مەرجە گوشار بخەنە سەرئێران، بەلام چەند هۆکارێکیش لە کەمکردنەوەی ئاڵۆزیی بار و دۆخەکەدا کاریگەربوون. یەکەم سەرنج ولێ ورد بوونەوەی کوردە راپەریوەکان سەبارەت بە بێ لایەنی ئێران. لە بەشی دامەزرانی خۆیبوون دا، دیتمان کە « پێکهێنانی پێوەندیی دۆستانە لە گەڵ دەوڵەت وەمیللەتی برای ئێران» وەک یەکێ لە شەش ئەسڵی سەردکی رێکخراوی پەسندکرا. ئیحسان نوریش لە بیرەوەرییەکانیدا چەند تێکۆشانێکی کوردەکانی بۆ پاراستنی بێلایەنی ئێران باسکردوە.(٢١) لە گەڵ ئەوەش کردەوەی نارێکی دەستەکانی کورد لە تەواوی ناوچەدا کە جار و بار وەک پەلاماری کوردەکانی لایەنگری تورکیا بۆ سەر خاکی ئێران، و دژواری لێک جیا کردنەوەیان، لە وانەیە لە بوچاندنەوەی تەقەلای ئیحسان نوری و هاڤالانیدا بێ تەئسیر نە بووبێت. هۆیەکی دیکە کە لە هێور بوونەوەی ئاڵۆزی سنوور کاریگەر بوو، تارادەیەک هێدێ بوونەوەی جەبهەکانی شەڕی ئارارات بوو. وەک دەزانین لەم قۆناخەداکە نیزیکەی دووساڵی خایاند، دەوڵەتی تورکیا زۆرتر هەولی دەدا لە ڕێگای وتووێژ و لێخۆشبوونی گشتی ئەم راپەرینە کۆتایی پێ بێنێ. لە بەر ئەوە درێژەی شەڕەکان و ئاڵۆزی سنووریش لە چاو قۆناخی سەرەتایی و کۆتایی پێهاتنی راپەرین کەمتربوو.

لە راپۆرتەکان وا دەر دەکەوێ کە چالاکی بەرچاوی عەسکەری ئێران لەم سنوورە تەنیا چالاکی تیپی سەلماس بوە. لە و ساڵە دا هێزێک بە فەرماندەیی

سەرتیپ موقەدەم لە دەور و بەری ئەلەند و سمکناوا و قەرە عەینی و ئاواجیق عەمەلیاتێکی هەبوە. بەمحاڵەش بیانوی کار بەدەستانی تورک هەر وا بەر دەوام بوو. تەنانەت جاریک بالیوزی تورکیاله سکالایەکدا له پەلاماری دەستەیەکی کوردان بۆ سەر ناوچەی ئارالیق و ئیگدیر، کە دەگوترا خەلیکانلوی جەلالی بوون، بۆ وەزارەتی دەرەوەی نووسی : ئەگەر دەوڵەتی ئێران پێشی نەگرێ و خەلیکانلوەکان ئەم کارانەی خۆیان درێژە پێ بدەن،«... جارێکی دیکەش دەبێتە هۆی خەراپ تێگەیشتنی نێوانی دوو وڵات و گیر و گرفت پێکدێنێ و ئەوەندە تێکۆشانەی کە بۆ چاک کردنی بارو دۆخیش کراوە، بە خۆرایی دەچێ.» (٢٢) سەرۆک وەزیر لە وەلامی وەزارەتی دەرەوەدا رایگەیاند: «..... بەو تێکۆشانەی کە ئێستا بۆ باشبوونی پێوەندی هاوسێی و دۆستایەتی لە لایەن ئەم دوو دەوڵەتەوە دەکرێ، بۆ ئەوەی ئاکامی هەبێ، بە هوی دزییەک کە کاری ئاسایی ئەم تایفە بەد ئەخلاقەیە، رستەی دوایی یادداشتی جەنابی سەفیر پەسندناکەم(٢٢) بەمحاڵەش هەروەک باسکرا، سەبارەت بە وتووێژی دۆستایەتی و هێدی بوونی نیسبی جەبهەکانی ئارارات ،لەم دەورەیەدا ئالۆزییەکی ئەو تۆی سەر سنوور لە گۆڕێدا نەبوو کە بەر چاو بێت.

## سەرچاوەکان


١ – بەنەقل لەرۆژنامەی حبل المتین، ٢٩ ربیع الثانی ١٣٤٤(٢٥ابان ١٣٠٤)

2 – Ibid, p, 127

٣ – ابلاغیە راجع بەروابط ایران وترکیە، اطلاعات – ١٩مهر ١٣٠٦

٤ – همانجا

٥ – وزارت داخلە، ایالت اذربایجان، سوادراپورت حکومت ماکو نمرە ٤١٧، مورخ ١٣٠٦/٧/١٥، استانملی ک، ٧٤٣٧، بنگرید بەاسناد ضمیمە، سند شمارە١٥

٦ – ابلاغیە راجع بە روابط ایران وترکیە، پیشین

٧ - امیر احمدی پیشین ص

٨ - وزارت داخله، ایالت اذربایجان‌سواد راپورت کفیل حکومت ماکو بی نمره،١٦مهر ١٣٠٦، اسناد ملی

٩ - محمدعلی فروغی خلاصه مذاکرات باتوفیق رشدی... مجله یغما مهرماه ١٣٣٠ شماره هفتم، سال چهارم، ص ص ٩٧-٢٩٩

١٠ - محمدعلی فروغی، نامه دوم،اذرماه١٣٠٦(٢٤نوامبر١٩٢٧)تحت عنوان گزارش محرمانه ، مجله یغما، خردادمه ١٣٣٠ شمارهسوم، سال چهارم ص ص ٣٠- ١٢٩

١١ - همانجا، ص ١٣٣

١٢ - همانجا، ص ١٣١

١٣ - ک.س. اقابکوف خاطرات اقابکوف، ترجمه دکتر حسین ابوترابیان، تهران، انتشارات پیام، ١٣٥٧ ص ص ١٢٩ - ٢٥٥

١٤ - وزارت داخله، اداره غرب، نمره ١٠١٥ مورخ، ١٥دیماه ١٣٠٦، اسناد ملی، اسناد ضمیمه، بروانه بەڵگەی ژماره٩

١٥ - وزارت داخله، ادارمغرب، نمره ١٢٦٩، تاریخ ٢٧اسفند ١٣٠٦ اسنادملی، اسنادضمیمه، بەڵگەی ژماره ١١

١٦ - اداره تلگراف دولت علیه ایران،ازتبریزبەتهران،نمرەتلگراف٥٥،تاریخ اصل٢ تاریخ وصول١٣٠٦١١١٢ اسنادملی،اسناد ضمیمه، بەڵگەی ژماره ١٢

١٧ - محمدعلی فروغی، نامه٨ بهمن ١٣٦٠ ٢٩ژانویه ١٩٢٨ مجلەیغما فروردین مار ١٣٢٨ ژماره اول سال دوم ،، ص ص ١٢-١٤

١٨ - سفارت بریتانیا(آنکارا)بەوزارتخارجەبریتانیا شماره١٨٢، ٨ آوریل ١٩٢٨- ١٩فروردین ١٣٠٧

١٩ - وزارت داخله،ایالت اذربایجان، سوادراپرت نظمیه ایالتی نمره١٠٩مورخ١٣٠٧٢٢اسنادملی‌ک ٧٤٢٥ اسناد ضمیمه بەڵگەی ژماره ١٤

٢٠ - وزارت داخله، ایالت اذربایجان، سواد راپۆرت نظمیه ایالتی نمره

۵۱۲/۴۲۳، تاریخ۱۳۰۷/٤/۱۱، اسنادملی ، اسنادضمیمه، بەڵگەی ژمارە ۱٥

۲۱ - وقایع ئارارات، کوهستان، ش ۲۷، ۲۴/۵/۲وش۳۲. ۱۳/۸/ ۲٤

۲۲- وزارت امور خارجه، سواد یاد داشت سفارت کبرای ترکیه به وزارت امور خارجه، نمره۴۲/۱٦ مورخه ۱۲ نیسان ۱۹۲۸ اسناد ملی ۲۰۵۵/۱۰-۱۰۲

۲۳ - ریاست وزرا، نمره ٤۱٥ تاریخ ۱۳۰۷/۲/۱، اسنادملی، ۲۰۵۵/۱۰ - ۱۰۲

بەشی پێنجەم

# کومیسیۆنی سنوور

لە سەرەتای ساڵی ١٣٠٨(١٩٢٩)پاش ماوەیەک وەستان، دەورێکی تازەی وتووێژی سیاسی لە نێوانی ئێران و تورکیا دەستپێکرا. لە سەرەتاوە لە ئاخری خاکە لێوەدا وتووێژ بۆ نوێکردنەوەی قەراردادی گومرگی و مەرجی نیشتەجێ بوونی خەڵکی دوووڵات بە ڕێوە چوو. پاشان دوای هێندێ چاک و خۆشی و چاو پێکەوتنی سیاسی لە ئاخری بانە مەڕدا پەیمانی« دۆستایەتی و ئەمنیەت» ی ساڵی ١٣٠٥ دوای تێپەڕبوونی سێ ساڵ بۆ لێکۆڵینەوە و پەسندکردنی یەکجاری درا بە مەجلیسی شورای میللی. ئەم پەیمانە لە دانیشتنی بانەمەری مەجلیسدا هاتە گۆڕێ و تاقە کەسێک کە دژی وێستا عەبدولڵایاسایی، نوێنەری سمنان و دامغان بوو. ئیرادی سەرەکی ناوبراو ئەوە بوو، چ دەستە بەرێک هەیە کە دەوڵەتی تورکیا لە بەرانبەر هاوکاری و هاورێیی کار بەدەستانی ئێراندا، هاوکاری نیشان بدا. ئەو پرسیارەشی هێنا گۆڕێ کە داخوا دەوڵەتی تورکیا:« ئێرانی خاتر جەم کردوە کە سمایلآغای شکاک و کەسانی وەک ئەو دەداتەوە بە مەئموورە نیزامیەکانی ئێران، یان نا ؟ گریمان ئەوە نەکرێ، پەسند کردنی ئەم پەیمانە چۆن جێگای دڵنیاییە ؟ » چونکە لەم بارەوە باسێکی ئەو تۆ نەکرا، یاسایی -ش دژایەتی خۆی وەرگرتەوە، پەیمانی ناوبراو پەسندکرا و ئیجازەی گۆڕینەوەشی درا.(١)

لە پەسندکردنی ئەم پەیمانە گرنگتر، ڕێک کەوتنێک بوو کە لە بارەی پێکهێنانی کومیسیۆنێکی هاوبەش بۆ دیاریکردنی سنووری نێوان ئێران و تورکیا سەری گرت. ئەگەر کومیسیۆنی ناوبراو لە بەجێگەیاندنی ئەم کارە دا سەرکەوتبایە، زۆر لە ناکۆکییەکانی مەوجود لە بەین دەچوون.

## رێک کەوتن

لە خاکە لێوەی ساڵی ١٣٠٨(١٩٢٩)باڵیوزی ئێران لە ئانکارا و، وەزارەتی دەرەوەی تورکیا رێککەوتن کە کاری کۆمیسیۆنی دیاریکردنی سنوور لە سەربناخەی قەراردادی ١٩١٣ی ئەستەمبوڵ دابمەزرێ کە لە لایەن نوێنەرانی چوار دەوڵەتی ئێران و تورکیا و رووس و ئینگلیز واژۆ کراوە. دیارە سێ نوختەی(بولاغباشی و قەتور و سیرۆ سارژەیک) بە جیا راگەیەنران. تورک داوایان دەکرد کە ئەوان ساڵی ١٩١٣ لە ژێرگوشاری هاو پەیمانانندا رازی بوون ئەو نوختانە بدرێن بە ئێران. دەیانویست لەم بارەوە وتووێژ نوێ بکرێتەوە.........

لە نێوە راستی مانگی گەلاوێژی ١٣٠٨(١٩٢٩)ئەسرولاخانی خەلعەتبەری(اعتلانولولک) وەک نوێنەری دەوڵەتی ئێران لە کۆمیسیۆنی سنوور دیاری کراو بە دەوڵەتی تورکیا ناسێنرا. وا دێتە بەر چاو کە ئەم دەورەیەی وتووێژی سنوور، بە تێکۆشان و دەستپێشخەری تەیمورتاش دەستپێکرابێت. چونکە ئەولە ئاخری جۆزەردان لە ئانکارابوو لە وێوە بە وەزارەتی دەرەوەی راگەیانبوو کە اعتلانولولک لە هەوڵی یولی لە ناوچەدا ئامادەبێ . بڕیار درا کە وەزارەتی جەنگیش ئەوەی پێویستبێ یارمەتی بکا. دەستەی نوێنەرایەتی ئێران لە پازدەی پوشپەردا لە سەر سنووری نێوان ماکۆ و بایزید ئاماد بوو، بەلام دەستەی نوێنەرایەتی تورک هێشتا نە گەیشتبوو.

یەکێ لە خاڵە گرنگ و سەرنجراکێشەکانی ئەم کارە، نەخشی چالاکی رووسەکانە. داوەریی دیاریکردنی سنوور بە کالێنین، سەدری هەیئەتی رەئیسەی شورای بەرزی سۆڤیت ئەسپێرابوو. کۆنسولی رووسیش بۆ زیرەوانی لە وێ ئامادەبوو. اعتلانولولک لە راپۆرتی خۆیدا دەڵێ: کۆنسولی ناوبراو لەوە شادە کە داوەریی بە کالێنین ئەسپێراوە، بەلام لە گەڵ ئەوەش لە دژکردەوەی ئینگلیزەکان نیگەرانە. ناو براو لە اعتلانولولک دەپرسێ:«... ئەگەر کاربگاتە داوەری، پێت وانیە کە ئینگلیزەکانیش بێژن چونکە لە پێشوودا ئێمە لە نێو ئەم کارە دا بووین،

ئێستاش دەبێ هەبین؟»

اعتلائولولک لە وەڵامدا گوتبووی : « ئەوانە مەسەلەیەکن پێوەندییان بە کومیسیۆنەوە نیە و پێشم وانیە کە یەکەم: ئینگلیزەکان لە داوەری ئاگادارین، ئەگەر ئاگاداریش بوون، داخوازێکی ئاوایان هەبێ.»

ئاخرەکەی دوای نیزیکەی بیست ڕۆژ لە چواری گەلاوێژدا، بە جێگیربوونی دەستەی نوێنەرایەتی تورک لە گورجی بولاغ و دەستەی نوێنەرایەتی ئێران لە بازرگان، کۆبوونەوەی کومیسیۆنی سنوور دەستپێکرا. لە دانیشتنەکانی هەوڵەوە دەرکەوت کە تورکەکان داوای بولاغباشی و زەلکاوی یارم قیا دەکەن. تاڵەو ڕێگایەوە بتوانن « ئاژاوەی کوردەکانی ئاگری داغی گەورە » سەرکوت بکەن. لە بەرئەوە مەعمورەکانی دەوڵەتی ئێران بولاغباشی یان بە مڵکی ئێران دەزانی و زەلکاوەکانی یارم قیاش قەت لە ژێر دەستی دەوڵەتی تورکیا د انەبوە، داوای ئەوان قەبوڵ نەکرا.

نوێنەرانی ئێران پێشنیاریان کرد چارێ با کاری دیاریکردنی سنوور لە باشوری بولاغباشی یەوە دەست پێبکەین. چارکردنی ئەو مەسەلەیەش هەر وەک لە قەرار دادی ئانکارا پێشبینی کراوە، بە داوەری بسپێردرێت. لە بەرانبەرئەوە دا تورکەکان پێشنیاریان کرد کاری دیاریکردنی سنوور لەو سەری باکوری سنوور، واتە لە ڕێژەوی چەمی قەرەسو وە دەست پێبکات. ئەوەش بڵێین بە دوای قەراردادی مۆسکۆدا(١٦ی مارسی ١٩٢٠)ی نێوان تورک و رووسان، ناوچەکانی قارس و ئەردەهان و باتوم دران بە تورک، ماوەی نێوان ئاراس - یش تا دەگاتە ئارارات، بەرانبەر بە خەتی سنووری پێشووی ئێران و رووسیا درا بە تورکان، لە بەر ئەوە بوو کە پێشنیاریان کرد دیاریکردنی سنوور لەم نوختەوە دەست پێبکا کە بە گوێرەی قەراردادی تورکمانچای بۆتە پوختەی دەستپێکی سنووری سەرووی ڕۆژ ئاوای ئێران و رووسیا. بریار درا دەستەی نوێنەرایەتی ئێران لەم بارەوە لە دەوڵەت ئیجازە وەربگرێ........

نوکتەیەکی ترکە لەم قۆناخەدا باسی هاتە گۆڕێ، پێویستیی یەکەتی ڕێبازێکی

دیاریکراو بوو، لە بەرانبەر کوردەکاندا. اعتلائولولک هەروەک لە بەشەکانی پێشوودا لە باسی حکوومەتی ئەو لە کوردستان (مەبەست سنە یە ح) وەبیرخرایەوە، یەک لەو کار بەدەستانەی دەوڵەتی بوو کە مەسەلەی کوردەکان تێگەیشتبوو. ئە و دەیزانی کە پاش سەرکوتکردنی راپەڕینی شێخ سەعید و توند و تیژی بێ وێنەی کە تورک لە سەرکوتکردنی کوردەکاندا بەکاری دەهێنن، دەرەتانی درێژە پێدانی سوننەتی کۆنی عوسمانی لە ناوچەدا، واتە هاندانی کوردەکان دژی ئێران لە بەین چوە. لە سەر ئەم بۆ چوونە لە نیوەی گەلاوێژدا، بە ناردنی راپۆرتێک لە بارەی ئەم گۆڕانکارییە و روونکردنەوەی پێشینەی کار، داوای لە دەوڵەت کرد بوو بە پێچەوانەی هەول و تێکۆشانی تورکان«...دەیانەوێ بە کوردەکان بڵێن دەوڵەتی ئێران ئامادەیە هەرکاتی تورک کوردێکی راکردوو لە ئێران بخوازن، کورج تەسلیمیان دەکرێتەوە... دەبێ لە گەڵ ئەم تایفەیە بە خۆشی و محەبەتەوە رەفتار بکرێ و جارێ بە رێوە ببردرێن.»(٢) لە بەرئەوە وە بیری هێناوە کە جارێ مەسلەحەت نیە نوێنەرانی ئێران لە گەڵ تورکان بچنە ئیگدیر و یا شوێنێکی دیکەی خاکی تورکیا. (*)

---

(*)-هەروەک رێزدار ئاغای کاوەبیات دەنووسێ، ئەسرولاخانی ئیعتیلائولولک یەک لەوکاربەدەستە ئێرانیانەبوە کەگۆیا باشتر لەمەسەلەکە تێگەیشتوە. هەروەک لەبەرایبدا باسکراوە کاتێکی حاکمی سنەبوە سەبارەت بەمێژووکولتوورەگەزی ئێرانیی کوردان نووسیویە. ئەم ئاغا تێگەیشتوەی مەسەلەی کورد ویستوویەتی لەرێگایەکی دیکەوە، واتەلەرێگای فریودان وخاپاندن وچاوتووساندن( کەشێوەوخەسڵەت وسیاسەتی بنەرەتی ئێرانیانە) رێگای چارسەرکردنی مەسەلەی کورد نیشان بدات. ئەوەتا لە راپۆرتێکی خۆیدا دەنووسێ:« لەگەڵ ئەم تایفەیە بەخۆشی رەفتار بکرێ وجاری بەرێوە ببرێن» ئەم (جارێ)یە زۆری تێدایە،واتەئێستا کەکاتی نەهاتوە قەلاچۆ یان بکەین، جارێ بافریویان بدەین وبەخۆشی بیانخافڵێنین. لەراپۆرتێکی دیکەدا ناوبراو پێشنیاردەکا ودەڵێ: دەوڵەتی ئێران هەرئەوەندە پارمەتی بەتورک بکات کەلەگەڵ کوردەکانی ئارارات نەکەوێتە شەڕوکێشەوە، پێشی دۆستایەتی ویارمەتی کوردەکانی ئێرانیش بگرێ لەگەڵ کوردەکانی ئارارات، ئەوەش بەجۆرێک کەکوردەکانی ئارارات تورە نەکات. ئیعتلائولولک ئەوەشی لێ

## بەپێچەوانەی چاوەروانی

لە کاتێکا دەستەی نوێنەرایەتی ئێران چاوە روانی گەیشتنی ڕێنوێنی تاران بوو، تورکەکان کردەوەیەکی چاوە ڕوان نە کراویان گرتەپێش. لە سەرەتاوە لە هەوڵی گەلاوێژدا بە پێچەوانەی بار ودۆخی وەرزی ساڵ دەستەیەک لە عەشایری سە ربە تورک لە ناوچەی هاوینە هەوارەوە هێنایاننە ناوچەی قشلاغ و بۆ گیا دروونی دەور و بەری زەلکاوی بارم قیا ناردیاننە خاکی ئێران. پاش ئیعترازی مەعمورەکانی ئێران، ڕایانگەیاند کە ئەندامانی کومیسیۆنی سنوور کاریان بە کاری عەشایری نە داوە. لەم ناوەدا کار بەدەستانی تورکیا عەشایری کوردی ئێرانیشیان خستە ژێرگوشار. لە نێوەی مانگی گەلاوێژدا، خەبەرهات کە لە خانگۆکی و کۆل، تورک داوایان لە حەسەناغای سەرۆکی خەلیکانلوی هۆزی جەلالی کردوە کە لەو ناوچەیە باربکات. کاربەدەستانی عەسکەری ئێران لە گەڵ ڕەخنە گرتن لەم بزووتنەوەی تورکان، داوایان لە کار بەدەستانی دەوڵەتی ئێران کرد کە وریایی بدەن بە دەوڵەتی تورکیا کارێکی وانەکەن کە ببێتە هۆی پێکهەڵپرژانی هۆزەکان. هاوکات لە گەڵ ئەم گۆڕانکارییە فرۆکە نیزامیەکانی تورکیاش بە بیانووی جیاواز لە دەور و بەری ئاواجیق دەستیان بە عەمەلیات کرد و پترلە ٨٠ بومبایان پێدادا کە پاش ڕەخنەی وەزارەتی دەرەوە ڕاگیرا. گۆیا وریایی درابوو بە تورکان کە ئەگەرئەم کارە درێژە بکێشێ، کاری کومیسیۆنی سنوور کۆتایی پێدەدرێ.

فروغی لە نێوە ڕاستی خەرمانان لە وتووێژێکدا کە لە بارەی مەسەلە

---

زیاد دەکا و دەڵێ:«.کوردەکانی تورکیا سەبارەت بەسیاسەتی تورک بەلای ئێراندا هاتوون، خزمەتگوزاری خۆیان بۆئێرانرادەگەیێنن، بەڵام نابێ قەت بڕوایان پێ بکرێ. جۆرێک ببزووینەوە کەنەکوردەکان ناهومێد کەین و نە تورک گومانیان لێ پەیدا بێ.» ڕۆژگارێکی سەیرە !پاش ٧٠ساڵ سیاسەتی ئێران دەورانی پاشایەتی وپاسەردەمی ئیسلامی مەلایان. گۆرانی بەسەردانەهاتوە، بریتی یە لە کوشتن و فریودان . کوردەکەش لەفریوخواردن وخزمەتگوزاری وکوێ لەمستی وپاشانیش پەشیمان بوونەوەو ڕەنج بەخەساری، هەڵوێست وناکاروسیاسەتی خۆی نەگۆڕیوە.

جیاوازەکانی ناکۆکی ئێران و تورکیا لە گەڵ توفیق روشدی هەیبوو، راپۆرتێکی بۆ وەزارەتی دەرەوە نارد و لە قەولی روشدی بەگەوە رایگەیاندە... کار بەدەستانی تورکیاش بە بڕوای دۆستی و پێوەندی باشی نێوان دوو دەوڵەت، دەیانەوێ کار و بارەکان بە باشی بە ئاکام بگەن، و بە تایبەت سەرۆکی ئەرکانی حەرب موشیرفەوزی پاشا بە تایبەت حەز دەکا ئەم ئاخافتنانە نەمێنن و نوێنەرانی هەرتک لا لە دیاریکردنی خەتی سنووردا سەرکەون.

توفیق روشدی بەگ بە راستی وەبیری خستەوە کە پێراگەیشتنی مەسەلەکانی سنوور، ئەرکی کومیسیۆنی دیاریکردنی سنوور نیە. باشتر وایە هەر وەک لە قەراردادی دیاریکردنی سنووری دوو وڵات دا لە بەر چاو گیرابوو، کومیسیۆنێکی دایمی تێکەڵ بۆ پێراگەیشتنی ئەم جۆرە روو داوانە و ناسینی هۆکارەکان پێک بێت. ئەم کومیسیۆنە دەیتوانی لە مەسەلەی بومبارانی خاکی ئێرانیش بکۆڵێتەوە. نوکتەیەکی تری گرنگ کە توفیق روشدی بەگ هێنایە گۆڕێ، مەسەلەی کوردەکان بوو. بە بڕوای ئەو ئێستا هەر تک دەوڵەتی ئێران و تورک پێویستە لە شێوەی سوننەتی ژێردەست راگرتنی عەشیرەتگەلی کورد و کەڵک وەرگرتن لە ئەوان دژی لایەنی دیکە، دەست هەڵگرن. ناو براو گوتی « ئێستا زۆر لە کار بەدەستانی گەورە و پچوکی تورکیا هەن کە دایم هەوڵ دەدەن کە فلان ئاغا و یا فلان سەرۆکی کورد وەدەست بێنین ولە دەسەڵاتی ئەوان لە ناوچە کەڵک وەربگرین.( * )

---

(*)-خوێنەری بەرێز سەرنج بدا ئەوەیش ۷۰ ساڵ کاربەدەستانی تورک نەخشەیان ئەوەبوە کەسەرۆک وئاغایەکی کورد پەیدابکەن وکوردیان پێ بچەوسێننەوە و ژێردەست کەن و دەسەڵاتیان لەرێگەی ئەم کوردانەوە لەکوردستان پتەوبکەن، بیروڕای دیکەش هەبوە کەدەوڵەت راستەوخۆ دەسەڵات پەیدابکاو کوردان سەرکوت و قەڵاچۆ بکات. ئەم سیاسەت و بۆچوونە لە ئێرانیش تۆزێ بەشێوەیەکی جیاوزسەبارەت بەکوردان بەرێوەچوە. پاش ۷۰ساڵ ئێستا دەبینین کەدیسان تورکیاو ئێران ئەمجارە لە رێگای سەرۆک حیزب و روناک بیرو خوێندەوار وسیاسی بلیمەتی کورد دەیانەوێ دەسەڵات وویستی چەپەڵی خۆیان بەسەرکوردابسەپێنن. ۷۰ساڵ کوردهەر بەورەقەرتیەدا دەیکوتێ وهەربەهەوای بێگانە هەڵدەپەرێ.

بەلام دەوڵەتی تازەی تورک دەیەوێ تەنیا دەوڵەت دەسەلاتی هەبێ.» بۆچوونی ئەولەم دەسەلاتەی تایبەتی دەوڵەت، سەرکوتکردنی تەواوی کوردانە. ئەم کارەش لە ڕوانگەی ڕوشدی بەگەوە تەنیا لە سایەی تێکۆشانی هاو بەشی ئێران و تورکیا دەتوانێ سەربگرێ.(٣)یەکێ لەو خالانەی کە ڕوشدی بەگ بۆ پێویستیی سەرکوتکردنی کوردەکان پێی لە سەردا گرتبوو، ئەوە بوو کە «...لە هێندێ ڕووداوەدا، لە وانەیە دەوڵەتێکی سێ یەم دەستی هەبێ و بخوازێ بۆ تێکدانی پێوەندیی دۆستانەی ئێران و تورکیا کوردەکان بکاتە ئامراز و داردەست..» ئەوەش ئاماژەیەکی ئاشکرابوو، بۆ چیرۆکی دەست تێوەردانی بەریتانیا لە ڕاپەرینی کوردەکاندا، لە بەرئەوە ئەگەر دەوڵەتانی ئێران و تورکیا لە بێدەنگکردنی کوردەکاندا هاوکاری بکەن، «... نفوذی دەوڵەتی سێ یەم لە سەرکوردەکان فایدەی نابێ کە بتوانن لەم نفوذە کەلک وەربگرن، و هێزی سێ یەم لە بەرانبەر بڕیاری دوو دەوڵەتی تورک و ئێران لە قەلاچۆکردنی ئەشرار و فەسادەکانی بە خەیالدا هاتوو بێدەنگ دەبێ....»(٤) لە درێژەی ئەو مەتلەبانە دابوو کە دەوڵەتی تورکیا و پستی خۆی بۆ تێپەڕبوونی هێزی نیزامی خۆیان لە ڕێگای یارم قیاوە هێناگۆڕێ. فروغی لەم بارەوە نووسی:«... ئەوەی لێم هەلگراندوە ئەوەیە ئەرکانی حەربی تورکیا گرنگی زۆر دەدا بە ڕێگای یارم قیا و زەلکاوەکانی. دەیەوێ ئەگەر ئێران ڕێگای تێپەڕبوونی بداتێ، لەو ڕێگایەوە لەشکر بێنێ و کوردەکانی ئاگری داغ گەمارۆ بدا و تەواو قەلاچۆیان بکا و ئەمنیەتی خۆی دابینبکات.

ناوبراو لە درێژەی ڕاپۆرتەکەیدا نووسیبووی: بە ڕوشدی بەگی گوتوە:«...مافی تێپەڕبوون بە ڕێگایەکدا کە هەمیشە لە وانەیە گیر و گرفت پێک بێنێ و مەعمورەکانی سنوور کەلکی خەرابی لێ وەرگرن، بۆ دەوڵەتی ئێران دەرمەتانی نیە. دەوڵەتی تورکیا دەبێ لەم جۆرە داخوازیانە کە دەست درێژییە بۆ سەر خاک و ڕێگاکانی ئێران، چاو بپۆشێ...»(٥)

ڕوشدی بەگ گوتبووی:«..دەوڵەتی ئێران لەم بارەوە هەرمەرحەمەتێک بکا، دەوڵەتی تورکیاش لە بەرانبەردا لە شوێنەکانی تر یارمەتی دەدا.» وا دیارە لەم

قۆناخەدا وەڵامی فروغی سەبارەت بە داخوازی تورکەکان نارێ بوە.

## ئەمنیەتی سنوور

لەم ناوەدا بەرلە وەی کومیسیۆنێکی تایبەتی هاو بەش بۆ پێڕاگەیشتنی پێکهەڵپڕژانی سەر سنوور پێکبێ، ڕوو داوێکی دیکە هاتەپێش کە دوو بارە درێژە پێدانی کاری کومیسیۆنی دیاریکردنی سنووری خستە مەترسی یەوە. لە بیستی مانگی خەرمانان عەشایری تورکیا، بە بیانووی بردنەوەی گیای درواو هاتنە خاکی ئێران. هێزەکانی ئێرانی جێگرلە پاسگای قەرەحەسەن و شەیتاناوا، داوایان لێکردن کە تا لە هێزەکانی ئێران لە بازرگان ئیجازە وەر دەگرن، ڕاوەستن. بەڵام لە جیاتی ڕاوەستان تەقەیان لێکردن. هێزەکانی ئێرانیش وەڵامیاندانەوە. هێزەکانی تورکیا بە لایەنگری لە عەشایری ناوبراو، پاسگای قەرەحەسەن و شەیتاناوایان پەلاماردا. ئەو سوارانەی لە لایەن سەرتیپ ئەفخەمی یەوە بۆ لێکۆڵینەوە چوو بوون، کەوتنە بەر دەستدرێژ وتەنانەت یەکێکیشیان لێ کوژرا. ئیتر هەوڵی ئەندامانی دەستەی نوێنەرایەتی ئێرانیش بۆ پێشگری لە درێژە پێدانی پێکهەڵپڕژان ئاکامی نەبوو تا دوای دیداری اعتلائولمولک لە شوێنی دەستەی نوێنەرایەتی تورکیالە کوزجی بولاغ و وەبیرهێنانەوەی شپرزەیی بار و دۆخ، کێشە کۆتایی پێهات. اعتلائولمولک لە تێلگرافێکدا بۆ وەزارەتی دەرەوە ڕایگەیاند.«... پاش ڕووداوەی دوایی بە ڕاستی تورکەکان کردەوەی دوژمنانەیان گرتۆتە پێش، ئیتر زەحمەتە بتوانن ببنە تەرەفی کار و پێوەندی دۆستانە..

هاوکات لە گەڵ ئەو هەنگاوانە(گۆڕینی مەعمورەکانی سنوور)، تەیمورتاش داوای لە اعتلائولمولک کرد ڕوونووسی قەراردادی ئەمنیەتی سنوور بۆ سەرتیپ مقدم بنێرێ و ناو براویش لە بیر و ڕای خۆی سەبارەت بە نێوەرۆکی قەراردادی ناوبراو ئاگاداربکا.

اعتلائولمولک لە ڕاپۆرتێکی درێژدا بیر و ڕای خۆی لە بارەی نێوەرۆکی ئەم قەرارداده نووسی و لە سێ نوسخەدا بۆ وەزارەتی دەربار و، وەزارەتی دەرەوە، و

سەرتیپ مقدم نارد. بەشی زۆری ڕوونکردنەوەی ئەو کە بۆ بەندەکانی ١ تا٦ تەرخان کرابوو، زیاتر لایەنی فەننی کار وەک چۆنیەتی دامەزراندنی پاسگایەکانی سنوور و شتی ئاوای ڕوون دەکردەوە. بەڵام اعتلانولولک لە بارەی مادەی حەوتەم کە بە بڕوای ئەو گرنگترین بەشی قەرار داد بوو، نوکتەی شایانی سەرنجی باسکردبوو. بە گوێرەی ئەو مادەیە «لایەنەکانی پەیمان» وەستۆی خۆ دەگرن کە «بە تێکۆشانی هاوبەش بە دڵەوە بۆپێشگری لە ئاژاوەچییەتی و پەلاماری دایمی عەشایری ناوچەی ئاگری داغ و کۆتایی پێهێنانی یەکجاری ئەو کاربکەن. چۆنیەتی تێکۆشانی هاوبەشی ناوبراو و هۆکاری تایبەتی ئەو لە پرۆتکۆڵی پاشکۆی قەراردادەکەدا دیاری دەکرێن...»(٦)

## بێ لایەنی

اعتلانولولک لە ڕوونکردنەوەی بیر و ڕای خۆیدا سەبارەت بەو مادەیە، پاش باسی کورتە مێژوویەک سەبارەت بە بارودۆخی کوردەکان لە سەر دەمەکانی پێشوودا و چۆنیەتی کەلک وەر گرتنی سوننەتی عوسمانیەکان لەم وەزعە دژی دەوڵەتی ئێران، و گۆڕانکاری دوای سەرکوتکردنی کوردەکان کە لە ڕاپۆرتی پێشووشدا باسیانکرابوو، دێتە سەر مەسەلەی ڕاپەڕینی ئارارات و هەوڵ و تەقەلای بەر دەوام بۆ سەرکوتکردنی و ناکامی تورکەکان. لە سەر ئەوباوەرەیە کە:«...بۆمباران و عەمەلیاتی تۆپخانە لەم ناوچەیە وێستاوە و لە بەر نەبوونی ڕێگا کە دەستیان پێڕاناگات و ڕێگای ئەم ناوچەیە بە خاکی ئێراندایە و ئازوخەی ئەوانیش بەئێراندا دەگات. ئەوەیکەدەیانەوێ بەهۆی بەستنی ئەم قەراردادە بەئامانجی ڕاستی خۆیان بگەن. » ئێستا لەم هەل ومەرجەدا دەبوایە بەر لە هەموو شت سنووری دەست تێوەردانی ئێران ڕوون بێتەوە. ئەوله ڕاستیدا ویستیاری پاراستنی جۆرە بێلایەنیەکی بەلای کورداندا بوو. هەر بۆیە پێشنیاری کرد کە یارمەتی ئێران بە تورک، تائەو ڕادەیە بێ کە نەکەوێتەنێو شەڕ و دژایەتی لەگەڵ خەڵکی ئاگری. تەنیا سەبارەت بە پاراستنی سنوور، پێشی دۆستایەتی کوردەکانی

ئێران لە گەڵ ئارارتییەکان بگرێ. بە جۆرێک کە کوردەکان تورە نەکات، گەیاندنی ئازوخە بەوان چاوەدێری بکات، چونکە بە کردەوە هەست پێکراوە کە کوردەکانی ئەم سنوورە سەبارەت بە دڵتەنگیان لە تورکەکان، بە لای ئێراندا هاتوون و فەرمانبەرداری و خزمەتگوزاری رادەگەیێنن. هەرچەند ئەم سیاسەتەی ئەوانیش کاتی یە، و نابێ هەر گیز بڕوایان پێ بکەی. دەبێ جۆرێک ببزوویەوە کە نە ئەوان ناهومێد بن و نە تورک وابزانن کە دەوڵەتی ئێران بەڵێنی خۆی ناباتەسەر.»

بۆ اعتلانولولک دوو خاڵ مسۆگەربوون. یەک لە وان:« سەربەخۆیی کوردەکان ئیمڕۆ لە رادە بە دەر شایانی سەرنجە، و ئاخرەکەشی رۆژێک دێ کە گرنگی تەواو پەیدا دەکات.» ئەو پێتریان ئەوەیە بێدەنگ کردنی کوردەکان لە سنووری ئازەربایجان بۆ دەوڵەتی ئێران خاوەنی گرنگی دەرەجە دووەمە...» یان بە عیبارەتێکی دیکە، ئەوە کە مەسەلەی راپەرینی کوردەکان زیاترمەسەلەی تورکانە تائێرانیەکان، لە بەر ئەوە نەیدەویست خەیاڵ چاکی لە کن هێندێ کۆڕی کورد سەبارەت بە ئێران بێ سەبەب لە بەین بچێ

لەم روانگەوە لە ئاماژە بۆ نێوەرۆکی قەراردادی ئەمنیەتی سنوور، پێشنیاری کرد کە جگە لە بەندەکانی باسکراو کە دەبوایە وەک جۆرە رێبازێکی سەرەکی لە بەرچاوبگیرێن، یەک دووبەندی تایبەتیش بخرێنە نێوپرۆتوکۆڵ و بکرێنە پاشکۆی پەیمانەکە. مادە گرنگەکان بریتی بوون لە وەی کە مسۆگەر بکرێ. «.. ئەگەر کوردەکانی ئاگری بڵاو بن و پەنابۆ ئێران بێنن، دەوڵەت ئەوان لە ناوچەی سنوور بۆ ناوەوەی وڵات دەگوێزێتەوە و لە هەموانیش گرنگتر لە بەرانبەر ئەو پارمەتیانە کە دەوڵەت لەم بارەوە دەیکا، کاربەدەستانی دەوڵەتی تورک واز لە نوختەی بولاغباشی بێنن کە بە هەق خاکی ئێرانە.»(٧)

ئەوە بیر و رای اعتلانولولک بوو... لە سەرەتای پێکهاتنی کومیسیۆنی دیاریکردنی سنوور، جۆرە ناکۆکیەکی بیر و را لە نێوان فروغی و اعتلانولولک دا، هەست پێدەکرا. فروغی سەرنجی نەدەدا ئەو خاڵە گرنگانە کە اعتلانولولک لە روانگەی ستراتیژی گشتی ئێران لەو مەسەلەیەدا باسی کردبوون، و بە تایبەت

هەڵکەوتی تازەی کوردەکان. وا دێتە بەر چاو کە ڕوانگەی ئەو لەم بوارەدا هێشتا هەر لە سەر بۆچوونی ساڵەکانی هەوەڵی دوای شەڕی دنیاگر وێستاوە کە ناسیۆنالیزمی کوردی بە دەستکردی ئینگلیزەکان دەزانی. هەربۆیەش لە ڕاپۆرتێکدا کە ساڵی ١٩٢٠ وەک نوێنەری ئێران لە کۆمەڵی نەتەواندا ناردوویە، دەنووسێ :«...لە بارەی کوردەکانەوە، عیراق و تورکیا لە گەڵ ئێمە هاو دەردن.» (٨) سەیر ئەوەیە تەنانەت دوای تێپەڕبوونی حەوت ساڵ و لە گەڵ ئەو هەموو گۆڕانکارییەی بە سەربار و دۆخی کوردەکاندا هاتوە، هێشتا دەنووسێ :«...لە هەمووی خەراپتر ئەوەیە کە بیری سەر بەخۆیی کوردستان ئینگلیزەکان خستوویانەتە مێشکی کوردەکان و دڵە ڕاوکەیان خستۆتە دڵی تورکان و لەم بارەوە وەلەرزەیان خستوە. دیارە ئێمەش دەبێ وەک ئەوان بلەرزین.»(٩)

دیارەبەم شێوەلێکدانەوەیە ئەو خاڵانەی پێ قەبوڵ ناکرێ کە اعتلائولولک باسی کردوون. نەک هەر لە بارەی کوردەکانەوە، بەڵکوو لە بارەی ڕێبازی دیپلۆماتی مناسبیش ڕوانگەیەکی سوننەتی هەیە و نەرم و شلی بە چارە سەرکردنی تەنگ و چەڵەمان دەزانێ و دەسپێرێ ئەگەر ئەندامانی کومیسیۆن بتوانن گیانی هاو کاری و ڕێککەوتن نیشان بدەن، تارادەیەک هەستی یەکتر نەرم وباش بکەن و گەرمایی و هەڵچوونی تورکەکان لە بواری ئەمنیەتی سنوور و بێدەنگ کردنی کوردەکان کە بۆتە هۆی ویستی بێجێیی ئەوان، دابمرکێننەوە...» کار بەرەوباشی دەڕوات .(١٠)

ناهەقی نەبوو کە وابە ساکاری بڕوانێتە مەسەلەکە، چونکە دژوارییەکانی پێکهاتووی زیاتربە بەرهەمی کە للەرمقی نیزامیەکانی ئەوانی دەزانی کە هەموو بیر و هۆشیان ئەوە بوو دەسەڵاتی خۆیان بە سەرناوچەی ئاگری داغ دا بسەپێنن، ئەگینا مەدەنییەکان هێندە سەخت نین. بە داخەوە لەم وڵاتەدا مەدەنییەکان لە بەرانبەر نیزامییەکاندا عاجزن .

نووسەر پاش باسێکی دیکەی بۆچوونی فروغی و کێشەی دیاریکردنی سنوور و ناکۆکی بیر و بۆچوونی فروغی و اعتلائولولک، کە بۆ مەبەستی تایبەتی ئێمە بە زیاد زانرا و چەند لاپەرەمان لێ پاشقولدا.، دەگەڕێتەوە سەر باسی بیر و ڕای

اعتلائولولک سەبارەت بەکوردان و دەنووسێ :

«... اعتلائولولک مەسەلەی کوردەکانیشی لە بیرنە کرد بوو. ئەو بێجگە لە راپۆرتێک کە تایبەت لە بارەی بار و دۆخی تازەی کوردەکان و مەیلی ئەوان بۆ سەر بە ئێراني بوونیان و پێویستیی پێشوازی دەوڵەت لەم گۆڕانکارییە، ئامادەی کردبوو، بۆ دەرباری نارد، مەسەلەی کوردەکان بۆ وەزارەتی دەرەوەش دێنێتە گۆڕێ و لە چوارچێوەی گۆڕانکاری تازەدا، باسی دەکات. ناوبراو بە ڕاستی وەبیری خستەوە کە تورکەکان تەنیا چاوەڕوانی کاری کومیسیۆنی ئەمنیەتی سنوورن. ئەگەرئەندامانی کومیسیۆنی ناوبراو هاوکاریان لە گەڵ بکەن، هیچ دڵنیایەک لە دەست دانیە پاش ئەوە سەبارەت بە کاری سنوور فیداکاری و یارمەتی بکەن. ئەگەر ئەو یارمەتیەشیان پێ نەکرێت کە چاوەڕوانی دەکەین، بیانوویان بە دەستەوەیە قسەی خۆیان بکەن. کە وابوو بەرژەوەندیی ئێران لە چیدایە؟ داخوا دەبێ لە گەڵ ئەو کوردانەی کە...تا دوێنێ ئامرازی دەستی تورکان بوون هەزاران گیر وگرفتیان بۆئێمە پێک دەهێنا، ئیمڕۆکە دڵیان لە تورکان یەشاوە و دەیانەوێ پاڵ وە ئێمەبدەن، ببینە تەرەف و بەکوێرەی ئاواتی تورکان بە دەستی خۆمان ئەوان بکەینە تەرەف کە هەمیشە بە دەستی تورکان لە گەڵ ئێمە بەربەرەکانیان دەکرد. یا دەبێ هەرچەند بشزانین کەفیلمان لێ دەکەن، مودارا و میهرەبانی بکەین.؟» وەڵامی وی ئەوەیە:«...ئەگەر سیاسەت بە دەست من بایە، لە گەڵ کوردەکان نەدەبوومە تەرەف..چونکە بە بڕوای ئەوە... هەرچەندە مەئمورەکانی کومیسیۆنی ئەمنیەت ئاقڵ و زاناش بن، لە بەرانبەر تورکەکاندا کە تەنیا دەیانەوێ ئێران لە گەڵ کوردەکان بکەنە تەرەف، ناتوانن بڕوای ئەوان بۆ لای خۆیان رابکێشن. کە وایە دەبێ هەوڵی تایبەتی ئێمە ئەوەبێ کە مەسەلەی دیاریکردن و ئەمنیەتی سنوور لێک جیابکەینەوە..»(١١)

لە کاتێکاکە اعتلائولولک لە سەر گرنگیی نەخشی کوردەکان لەم ئاڵوگۆڕە و پێویستیی جیاکردنەوەی(دیاریکردنەوەی سنوور)و ئەمنیەتی سنوور، پێی دادەگرت، لە هیچ راپۆرتێکی فروغی دا کەمترین تێکۆشان بۆلێکۆڵینەوەی ئەم

هۆکـارد و یالانی کـەم ڕدخنە و شـیکردنـەودی بیـر و ڕای اعتـلائولولک لەم بارەود بەرچاو ناکەوێ. نەود لە کاتێکا کە تەواوی بەڵگە و شایەدی مـەوجود، ڕاست باسی گرنگی ئەم مـەسەلە تایبەتیە دەکەن. تەنانەت لە ئاخرین ڕاپۆرتی فروغی دا کە بە دەسـتـەوەیە، جگە لە ڕەنگدانەوەی ڕەخنە نە گرتنی بۆ چوونی کار بەدەسـتـانی دەوڵەتی تورکیا، شتێکی دیکە بەر چاو ناکەوێ. فـروغی لە سـەرەتای سەرماوەزی ۱۳۰۸بۆ وتووێژی مەسەڵەی کۆتایی کاری کومیسیۆن چاوی بە توفیق روشدی بەگ کەوت. لەم دیدارەدا وەزیری کاروباری دەرەوەی تورکـیـا لە گـەڵ هـەڵسـەنگاندنی هۆی سـەر نەکـەوتنی کـومـیـسـیـۆن لە چارەسـەرکـردنی مـەسـەلەکـانی سنوور، هیواداری دەربڕی کە بە دەستپێکردنەوەی کاری کومیسیۆن لەم نوختانەدا کە ناکۆکی یان لە سـەرنیـە، ئاسـتـەنگێک نەیەتە پێش. فروغیش لە گەڵی هاودەنگبوو. خـاڵێکی دیکە کـە روشـدی بەگ باسـیـکرد: پێـوەندی ڕاسـتـە و خـۆی کـاری «کومیسیۆنی دیاریکردنی سنوور» لە گەڵ پێشکەوتنی کاری«کومیسیۆنی ئەمنیەتی سنوور»بوو. بە پێچەوانەی اعتلائولولک کە بڕوای بەلێک جیاکردنەوەی ئەم دوو مـەسـەلەیە بوو، فروغی لە گەڵ بیر و ڕای روشـدی بەگ هـاو دەنگبوو. روشـدی بەگ هـەر وەک جارەکـانی پێشوو بناخەی بۆ چوونی خۆی لە سـەرناتەبابی بیـر و ڕای نیزامی و مـەدەنییـەکـاندا دەنا. دەیگوت ئەگـەر خـەیاڵی نیزامیـەکان ئاسوودە بێ، ئاستەنگەکانیش کەم دەبنەوە. روشدی بەگ بەڵێنی دا:« لە بەهاری داهاتوودا هـەوڵ دەدەم کـە هـەلکەوتی هـێـزەکـانی ئێـمـە لە ناوچەی ئاگـری داغ وەهـا قـایم بێ کـە ئەشـراران بە تەواوی داماو بکا و لـەم بارەود نیگەرانـی نەمـێنێ و ئەگـەر واشی لێهات دیارە خـەیاڵی نیزامیـەکانی ئێـمـە ئاسودە دەبێ . چونکە نابێ بیشـارینەوە کە لەم هەرێمەدا کوردەکان خەریکی کارن و لە گەڵ ئەرمەنیەکانیش ڕێکن و هەم لە خـاکی ئێمە و هەم لە خـاکی ئێوە، واتە تەورێز دەستیـان هەیە و کەرەسە و ئامراز بۆ خـۆیـان وەدەست دێنن. دیارە لە دەرەوەشـرا یارمـەتیـان پێـدەکـرێ. لە گـەڵم هاودەنگی کە ناتوانین ئەم وەزعە دەدەربەرین. جگە لە وەی بۆ ئێـمـە فرە گرانە، بۆ ئێوەش دەتوانێ زیانـی هـەبێ. ( لەم بارەوە بە تایبـەت ناوێ ئـەفسـەرێکی پێشووی

تورک دێنێ کە خۆی کوردە و ناوی ئیحسان بەگە، ئێستا بە هاودەستی ئەرمەنیان بۆ کوردان کاردەکا.) یەک لەو کارانەی کە روشدی بەگ بە جێگای هیوای دەزانی کە لە داهاتوودا کاری کومیسیۆنی دیاریکردنی سنوور بچێتە پێش، بوونی کومیسیۆنی ئەمنیەت بوو، چونکە خەبەریان پێگەیشتبوو کە بۆ هەوەڵین جارکیانی هاوکاری لە لایەن مەعمورەکانی ئێرانەوە بەرچاو دەکەوێ.

## سەرچاوەکان


١ – اطلاعات، ٢٦ اردیبهشت ١٣٠٨

٢ – وزارت امورخارجە، ادارە کمیسیون سرحدی، نمرە ٣٠، تاریخ ١٣٠٨/٥/٢ موسسە مطالعات ،٢٣-٥٧٤٢٢

٣ – وزارت امورخارجە، سواد مراسلەسفارت ایران درانقرە، نمرە٦٢٣مورخە١٣٠٨/٦/١٤موسسە مطالعات ٥٧٥٠٢

٤ – همان ، ٥٧٥٠٣

٥ – همان، ٥٧٥٫٤ . ٢٢

٦ – وزارتخارجە، ادارە کمیسیون سرحدی، نمرە٩٣، ٢٥مهر ١٣٠٨ موسسەاطلاعات ٧٥١٧

٧ – همان

٨ – بخشی ازاین گزارش تحت عنوان«اقلیت کشورها» درمجلە یغما مهرماە١٣٢٩ شمارەهفتم سال سوم منتشر شدەاست ص٢٦٥

٩ – نامە ٢اذر ١٣٠٦ ، یغما خرداد ١٣٣٠ شمارەسوم سال چهارم، ص ١٢٩

١٠ – وزارت امورخارجە، سواد مراسلە سفارت کبرای ایران درانقرە نمرە ٩٧٧، مورخە ٢٨ابان ١٣٠٨ موسسەاطلاعات،٥٧٥٤١

١١ – گزارش مامورین ، ٥٧٥٤٩

## بەشی شەشەم

# گیانی هاوکاری

لە بەشەکانی پێشوو باسی سیاسەتی ناوچەیی سۆڤیێتی کراکە چۆن لە ساڵەکانی دەیەی١٩٢٠پێکهاتنی هاوکاری ئێران وتورکیاو ئەفغانستانی وەک گۆسپێک لە سەر ڕێگای نیەتی دوژمنانەی وڵاتانی ئیمپریالیستی رۆژئاوا لە بەر چاو بوو، و هەرلەم بوارەشدا دیتمان کە دوای قەیرانی سنووری خەرمانانی١٣٠٦رووسەکانیش لە کەم کردنەوەی ئاڵۆزی نێوان ئێران و تورکیادا تێکۆشانێکی بەرچاویان هەبوو. گۆڕانکاری دوایی سۆڤیێتی لە سیاسەتی خۆجێیی و دەرەوەدا پێویستی بە درێژە پێدانی سیاسەتێکی ئاوا هەبوو.

نیگەرانی دراوسێی باکور

لە ڕێ و ڕەسمی ئاهەنگی دەیەمین ساڵی شۆڕشی بۆلشەویکی کە لە١٠ی نوڤەمبەری ١٩٢٧ لە مۆسکۆ بە ڕێوە چوو، ڕێبازێکی تازە بۆ پەرەپێدانی خێرای پیشەسازی و هاوبەشی کردنی ئیجباری سیستەمی کشت و کاڵی یەکێتی سۆڤیێتی ڕاگەیەنرا کە پاش چەند مانگ وەک بەرنامەی پێنج ساڵەی ئابووری بە کار هێنرا. ئەم بەرنامەیە و بە تایبەت بواری کشت و کاڵی کۆمەڵی سۆڤیێتی کە بەشی زۆری کۆمەڵگای دێهاتی بوو، خستە ژێرتیشکی خۆی، و بوو بە هۆی ئاڵۆزی بەربڵاو، یەک لە ناوچەکانی کە سەبارەت بە هەڵکەوتی شاخاوی و سوننەتی خەباتی خۆ جێیی هەرایەکی بەربڵاو ی بەربەرەکانی لێ سازبوو، ناوچەکانی زنگزور و نەخچەوان لە سنوورەکانی ئێران و سۆڤیێتی بوو. دەستەکانی چریکی مسوڵمان و ئەرمەنی لە بەرپەرچدانەوەی سیاسەتی بێرەحمانەی سۆڤیێت کە بە ناوی هاوبەشیکردنی کشت و کاڵ بە ڕێوە دەچوو، ڕێزە پێکهەڵپرژانێکی بەربڵاویان لە

گەڵ هێزەکانی سۆڤێت دەست پێکرد. لە ڕاپۆرتێکدا کە وەزارەتی نێوخۆی ئێران لە بارەی ئاڵوگۆری سنووری باکور وەریگرتبوو، نووسرا بوو:«..لە ئەنجامی بڕیاری ئەم دواییەی حکوومەتی سۆڤێت بۆ پێکهێنانی مەزراکانی هەرەوەزی و ئەستاندنی بەرهەمی خاوەن مڵکانی گوندی، زۆر لە خاوەن مڵک و وەرزێر بڵاو بوون و توشی هەژاری بوون. وەک زانراوە کار بەدەستانی حکوومەتی سۆڤێت زۆر بە توندی دژی ئەو کەسانە دەبزووتنەوە کە دژی بە ڕێوە بردنی مەزرای هەرەوەزین» هەر وەک باسکرا ئەم توند و تیژییە بوو بە هۆی سەرهەڵدان و یاخی بوون. لە ئاخری بەهاری ۱۹۳۰کۆنسولگەری ئێران لە نەخچەوان ڕاپۆرتی دا: هەرچەندە ڕاپەڕینی خەڵک دامرکاوەتەوە ولێخۆشبوونی گشتی ڕاگەیەنراوە، بەلام هێشتا هێندێ دەستەی نەیارلە چیاکانی دوور و نیزیک دەسوڕێنەوە. » (۱)

سەرهەڵدانی ئەم ڕوو داوانە لە نەخچەوان و زنگزور و ناوچەکانی تری خوارووی قەفقاز، کاری کردە سەرپێوەندی سنووری ئێران و سۆڤێت. لە پلەی یەکەمدا رووسەکان بۆ پینەکردنی هۆکاری ئەو نائارامیانە و شاردنەوەی هۆی ڕاستەقینەی مەسەلەکە، بەپێو باوی دەستی نهێنی ئیمپریالیزمیان هێنا گۆڕێ و دەستەکانی موهاجری دژی سۆڤێتیان خەتابار دەکرد. لە بەر ئەوەی کە دوای شۆڕشی ۱۹۱۷ دەستەیەکی بەر چاو لەو ڕاکردوانە پەنایان بۆ ئێران هێنا بوو، بیانو گرتنی رووسەکان دەست پێکرا. هێندێ جار دەیانگوت سەرهەنگ کەلبەلیخانی نەخچەوان پاش سەرکەوتنی بۆلشەویکان لە قەفقاز، لە ئێران بۆتە پەنابەر و لە ئەرتەشی ئێراند بۆتە سەرهەنگ، ئەردەوێلیشی کردۆتە ناوەندی مساواتیەکان. »(۲)

جار جاریش بە ڕێکخستنی کوشتنی نەیارەکانی کە پەنایان بۆ ئێران هێنابوو، بار و دۆخی سنووریان ئاڵۆز دەکرد. بەلام لە وانە گرنگتر مەسەلەی تێکۆشانی داشناکەکانی ئەرمەنی بوو کە لە باری پێوەندی ناوچەیی زیاتر هەستی پێدەکرا. لە پەنا سکالای بەردەوامی دەوڵەتی تورکیا لە بوونی ئەرمەنیەکان لە ئازەربایجان، وەک ئاماژەی بۆکرا، دەوڵەتی سۆڤێتیش بە تایبەت دوای ئاژاوەی نەخچەوان و

زنگزور دەوڵەتی ئێرانی سەبارەت بە تەبلیغاتی داشناکەکان خستە ژێرگوشارەوە. هەر وەک والی ئازەربایجان (مەنسور) لە خاکەلێوەی ۱۳۰۹دانووسی: مەبەستی رووسەکان ئەوەبوو:«... دەنگوباسێکی سەبارەت بە رووداوەکانی ولاتی خۆیان لێرە بە هۆی موهاجران و یا رۆژنامەکانی بێگانە بلاو دەبنەوە و پێوەندیان بە تەشکیلاتی دژی سۆڤیەتی یەوە هەیە، بە دوور لە راستی نیشان بدەن، ئەگینالە لایەن مەعمورەکانی ئازەربایجانەوە بێلایەنی لە بەر چاوگیراوە و لە تێکۆشانی سیاسی ئەرمەنی وموهاجرانیش لە سنووری ئەرگدا پێشگیری کراوە و هەنگاوی پێویست هاوێژراوە. بەمحاڵەش بیانو گرتن و گوشاری کار بەدەستانی سۆڤیەت درێژەی کێشا.

دژوارییەکانی خۆجێی و تاق کەوتنەوەی سیاسی سۆڤیەت کە بە پچرانی پێوەندی سۆڤیەت و بەریتانیا لە بەهاری ۱۹۲۷ زیاترپەرەی گرت، کار بەدەستانی مۆسکۆ سیاسەتێکی ئاشکرای بەرگریان گرتە پێش. دەوڵەتی رووسیا لە بەر عەوام فریوی بێ یابۆ پینەکردنی سەرکوتکردنی خۆجێیی، یابە بیر و باوەر، رایگەیاند کە دنیای رۆژئاوا بۆ شەرێکی سەرانسەری دژی یەکێتی سۆڤیەتی خۆ ئامادە دەکات. لە کۆنگرەی شەشەمی ئینترناسیۆنالی کۆمونیستی(کۆمینتێرن)کە ئاخری هاوینی ۱۹۲۸ لە مۆسکۆ گیرا، راگەیەنرا«...هێزەکانی سەرمایەداری و لە سەروی ئەوان بەریتانیا سەرەرای ناتەبایی نێو خۆیان، دژی یەکێتی سۆڤیەتی ئامادەی شەردەبن »(۳) ئەم بۆچونە نوێیە سیاسەتی تازەشی بە دواوە بوو. دەوڵەتی سۆڤیەت کە بە گوێرەی سیاسەتی ناوچەیی خۆی لە سەرەتاوە لە ئاست ناسیۆنالیزمی کورد بیر و بۆ چونێکی لە باری نەبوو، ئەوی بە ئامرازی بردنە پێشی سیاسەتی بەریتانیا دەزانی، ئێستا هاو دەنگ لە گەڵ رۆژنامەکانی تورکیا، دەوڵەتی بەریتانیای بە سەبەبکاری راپەرینی ئارارات دادەنا و پێیان وابوو کە مەبەست لەم گۆرانکاریانە « پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستانە » کە « بە تەواوی لە گەڵ قازانجی ئیمپریالیستەکانی ئینگلیزی دێتەوە. چونکە ئیمپریالیستەکانی بەریتانی دەیانەوێ لەم ناوچەیەدا پاڵپشتێکی سوق الجیشی دژی یەکێتی سۆڤیەتی پێک بێنن...

مەبەستی بنچینەیی ئامادەکردنی پێشەکی شەڕی گەورەیە دژی یەکێتی سۆڤیەتی.» (٤)

یەکێ لە قوربانیانی ئەم شێوە بۆچوونە تازەیە، کوردەکانی سۆڤیەت بوون. لە ساڵی ١٩٢١ناوچەی خودموختاری کوردنشین کە لە دەور و بەری شاری لاچین(لە سەر ڕێگای قەرەباغ بۆ ئێرەوان)پێکهاتبوو، و دەهات ببێتە کانونی بەردەوامی ژیانی کولتوری کوردەکانی ئەو ناوچەیە، لە بەریەک هەڵوەشا. هاوکات لە گەڵ ئەم بڕیارە سەرەتای بارکردن و لە بەریەک بڵاوکردنی کوردەکان بۆ ئەوبەری ناوچەکانی سۆڤیەت دەستپێکرا. (٥)

دەوەری ناوچەیی ئەم سیاسەتە بریتی بوو لە موخالیفەتی جیددی لە گەڵ ڕاپەرینی ئارارات کە هەر وەکو باسکرا لە خستنە ژێر گوشاری ئێرانەوە بۆ هاوکاریکردن لە گەڵ تورکان بۆ سەرکوتکردنی سەر هەڵداوان وردە وردە گەیشتە بەرەو ڕوو بوونی هێزی نیزامی لە سنوورەکانی سۆڤیەت و ئارارات، بەرانبەر کوردەکان.

سەرەتای ساڵی ١٣٠٩(١٩٣٠)کە ساڵی ئاخرین بەرەنگاری تورک و کوردەکان بوو، ئاڵۆزی سنووری نێوان ئێران و سۆڤیەت بوو بە جێگای نیگەرانی. لە نێوەی جۆزەردان دا هێزێکی ٦٠٠سواری ئەرتەشی سوور بە دوای دەستەیەکی ٥٠کەسیدا لە یاخیانی ئەومەڵبەندە کە لە سنووری زنگزور بۆ خاکی ئێران هەڵاتبوون، هاتنە ناوچەی قەراچە داغ(ئەرسباران)، و بە گەیشتنی هێزێکی دیکەی سۆڤیەت عەمەلیاتی ناوبراو لە حاڵەتی ڕاو نانی دەستەیەکی هەڵاتوو تێپەڕی و بوو بە لەشکرکێشیەکی ئاسایی. لەو پەلامارەدا هێندێ گوندی ئێران تاڵان کران و خەڵکێکی زۆریش لە گەڵ چەند سەربازێک بە دیل گیران و بردیانن بۆ خاکی سۆڤیەت. سەرتیپ موقەدەم لە ماوەی ٢٤سەعات دا بە بانگ کردنی هێزەکانی جێگرلە ماکۆ و هێزی تەورێز و چریکی شاسەیوان، نیزیکەی ١٢٠٠کەسی کۆکردەوە و لە درێژایی خەتی سنووردا ڕایگرتن. بەڵام بەرلە وەی سەرتیپ موقەدەم کارێک بکا، ڕووسەکان لە گەڵ دیلەکان بۆ خاکی سۆڤیەت گەڕانەوە. بە

دوای ئەم ڕووداوە دا سەرەتای هاوینێ خەبەری کۆ کردنەوەی هێزی عەسکەری لە سنوورەکانی سەرووی ئێران، لە ئاستاراوە بگرە تانیزیک جولفا ڕایدەگەیاند کە «...نیزامیەکانی سنووری سۆڤیەت لە بەرانبەر پردی ئاراز بە شەو مەتەرێزان هەڵدەکەنن» هاوکات لە ئەردەوێلیشەوە خەبەرگەیشت کە «...پاسگاکانی سنووری سۆڤیەت پڕبوە لە لەشکری رووس و هەمیشە خۆ نیشان دەدەن.» (٦)

## دڵنیایی دراوسێی باکور

لە کاتێکا یەکێتی سۆڤیێتی لە گەڵ ئامادەیی بۆ بەرەو ڕوو بوونی شەڕێکی گەورەی ئیمپریالیستی، خەریکی سەرکوتکردنی نەیارەکانی خۆجێیی و ناوچەیی خۆی بوو، لایەنەکەی تری مەسەلەکە، واتە ئیمپریالیزمی بەریتانیا نەک هەڕێشتیوانی لە ڕاپەڕینی ئارارات نەدەکرد، بەڵکوو وەک لە بەڵگەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا دەردەکەوێ، بۆ پێشگری لە هاوکاری دەستەی کوردەکانی عیراق لە گەڵ سەر هەڵداوانی ئارارات، هەنگاوی بەربڵاویشی هاویشتبوو. (٧) وادیارە هەنگاوەکانی بەریتانیا ئەوەندە کاریگەربوون کە تەنانەت توفیق روشدی بەگ لە وتو وێژێکدا لە گەڵ هێلم سکرتێری دووەمی باڵیۆزخانەی ئینگلیز لە ئانکارا لە گەڵ ئامـاژە بۆ دڵنیایی خۆی لە لایەن دەوڵەتی بەریتانیاوە ڕایگەیاند:«...تورکیا لە لایەن عیراقەوە هیچ نیگەرانیەکی نیە.»(٨) لە ڕاستیشدا پاش ئەوەی تورکیا لە هاوینی ١٩٢٦بڕیاری کۆمەڵی نەتەوەکانی سەبارەت بە دانی موسڵ بە عیراق قەبوڵ کرد، پێوەندی تورک و بەریتانیا بەرە و باشی چوو، تەنانەت مانۆری وەک بەستنی قەراردادی بازرگانی و سیاسی و دیداری پلەی سەرووی دەوڵەتی نیوان رووسیا و تورکیا نەیتوانی ئەم ڕەوەندە بگۆڕێ...........

## تێکۆشانی هاوبەشی

ئاخـــرەکـــەی پاش چەندســـاڵ هەڵس و کـــەوت، لە هاوینی ١٣٠٩(١٩٣٠)بەربەرەکانی تورک و کوردەکان لە ئارارات بەرە و کۆتایی دەچوو، و

هەڵوێستی دەوڵەتی ئێرانیش لە نێو گۆڕانکاری توند و خێرادا بار و دۆخی لێبڕاوی وەردەگرت. لە گۆڕانکاریەکانی ئەم دەورەیەدا، واتە جۆرە وتو وێژ و ڕێک کەوتنێکی کە لە مابەینی زستانی ١٣٠٨ تاهاوینی ١٣٠٩لە نێوان ئێران وتورکیادا سەری گرت، هیچ بەڵگە و ڕاپۆرتێکی ڕەسمی بە دەستەوە نیە. لە بەرئەوە لە گێرانەوەی گۆڕانکاریەکانی ئەم دەورەیەدا دەبێ هیوا داربین ڕەوتی ڕووداوەکان خۆیان گۆشەیەک لە چەشنی بیر و هزر و مەنتقی زاڵ بە سەر کردەوەی کاربەدەستانی دەوڵەتیدا نیشان بدە یەکێ لەو گۆڕانکاریانەی کە لە ڕوانگەی ڕوونتر کردنەوەی شێوەی بیر و بۆ چوونی کاربەدەستانی و خت سەرنجراکێشە، چیرۆکی دیتنی کلنل تی.ایی.لاورنس ـــ لاورنسی ناسراوی عەرەبوستان ـــ لە ناوچەکانی ڕۆژئاوای ئێران و دژکردەوەی دەوڵەتە لە بەرانبەر ئەو مەسەلەیەدا.

لە ئاخری ڕێبەندانی١٣٠٨(١٩٣٠)عەلی مەنسور والی ئازەربایجان ڕاپۆرتی داکە بە گوێرەی ڕاپۆرتی حاکمی سەردەشت «کلنل لاورنسی ئینگلیزی لەم دواییەدا هاتۆتە کوردستان» ولە نێوکوردەکاندا خەریکی ماندانە.(٩)لە درێژەی ئەم ڕاپۆرتەدا ڕایگەیاند کە بە گوێرەی ئاگاداری زارەکی لە سەرۆکی گومرگی سابلاغ، کەسێکی ئاوا لە ناوچەی ڕەواندز بوە و گویا لەم دواییەدا بە قاچاخی سنووری بەزاندوە و تا دەورەی شنویە هاتوە و گەڕاوەتەوە.(١٠) بەو تەبلیغاتەی کە ڕۆژنامەکانی سۆڤیەتی وتورکی لە بارەی نەخشی دەوڵەتی بەریتانیا، و بە تایبەت کلنل لاورنس لە ڕاپەرینی کوردەکاندا سازیان کردبوو، دیاربوو زوو یا درنگ لە ئێرانیشدا ڕەنگی دەدایەوە.

لە گەلاوێژی١٣٠٩وەزارەتی دەرەوە لە ڕاپۆرتێکی لێکۆڵینەوەی خۆیدا لە ڕێگای باڵیۆزی ئێرانەوە لە بەغدا، بە وەزارەتی خۆجێیی ڕاگەیاند کە چونکە لە وانەیە لاورنس بە ناوێکی ساختە ڤیزای وەرگرتبێ، ناکرێ بزانین لە کوێوە هاتۆتە ئێران. بەلام«...لە بەرئەوەی لە ڕۆژنامەکانی بەغدا بلاو کرابۆوە کە لە وانەیە کلنل لاورنس لە ماکۆ یا لە ڕەزائیە بێ ، گورج ئەیالەتی ئازەربایجان و فەرماندەی تیپی تێکەڵی کوردستان ئاگادار بکە. ڕەسمێکی لاورنسیش ناردرابوو. مەسەلە بە ئەیالەتی

ئازەربایجان ڕاگەیەنرا. هەرچەندە ناوبراو ڕایگەیاند کە هیچ ڕاپۆرتێکی ڕاست لە بارەی پەڕینەوەی ناوبراو بۆ ئەم مەڵبەندە نەگەیشتوە، لە گەڵ ئەوەش ناردنی فرمانی دەوڵەتی بۆ گشت ئیدارەکانی شارەوانی و گومرگی بۆ ناسین و گرتنی ناو براو درێژەی هەبوو.

ئەوە کە لاورنس لەو ڕۆژانەدا چەند ساڵێک بوو وەک ئەفسەرێکی هێزی هەوایی بەریتانیا لە گۆشەیەکی ئینگلستان خەریکی پێشبرکێنی غارە ئەسپ و کاری ئەدەبی بوو، خۆی مەسەلەیەکی جیاوازە. لێکۆڵینەوەی سەر سوڕهێنەری چیرۆکی کلنل لاورنس لە ئێران، لاورنسی زۆر لە ناوچەکانی وڵات ناسران و گیران و بزر بوونی هێندێکیان لە حەوسەلەی ئەم لێکۆڵینەوەیە بە دەرە. ئەوەی لێرەدا شایانی سەرنجە، تێگەیشتن و شعوری سیاسی ئەو کاتە کە چۆن لە بەرانبەر فیشاڵی تەبلیغاتی بێگانەدا، دەستەوستان دەبێ. لە بارو دۆخێکدا کە پاراستنی بەرژەوەندی نیشتمانی ئەوپەڕی وریایی گەرەکبوو، بەشێکی زۆری توانای دەوڵەت بۆناسین و گرتنی «کلنل لاورنس» تەرخان دەکرا، کە بوون و نە بوونی لە ڕەوەندی گورانکاریە ڕاستەقینەکانی سنووری سەرووی ڕۆژئاوای وڵات هیچ تەئسیرێکی نەبوو.....

دوای شکانی کوردەکانی ئارارات هاوینی ۱۳۰۹(۱۹۳۰)لە شەڕی گەلی زیلان، دەستەیەک لە هێزە شکاوەکانی ڕاپەڕیو، کە بە گوێرەی نووسراوەکانی ئیحسان نوری( ژن و منداڵی کورد)بوون، لە چاڵدران دەگەنە کوێستانی جەلالیەکانی ئێران و لە کن خالیداغا پەنا دەدرێن. فڕۆکەکانی تورکیا کە ڕاویان دەنێن لە خاکی ئێراندا بۆمبارانیان دەکەن و لە لایەن هێزەکانی سەر سنووری ئێرانەوە توشی هیچ دژکردەوەیەک نابن. کاتێ خالیداغا بڕیاردەدا کە لە گەڵ تایفەی خۆی لە وێ باربکا و دوورتر لە سنوور لە ئاواجیق بچێتە قشلاغی هۆزی خۆی، فەرماندەی هێزەکانی ماکۆ پێشی دەگرێ و ناهێڵێ. یاوەر فەتحولاخان لە کاتی ڕاگەیاندنی فەرمانی فەرماندەی ماکۆ، حەمەدەمیناغای برای خالیداغا دەکوژێ و ڕادەکات. بەڵام ئەو هێزەی لە گەڵ ئەو دەبێ، دەگیرێ و چەک دەکرێن. خالیداغا بە شەو هۆز

دەفـاتە ڕێ و لە ڕێگای دۆڵی کـاجـوت، بەرەو قـشـلاغ دەکـەوێتـە ڕێ. لە ڕێگادا پاسگای دۆڵی کاجوت دەیەوێ پێشی بگرێ، بەڵام دوای شەڕێکی کورت تەسلیمی جەلالیەکـان دەبێ، و کـوردەکـان لە گوندی تـانەلی جـێگیـردەبن. ئیـحـسـان نوری دەنووسێ، دوای ئاگاداری لەم ڕووداوەیە، ڕۆژی دوایی خۆی کەیاندۆتە ئەو جێگایە و بە نـاردنی ڕاپۆرتێک لە بارەی ڕووداوەکـە بۆ سـەرتیپ حـەسـەنی مـوقـەدەم و ئەفـسـەر و نیزامیـەکـانی دیل ئازاد دەکـرێن. جگە لە وە وادیارە خـالیـداغـاش لە سـەرۆکـایەتی عـێل وەلا دەنرێ و عـومـەراغـای کـوڕی گـەورەی لە جـێگای ئەو دادەنرێ. بەڵام سـەرەرای ئەوە بەرەنگاری سـەربازەکـانی ئێـرانی و جـەلالیـەکـان درێژە دەکێشێ. (١١)

لەم ناوەدا هێزێکی ئێرانی بۆ سەرکوتکردنی کوردەکانی جێگرلە عیساقشلاغ کەوتنە کـار و شـەو کوردەکانیـان گـەمارۆدا و لە گەڵ بەیانی پەلاماریان دان. لەم هێرشـەدا چـەند کـەس لە کوردەکان، لە وانـە حـەسۆی ئەیوب ئامۆزای خـالیـداغا دەکوژرێن. خـالیـداغـاو پیـاوەکـانی لە لاوە هێـزەکـانی ئێـرانی پەلامـار دەدەن و دەیانشکێنن. جارێکی دیکەش بە ناو بژیکەری سـەرۆکانی ئارارات شـەڕ و کێشـە کۆتایی پێدەدرێت. بە گوێرەی نووسراوەی ئیـحـسـان نوری، ئەم ڕووداوە پیلانێکی حیـسـابکراو بوو لە لایەن یاوەر فەتحـولاخـانـەوە بۆ( شێـواندنی زەینی فـەرمـاندەی لەشکر(موقەدەم) و ستادی ئەرتەشی ئێران سازکرابوو، خزمەت بوو بە تورکان. لە ئەنجامـدا...کـوردەکانی بە گشـتی لە بـەر چاوی دەوڵەتی شـاهەنشـاهـی ئێران بە یاغـی ناسـانـد، و یارمـەتی ڕەزاشـای بە هێـزەکـانی تورکـیـا بۆ نابوتی و سەرکوتکردنی ئاراراتیەکان مسۆگەرکرد.(١٢)

لە چەند و چۆنی ئەم ڕووداوە لە ڕوانگەی کاربەدەستانی ئێرانی، بەڵگەیەک لە دەست دانیە، بـەڵام لە هێندێ ئاماژە بە ئاڵوگۆڕەکانی جێگای باس، وا دەردەکەوێ کە بۆچوونی ڕەسـمی کاربـەدەسـتانی ئێرانی لە سـەرئەو باوەرە بوو، کە خـالیـداغا ویستوویەتی ڕەگـەڵ هێزەکانی ئارارات بکەوێ، نەک بە پێـچەوانە. ئەوان لە سـەر ئەوباوەرە بوون کە خالیداغا:«... لە گەڵ ئەوەش لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە ئەمنیەتی

وەرگرتوە و ماوەیەکیش ئارام بوە، لە نەکاو لە دەور و بەری ماکۆ دەستی بە ئاژاوە کردوە...» جگە لەوە... خەبەریان پێدەگا کە ناوبراو لە گەڵ قاچاخچیانی ئارارات لە پێوەندی دابوە و ویستوویەتی لە گەڵ عێلی خۆی بچێتە ئارارات» وەک باسکرا بۆیە پەلامار دراوە. ڕۆژنامەی حبل المتین لە ڕاپۆرتێکدا دەنووسێ:« کوردەکانی تورکیا خالیداغای سەرۆکی تایفەی جەلالیان لە گەڵ خۆ کردۆتە یەک و، ویستوویانە بیبەنە ئارارات. ئەرتەشی ئێران خەبەری زانیوە ورێگای پێگرتوە کە نەمێلێ بچێ.(١٣)

وەک لە ڕۆژنامەکانی ناوەندیدا، ڕەنگدانەوەی گۆرانکاریەکانی سنوور دەردەکەوێ، لەو ڕۆژانە دا مەسەلەی خالیداغا و نەخشی شەخسی ئەو لە مەسەلەی ئارارات و پێوەندی نێوان ئێران و تورکیا دەورێکی گرنگی هەبوە. هەر بۆیە کاتێکی هەواڵدەری ئاناتۆلی تورکیا لە بارەی هاتوو چۆی خالیداغا بۆ سنوور و دابینکردنی ئازوخەی سەر هەڵداوان لە ڕێگای ئێرانەوە، ڕاپۆرتی بڵاوکردەوە، ڕۆژنامەی ئێران، لە گەڵ پێداگرتن لە سەر هاوکاری ئێران و تورکیا، ئیدیعای هەواڵدەری ئاناتۆلی وەدرۆ خستەوە. لەم ناوە دا گەڕانەوەی سمکۆ بۆ ئێران و مەترسی سەرهەڵدانەوەی بزووتنەوەی ئەو بار و دۆخی ناوچەی ئاڵۆزترکرد. سمکۆ دوای شکانی ئاخرین بزووتنەوەی لە ڕەزبەری ١٣٠٥(١٩٢٦)لە ڕێگای تورکیاوە دەچێتە خاکی عیراق و لە کن شێخ ئەحمەدی بارزانی دەبێتە پەنا بەر. لە مانگی پوشپەر لە گەڵ سوارەکانی دێتەوە شنۆ، وادیارە بۆ تەسلیم بوون و، وەرگرتنی ئەمان نامە گەڕاوەتەوە بۆئێران. بەڵام کاربەدەستای دەوڵەتی ئێران بڕوایان پێ نەکردوە و لە٢٧ی مانگی جۆزەردان بە فێڵ کوشتوویانە.(١٤) (*) لەڕاستی مەسەلە و پێوەندی گریمانیی ئەو لە گەڵ ئاڵوگۆڕی ناوچە، ئاگاداری و بەڵگەیەکی

---

(*)-وادیارە ئاغای بەیات لە چوونی سمکۆ بۆ عیراق زۆر ئاگادار نیە، باوەڕ ناکەم سمکۆ قەت لای شێخ ئەحمەدی بارزانی بوو بێتە پەنابەر. وەک لە بەڵگەکان دەر دەکەوێ سمکۆ ساڵی ١٩٢٦ لە تورکیا بوە. گەڕانەوەشی بۆئێران ساڵی ١٩٣٠ بوە کە لە شاری شنۆ داویان بۆ داناوەتەوە و بە فێڵ و نامەردانە کوشتوویانە.

باوەڕ پێکراو لە دەست دانیە. بەڵام وەک ئەو دەم باسدەکرا، تورکەکان لە بەرانبەر ئەوە دا کە لایان وابوو ئێران پشتیوانی لە خالیداغا دەکا، سمکۆیان ناردۆتەوە ئێران. ڕۆژنامەی حبل المتین نووسی: «..ئێستاکە تورکەکان بۆ سەرکوتکردنی کوردەکانی خۆیان کەوتوونەتە کار، سۆڤیێتی یەکان لە لاوەرا پڕوپاگاندەیان کردوە و بە تورکانیان گوتوە، کە ئێران وەک خالیداغا و هیتر بە چەک و قۆرخانە و خەڵک یارمەتی بە کوردە یاخیەکانی تورک دەکات. گویا تورکی ساکاریش بڕوایان کردوە، لە لایەک بە کاوێژکردنەوەی قسەی قۆڕی ڕۆژنامەکانی بێخەبەر کە ئێمە باسی ناکەین ئەوەکو میللەتەکانی تورک وئێران دڵیان بێشێ، ولەلایەکی ترکۆیابە خەیاڵی تۆڵە ئەستاندنەوە سمایلاغای سمکۆیان کە بۆ ڕۆژێکی ئاوا پەنادا بوو، بە تەواوی ساز و پەرداخیان کردوە و هانیان داوە بۆ سنوورەکانی ئێران::::» کەکۆڕا. (١٥)

لەو تاریخەوە ڕۆژنامەکانی ئێران کەوتنە ژێرکۆنترۆڵی دەوڵەتەوە. بە پێچەوانەی قۆناخەکانی پێشوو، دەستیان کرد بە بڵاو کردنەوەی ڕاپۆرت و دەنگوباس لە بارەی گۆڕانکاریەکانی سەرسنوور.وادیتە بەرچاو کاربەدەستانی دەوڵەتیی ئاخرەکەی هاتبوونە سەر ئەوە کە بە سەرنجدانی دەنگۆ لە بارەی ئەم گۆڕانکاریانە، و پێویستیی هەڵوێست گرتن لە بەرانبەری ئەودا، ڕێبازێکی ڕوونتریان گرتە بەر. لە پێشدابە نەقڵی قەول لە هەواڵدەری ڕۆیتەر هێندێ ڕاپۆرتیان لە بارەی شەری توند بڵاو کردەوە. پاشان سەبارەت بەڕابردووی بزووتنەوەکانی کوردو نەخشی ئیحسان نوری پاشا ئاگاداریان نیشاندا. دەنگۆ لە بارەی پەلاماری خاکی ئێران لە لایەن هێزەکانی تورک و ئاڵۆزی پێوەندی دوو وڵاتەوە، وەها پەرەی گرت کە لە ٢٦ی گەلاوێژی ١٣٠٩وەزارەتی دەرەوەناچاربوولەبەیاننامەیەکی ڕەسمیدابەلاماری لەشکری تورک بۆ سەرخاکی ئێران وە درۆ خاتەوە، و بە ڕۆژنامەکانیش ڕابگەیێنێ کە لە کاتی بڵاو کردنەوەی خەبەری واگرنگدا، پێشەکی لە ڕاست و درۆی خەبەرەکە دڵنیابن.

لە ڕاپۆرتە بڵاوەکانی کە بە نەقڵ لە هەواڵدەرەکانی هەندەران سەبارەت بە گۆڕانکاریەکانی ئاوبراو بڵاو بوونەوە، وادەر دەکەوێ کە تورکەکان دەیانویست

هەرتک ولات بتوانن لە کاتی پێویست دا بۆ عەمەلیاتی دژی کوردەکان لەشکر بۆ خاکی یەکتر بێنن. بەڵگەی کاربەدەستانی تورک ئەوە بوو کە:«... هەرچەند لەم دوییانەدا دەوڵەتی ئێران لە لای خۆیەوە هەنگاوی گرنگی دژی دەستەی ئەشراری کورد هاویشتوە، بەلام دەوڵەتی ئێران لە ناوچەکانی سنووری تورکیا هێزی جەنگیی تەواوی نیە.»(١٦)لەم راپۆرتانەدا لە بارەی رێککەوتنی ئێران و تورک، سەبارەت بە گۆڕینەوەی هێندێ بەشی خاکی سنووری دوو ولات و تێپەڕبوونی لەشکری تورک بە خاکی ئێراندا و هێندێ شتی ئەوتۆ، رەنگیان داوە کە هەموو جارێ رۆژنامەکانی ئێران وەدرۆیان دەخستەوە. لە گەڵ ئەوەش لە نێوە راستی خەرمانانی ئەو ساڵەدا، زۆرلەو شتانەی لە ماوەی دوو مانگدا باسیان دەکرا و وەدرۆ دەخرانەوە، وەراست گەڕان.

## کۆتایی ئاژاوە

لە نێوەڕاستی خەرمانانی ١٣٠٩(١٩٣٠)هاوکات لە گەڵ هێرشی هێزەکانی تورک بۆ سەر شوێنی سەر هەڵداوان لە چەند لاوە، لە کاتێکا هێزەکانی کورد دەیانویست وەک ساڵانی پێشوو هێدی هێدی لەشکری تورک بکێشنە نێوە ڕاستی ئارارات و هیلاکیان بکەن ولە نێو بەردەلانی بە ترس و خڕ و دۆڵی قوڵدا بلاو و نابوتیان بکەن... لە پشتەوەرا بە پێچەوانەی چاوە ڕوانی، لە سنووری ئێرانەوە، لە پێشدا دەنگی تۆپ و پاشان دەسترێژی پیادە و شەست تیران بەرز بۆوە .(١٧) لە سەرە تاوە کوردەکان وایانزانی دیسان بە هەڵە لە گەڵ هێزەکانی ئێران تەقە سازبوە. بەلام لە ماوەیەکی کورت دا بۆیان دەرکەوت کە لە گەڵ هێزەکانی تورک بەرەو ڕوو بوون. تورکەکان بە ڕێک کەوتن لە گەڵ هێزەکانی ئێرانی، لە لای بولاغباشی یەوە بۆلای بەرزاییەکانی قۆزلو، و ئایوبێگ پێشڕەویان کرد. لە ڕاستیدا تورکەکان«...پشتەوەی کوردەکان و شوێنی پاشە کشەی ئەوانیان گرتبوو، و بە هێرشهێنانی لە سەریەک توانیان لوتکەی ئاگری بچوک بگرن، و تابناری باکور و باکوری ڕۆژهەلات نیزیکەی فرسەخێک بەرینی و سێ فرسەخ درێژی بشکلی

زوزمنەقەیی لە خاکی دەوڵەتی ئێران داگیر بکەن و لە ناوچەکانی ئایوبێگ ، شیلە، تورتک و سوڵتان تەپە، کە بەشێک بوون لە خاکی ئێران، پاسگای کوردانی و گروهانی یان دامەزراند.» (١٨)

پاش نیزیکەی بیست ڕۆژ شەڕی توند، بەرەبەرەکانی کوردەکانی ئارارات تێک شکا، هێزەکانی ڕاپەڕیو بڵاوبوون. هێزەکانی تورک بە سەر تەواوی ناوچە و بەشێکیش لە خاکی ئێراندا زاڵ بوون. پاش شکانی کوردەکانی ئارارات لە ئاخری خەرمانانی ١٣٠٩(١٩٣٠)خوسرەوبەگ باڵیۆزی تازەی تورکیا بۆ پێشکێش کردنی ئیعتبارنامەکانی چوەکن رەزاشا و هەستی بەرزی برایەتی و دۆستانەی مستەفاکەماڵی پێڕاگەیاند. رەزاشا لە وەڵامدا هیواداری دەربڕی کە پێوەندی برایانەی دوو وڵاتی دۆست و دراوسێ لە ڕابردوو پتەوتربێ. عیسمەت ئینۆنۆش لە کۆبوونەوەی مەجلیسی بەرزی تورکیادا، باسی نەخشی دراوسێکانی تورکیای کرد کە بە « لە بەر چاوگرتنی راستیی پەیمانەکانی مەوجود لە سەرکوتکردنی کوردەکاندا هاوکار یان کردوە».(١٩)پاش ماوەیەک وێستان لە درێژەی کاری کومیسیۆنی سنوور، کە لە سەرەتای گەلاوێژدا بە سەرۆکایەتی موزەفەرخانی ئەعلەم(سەردارئینتصار) پێکهات بوو، وپاش چەند ڕۆژ سەبارەت بە ڕێکەوت لە گەڵ ئەویەری گەرمی شەڕەکانی ئارارات، لە تێکۆشان وێستابوو، ڕاپۆرت بڵاوکرانەوە.(٢٠)

## سەرەتای گیر وگرفتەکانی ئێران

بەڵام بە سەرنجدانی گۆڕانکاریەکانی دوایی، نەک هەر وەک چاوەروان دەکرا لە پێوەندی نێوان دوو وڵاتدا پێشکەوتنێک نەبوو، بەڵکوو ئاستەنگی تازەش سەریان هەڵدا. تورکەکان کە بە سەر ڕاپەڕینی ئارارات دا سەرکەوتبوون، گۆڕانکاریەکانی ناوچەیان بە وردی دەخستە بەر چاو، و هێشتا سەبارەت بە تێکۆشانی کریمانیی نەیارەکانیان دڵە ڕاوکەیان بوو. یەکێ لە پیاوە تێکۆشەرەکانیان ئیسماعیل حەقی کۆنسولی پێشووی تورکیا لە ورمێ ، کە لە زستانی ساڵی ١٣٠٩لە کاتێکا

چاوەروان بوو دەوڵەتی ئێران کۆنسولگەری ئەو لە مەشهەد قەبوڵ بکا، لە تەورێز خەریکی تێکۆشانی جاسوسی بوو. یەک لە کارەکانی ئەو ناردنی دوو کەس بوو، بۆ بەغدا و موسڵ تا لە ڕوانگەی کاربەدەستانی ئینگلیزی سەبارەت بە وتووێژی ئێران و تورکیا لە بارەی مەسەلەکانی سنوور ئاگاداری وە دەست بێنێ. جگە لەوە گۆیا قاوبوو کە کوردەکان لە کەرکوک و موسڵ ئامادە دەبن لە ژێرچاوەدێری کولەنێل ئێدمۆندزی ئینگلیز لە بەهاری داهاتوودا، واتە بەهاری ساڵی ۱۳۱۰تورکیا پەلامار بدەن. ناوبراو ئەوەشی لە ئەستۆبوو کە لەم بوارەش بکۆڵێتەوە.(۲۱)

ئەم نیگەرانیە لە سەرەستێکی کە تەواو ڕوون نیە چەندە ڕاستە و چەندەشی بیانوو گرتنە، لە پێشدا بە شێوەی ڕەخنەی توندی دەوڵەتی تورکیا، سەبارەت بە تێکۆشانی ئەرمەنیەکان لە ئازەربایجان، خۆی نیشاندا. وەزارەتی دەرەوەی ئێران لە نێوەی گەلاڕێزانی ۱۳۰۹ بە وەزارەتی نێوخۆی ڕاگەیاند کە باڵیۆزخانەی تورکیا لە وەی کە:«..کومیتەی داشناکسیۆنی ئەرمەنی دانیشتووی تەورێزلە هیچ یارمەتیەکی نهێنی بە کوردەکانی ئاگری داغ دەست ناگێڕێتەوە و پارە و چەک وئازوخەیان بۆ دەنێرێ... » سکالای هەیە.(۲۲)) وەزارەتی نێوخۆ لە گەڵ پێراگەیاندنی بابەتی سەرو بە عەلی مەنسوری والی ئازەربایجان و پێداگرتن لە سەرلێکۆڵینەوەی پێویست لەم کارە، فەرمانی دایە:«... لەم جۆرە خۆپێشاندانی داشناکەکان بە تەواوی پێشگری بکرێ و ئاگایان لێ بێت کە لە لایەن ئەرمەنیانەوە، نە بەئاشکراو نە بە نهێنی هیچ یارمەتیەک بە کوردان نەکرێ. لە حاشیەی نامەکەش رستەیەک بە ناوی « حەزرەتی ئەشرەف» فەرموویەتی : گۆیا وەزارەتی دەرەوەش لەم بارەوە بۆنێوەی نووسیوە و شێرزەیی ئەم وەزعەی وە بیرهێناونەوە و دیارە تەسدیقی دەکەی کە مەسەلەکە گرنگ و شایانی سەرنج و ئاگاداریی تایبەتیە. ئێوەش کە تەواو بێلایەنن، نابێ ڕێگابدەن کە بۆ هیچ کەس دەرفەتی هێندێ فێڵ و دنەدان و کردەوەی چاوەروان نەکراو بمێنێتەوە و بیانوویان بکەوێتە دەست»..... بەرپەرچدانەوەی عەلی مەنسور توند و ئاشکرابوو. ئەو بە ئاماژە بە ڕابردووی هەنگاوەکانی خۆی لەم بارەوە، وەبیری خستەوە : «...ڕاگەیاندنی

بالیۆزخانی تورکیا، بە هەڵە بێ، یان بە ئانقەست، بە تەواوی بێجێی یە.... ئەگەر چاوە دێری تەواوی مەعمورەکان و هێزەکانی ئێرانی نەبوایە، تورکەکان نەیاندەتوانی بە لەشکرێکی وا کەم ئاژاوەی ئاگری داغ دابمرکێننەوە. ئاژاوەی ناوبراویش نیزیکەی دوو مانگە کۆتایی پێهاتوە، دیار نیە چەک و جبەخانە لە تەورێزەوە بۆ کوێ و بۆکێ دەنێردرێت، و عەمباری ئەو چەک و قۆرخانە خەیاڵیە لە کوێ یە؟

ئەوەش ڕاست لە کاتێکا کە:«...دەوڵەتی ئێران هۆزەکانی کوردی جەلالی و عەشیرەتەکانی دیکەی مەڵبەندی ماکۆ چەک دەکات. دەکرێ بیرلەوە بکرێتەوە کە لە تەورێزەوە ناوەندی ئەیالەتی ئازەربایجان چەک بۆ ناوچەکانی ناوبراو بنێردرێ؟» مەنسورلای وابوو ئەم قسانە نەک هەر درۆن، بەڵکوو سووکایەتیشن بە ئابرووی دەوڵەت ، دەبێ ڕەخنە لە باڵیۆزی تورکیا بگیرێ.... پاش ماوەیەک کاتێ مەنسور لە ئەیالەتی ئازەربایجان وەلانرا و لە کابینەی تازەی مخبرالسلطنەدا بوو بە وەزیری نێوخۆ، تەیمورتاش لە نامەیەکدا بۆ وەزارەتی خۆ جێیی لە گەڵ ئاماژە بۆ هاوکاری ئەم دواییەی کورد و ئەرمەنی لە ناوچەدا، وەبیری هێناوە کە:«..تائێستا زیاتر مەسەلەی کورد سەرنجی دراوەتێ و عەمەلیاتی ئەوان لە ژێر چاوەدێری دابوە سەبارەت بە فیرقەی داشناکسیۆن و هەنگاوی ئەرمەنیەکان بۆ یەکگرتنی تێکۆشان لە گەڵ کوردەکان سەرنجی نە دراوەتێ، بۆیە داوالە وەزارەتی نێوخۆ دەکابۆ لە ژێرچاوە دێری ڕاگرتنی تەشکیلاتی ناو براو، هەنگاوی گرنگ باوێژرێن. »(٢٣)

دیارە هەر وەک لە نامەی تەیمورتاش دا، ڕەنگی دابۆوە، بە کردەوەش کار بەدەستانی دەوڵەتی زیاتر سەرنجی کوردەکانیان دەدا، مەسەلەی سەرەکیش هەرکوردەکان بوون، و مەسەلەی ئەرمەنی لە بیانوو زیاتر نە بوو. ڕاستیەکەی ئەوەیە دوای ئەو ڕێبازەی کە کاربەدەستانی لەشکری ئێران بۆ هاسانکردنی لەشکرکێشانی تورکەکان بۆ سەر ڕاپەرینی ئارارات، نەک هەرکومان باشیی پێشووی عەشیرەتگەلی کوردیان لە ئاست ئێران لە دەست دا، بەڵکوو وردە وردە لە گەڵ لافاوی سەربزێوی وباخیبوونی بلاوی هۆزەکانیش بەرەو ڕوو بوون.

تورکەکانیش جگە لە سەرکوتکردنی تەواوی کوردەکان ئامانجێکی دیکەیان نەبوو. مەسەلەی کوردەکانی ئێرانیان سەر لە نوێ بە شێلگیری زیاتر هێناگۆڕێ. مەسەلەی ئەم گۆڕانکاریە وەها پەرەی گرت، کە ئاخرەکەی لە سەرەتای مانگی ڕێبەندانی ١٣٠٩ بالیۆزخانەی ئێران لە تورکیا ناچار بووە «دەنگوباسی کۆبوونەوەی عەشیرەتان و هێزی کوردان لە سەر سنوور و گێڕانەوەی ئیحسان نوری» وەدرۆ بخاتەوە.(٢٤) بەلام سەرەڕای وەدرۆ خستنەوەی ڕەسمی دەوڵەت، هەرا و ئاژاوە نانەوەی کوردەکانی سەرووی ڕۆژئاوای ئێران ڕاست بوو.

## عەمەلیاتی لەشکر

پایزی ١٣٠٩(١٩٣٠)جگە لە هێزی جەلایەکانی ئێران، دەستەیەکی بەرچاویش لە کوردە سەرهەڵداوەکانی ئارارات وەک: فرزندە ، ئەیوباغا، برایماغا،(برۆحسکی تێللۆ) بە تایفە و مەڕ ومالاتیانەوە لە گەڵ ئیحسان نوری پەنایان بۆ ئێران هێنا و بە گوێرەی یاسای پەنابەری لە سنوورەوە ڕایانگوێزتن بۆ ناوچەکانی نێو ئازەربایجان، وەک: قەراجەداغ و ئەردەوێل و مشکین و خەڵخاڵ و دەور و بەری خۆیە. بە گوێرەی نووسراوەی سەر لەشکرمەحمودخانی ئەمین:«...ئەم گواستنەوەی عێلات هەر چەندە پێویست بوو، بەلام بە داخەوە هێندێ لە مەعموورە چاو چنۆکەکان دەرفەتیان هێنا و دەست درێژیان بۆ ماڵ و گیانی عەشیرەتەکان کرد. لە بەرئەوە ژمارەیەکی زۆر لە وان، لێقەوماو و یاخی بۆ ناوچەی سنوور ڕایان کرد و لە ژێر فەرماندەیی برۆحسکی تێللۆ و پیاوەکانی لە دەوڵەت هەڵگەڕانەوە.» (٢٥)

لە گەڵ شپرزەیی بار و دۆخ لە ئاخری زستانی ١٣٠٩ سەرتیپ موقەدەم لە فەرماندەیی لەشکری سەرووی ڕۆژئاوا وەلانرا و سەرتیپ محەممەدخانی موحتەشەمی لە جێگای ئەو دانرا. لە سەرەتاوە هێزێک دەکرێتە مەعمور کە هێزەکانی فرزندە و ئەیوباغا و برایماغا و سەرهەڵداوەکانی تری پێشووی ئارارات کە لە قشلاغی ئاخگۆل جێگیربببوون، پەلاماربدەن. هێزی ناوبراو لە کاتێکا خەریکبوو بەشەو بەرزاییەکانی دەور وبەری ئاخگۆل بگرێ، خۆی کەوتە بەر پەلامار

و ناچار بوو بکشێتەوە. بەڵام ڕۆژی دوایی بە هاتنی هێزێکی زیاترکوردەکان بڵاو بوون. هێزەکانی دەوڵەتی لە ڕۆژئاوای ناوچە چیای بزنیان گرت و پێشیان بە کۆچباری تایفەی بلخیکانلویان گرت، کە دەیویست بۆ تورکیابچێ. (٢٦)

لە ڕاپۆرتەکانی مەوجود دەردەکەوێ سەرەڕای ئیعترازی توندی تورکەکان کە سەبارەت بە ئالۆزیەکانی دوایی سنوور دەریان بڕیبوو، هێرشی لەشکر بو سەر کوتکردنی کوردەکان توندترلە پێشوو درێژەی کێشا. پاش کوشتنی سەرکورد حەسەنی قەویدل، کەفیلی فەرماندەی گوردانی سەر بە خۆی شمارە دووی هێزی ماکۆ لە ٨ی پوشپەری ١٣١٠لە « شەردا لە گەڵ ئەشراری ئارارات» هێزەکانی ماکۆ بە فەرماندیی سەرهەنگ کەلبەلیخانی نەخچەوان لە قەرەعەینی(کانی رەش)، هێزێکی بۆ سەرکوتکردنی تایفەی حاجی سمایلی نادری نارد کە لە گەڵ دەستەیەک لە سەر هەڵداوانی ئارارات لە بەرزاییەکانی شێخ جێگیر ببوو. بەیانی ڕۆژی ١٧ی پوشپەر هێرشی لەشکر دەستی پێکرد و پاش شەڕ و لێکدانێک، هێزەکانی سەر هەڵداوان بەرزاییەکانی شێخیان بەجێهێشت و بۆ لای چیاکانی باشور و خوارووی ڕۆژئاوای ئاور پاشە کشەیان کرد. هێزی لەشکرلە درێژەی عەمەلیاتەکەی دابە سەربەرزاییەکانی باکور و سەروی ڕۆژهەڵاتی ئاوردا زاڵ بوو، و لە بەرزاییەکانی قشلاغ شوێنی سەر هەڵداوەکانیان لە یەکماڵە پەلاماردا و دوای پاشەکشەی کوردەکان بۆ خاکی تورکیا، بۆ قەرەعەینی(کانی رەش) گەڕانەوە.(٢٧)

لە شەڕێکی دیکەی نێوان لەشکر و کوردەکاندا لە نیوەی جۆزەردان هێزەکانی دەوڵەتی ناوچەی زێوەی خوارو و بەرزاییەکانی دومانلویان پەلاماردا. لەو شەڕەدا ئەیوباغا کوژرا و کوردەکان بۆ لای قرخلار پاشەکشەیان کرد. پاش ماوەیەک لە هەوڵی گەلاوێژی ئەو ساڵەدا، هێزی ماکۆ گروهانێک سەرباز بۆ لێدانی کوردەکان کە لە بەرزاییەکانی ئاقداش جێگیر ببوون لە کانی رەش دادەمەزرێنێ. ئەو هێزە لە تەپکەکانی خوارووی ئۆروج کەندی لە گەڵ کوردەکان توشی شەڕ دەبێ و تا دەوری ئاقداش دەچێتە پێش. لە گەڵ داهاتنی ئەو هێزەکانی دەوڵەتی دەگەڕێنەوە بۆ

ئۆروج کەندی و ڕۆژی دوایە کە درێژە بە پێشڕەوی دەدەن، دەبینن کوردەکان باریان کردوە بۆ لای تاش کەند و قەراجەداغ. هێزەکانی دەوڵەتی وەدوایان دەکەون ولە بەرزاییەکانی ڕۆژهەڵاتی ساری ئۆجاق توشی شەڕ دەبن. لە کوردەکان برۆحسکی تیللۆ، و لە نیزامیەکانیش سەرهەنگ کەلبەلیخانی نەخچەوان دەکوژرێن. نازانین داخوا رووسەکان کوشتنی سەرهەنگ کەلبەلیخانیان پیرۆز بایی کردوە، یان نا. بەڵام.. تورکەکان بە بۆنەی کوژرانی برۆحسکی تیللۆ، و ئەم سەرکەوتنە پیرۆزباییان لە ئەفسەرانی ئێرانی کردبوو...»(٢٨)

لە گەلاوێژی ساڵی ١٣١٠(١٩٣٠)کاتێ کە سەرهەنگ مەحمودخانی ئەمین لە جێگای کەلبەلیخان بوو بە فەرماندەی تیپی هەوەڵی لەشکری سەرووی رۆژئاوا، ئالۆزی تەواوی ناوچەی داگرتبوو. بەشێک لە هێزی ماکۆ بە فەرماندەیی سەرهەنگ هوشمند ئەفشار لە قەرە ئاوێنە جێگیرببوو. بەشێکی دیکە بە فەرماندەیی نایب سەرهەنگ هاشمی لە دانالو مۆڵ درابوو. دەستەیەکی چریکی خۆجێیی(لە کوردەکانی بەشێک لە میلان و یا تایفەی تورک زمان) لە دزە و دانالو وبازرگان و ئاواجیق و سمکناوا و قەرەقۆیون، بەرلە وەی لە بەرانبەرئەشراردا چالاک بن، زیاتر ڕەعیەت و مسکین یان زەحمەت دەدا. بە گوێرەی نووسراوەی مەحمودخانی ئەمین، لەو شەڕی بلاو و بێ نەتیجانەی کە لە ساڵەکانی دوایدا سەریان هەڵدا، کەلێک زیاترلە قازانجی هیچ و پوچ، زیان بە هێزەکانی دەوڵەتی و خەڵک گەیشتبوو. جگە لەوە«... خەسارەت و شەرارەتی ئەشرار لە بەر سەر نەکەوتنی لەشکر رۆژ بە ڕۆژ زیادی دەکرد و بە تاڵان و کوشتار لە جەبهەکانی شەڕ زیانی ماڵی و گیانی وە خەڵک دەکەوت.»(٢٩)

رادیتە بەر چاو کە سەرهەنگ ئەمین بروای بە سیاسەتی ڕاکێشانی خۆشەویستی سەرۆکانی کورد هەبوە، ناوبراو پاش ئەوەی دەگاتە ناوچە و لە بار و دۆخ دەکۆڵێتەوە، دەگاتە ئەو نەتیجەیە کە:«... هەرەکەتی شەڕکەرانە دژی کوردەکانی ئەم ناوچەیە لە سەتاسەت سەرکەوتنی حکوومەتی تورک هاسان دەکا و لە ئاکامدا ئەوان بە ئامانجی سیاسی خۆیان دەگەن و لەشکری سەرووی

ڕۆژئاواش بە دانی هەزاران زیانی مادی و مەعنەوی دەکەوێتە زەحمەت. جگە لەو هەموو خەسارە لە ڕادە بەدەرە تیزیکەی بیست فرسەنگ خاکی سەر سنووریش وێران و چۆڵ لە حەشیمەت دەبێ.»(٣٠) بەو حاڵەش هێشتا هەر لە سەر ئەوباوەڕە بوو کە ڕەنگە بتوانێ لە ڕێگای بێ شەڕ و بەربەرەکانی، کوردە ڕاپەڕیوەکان ڕازی بکا کە لە لێوارەکانی سنوور بۆ ناوچەکانی نێوتری ئازەربایجان بار بکرێن، و تورکەکانیش مەجبور بکرێن خەتی داگیرکراوی سنوور بە جێ بێڵن.

لە خەرمانانی١٣١٠ سەرهەنگ ئەمین لە دەور و بەری دانالو لە گەڵ هێندێ سەرۆکانی کورد، وەک کورەکانی برۆحسکی تێللۆ، عبدوڵا خەلەف فتۆ، شێخ رسول و سەیدرەسوڵ لە گەڵ دەستەی خۆیان کە لە سەرووی ڕۆژ هەڵاتی ماکۆ لە دەور و بەری یخلقان و قەلاجوغ جێگیرببوون، وتووێژی دەستپێکرد. ناو براو تەنانەت ئامادە بوو، بۆ ڕاکێشانی گومانچاکی ئەوان ڕێگابدا محۆیەکر و ئیبراهیم حوسێنی کە لە گەڵ تایفە و دەستەی خۆیان لە مشکین و قەراجەداغ نشتە جێ کرا بوون، بێنەوە نێو ئەوان. لە ئەنجامدا کوردەکان ئامادە بوون بار بکەن و تا ڕەزبەری ئەو ساڵە لە گوندەکانی مخنس و طلمخان لە ڕۆژ هەڵاتی ماکۆ و ئاغ بلاغ و کروکەندی و قزلجە و قەرەئاغاج لە خوار و و خوارووی ڕۆژئاوای قەرەئایینە نشتەجێ بوون.

سەیرئەوەیە کە تورکەکان تەنانەت بە وەندە نەرمی و ئاور دانەوەش ڕازی نەبوون کە بۆ ڕێکوپێکی و کپکردنەوەی یەکجاری کێشەکە پێویست بوو. یەک لە سەفەرەکانی حسامەدین بەگ، وابەستەی پێشووی باڵیۆزخانەی تورکیا لەم ڕۆژانەدا بۆ ئازەربایجان، و بۆ وە دەست هێنانی ئاگاداری لەبار و دۆخی کوردەکان و ڕەفتاری دەوڵەت لە گەڵ ئەوان بوو. وادیارە ناوبراو لە هاتنی شێخ قادر بۆ ئێران و دەرەتانی کەلک وەرگرتنی دەوڵەت لە بوونی شێخ قادر بۆ ڕاکێشان و دابینکردن و نشتەجێکردنی دوو بارەی کوردەکان لە ئاغ گۆل (قشلاغی سنووری جەلالیەکان) نیگەران بوە. بەڵام بە سەفەری ڕەزاشابۆ ئازەربایجان و ئەو فەرمانانەی دەریکردن، تورک نیگەرانیان نەما.

سەرهەنگ مەحمودخانی ئەمین لە خۆیە چوە کن ڕەزاشا و لە راپۆرتێکی درێژدا بار و دۆخی ناوچەی پێراگەیاند. سەرهەنگ ئەمین لە سەرئەو باوەرە بوو، هەر وەک تێکۆشانی سەرکەوتووی ئەو بۆ بارکردنی کوردەکان و دوور خستنەوەیان لە ناوچەکانی سنوور نیشانی داوە، هێشتا دەکرێ بە چارەسەرکردنی هێمنانەی ئەم مەسەلەیە هیوا داربی. بەلام رەزاشا بیر و بۆ چوونێکی دیکەی هەبوو. ئەمین دەنووسێ:«... هەر چەند دەکرێ بە سیاسەتێکی باش ئەشرار دەستەمۆ بکرێن و بۆ هەمیشە و بە خۆشی لەم ناوچەیە دووربکەونەوە و ئەم ئاژاوەیەش بکوژێتەوە، بەلام چونکە ئیرادەی شایانە روحی بە فیدای بێ، لە سەر قەلاچۆکردنی ئەوانە، بە هەر نرخێک بێ پێویستە ئەنجام بدرێ....»(٣١) ئەو نرخەی کە درا، ڕەنگە لە روانگەی هێندێ کاربەدەستانی لەشکری و مەدەنی و شەخسی شا -ش، نرخێکی وای نەبێ، لە گومان باشی کوردان و بروایان بە بەڵێن و وادەی کاربەدەستانی دەوڵەتی، کەلکی خەراپیان وەرگرت و بە پێچەوانەی سوننەت و دابی عێلی، لە ناوچەکانی سەر سنوور کە لە رۆژی دژوار و تەنگانەدا، تاقە پەناگا و پەسیویان بوو، دوور کەوتنەوە.

## سەرکوتکردنی یەکجاری

عەمەلیاتی سەرکوتکردنی یەکجاری کوردەکان لە سەرخاپاندنی زیاترلە پێشوو، و خافلکردنی تەواوی ئەوان نەخشەی کێشرا. هەوەڵین هەنگاویش رەزاشا هاویشتی. لە هەمان سەفەری خۆیەدا قەبوڵی کرد دوو کەس لە نوێنەرانی ئەشرار بۆ ڕاگەیاندنی عەبدایەتی بچنەلای. «ئەوان سەر زارەکی کەوتنە بەر مەرحەمەتی شا..» ڕاپەراندنی قۆناخی دواییش سەرهەنگ مەحمودخان وەستۆی خۆی گرت. پاش نیزیکەی دوو مانگ بەر نامە رێژی، پاش ئەوەی کوردەکان لە شکڵی دەستەی جیاواز و بڵاو لە ناوچەکانی سنوور هاتنە دەر و دەستەکانی چالاکی سنووری قەرەئاوێنە، واتا کەسانی شێخ تاهیر لە ئاقبلاغ، دەستەی تاهیراغا لە قەرەئاغاج، دەستەی فرزندە لە مخور، کەسانی فارس لە کورد کەندی، دەستەی

تاهیراغا(کوری وسوعەبداڵ) وعەلی هەمزە لە سەدر و کەسانی سولەیمانی (برای حاجی کولشەن) لە سیلۆ نیشتە جێ بوون و دەستەکانی بەری ڕۆژهەڵاتیش لە قشلاغەکانی مەخنەس و تەلخان جێگیر بوون و بەمجۆرە بوون بە ئامانجی نە بزووتووی هەرتک ستونی لەشکر و نەخشەی قەلاچۆکردنی یەکجاریان گەلاڵە کرا .(٣٢)

لە شەوی ١٠ی خەزەلوەری ١٣١٠، هاوکات لە گەل زنجیرە عەمەلیاتێک لە ناوچە جیاوازەکانی دیکە، بەشی سەرەکی هێزی نیزامی لە دوو ستوندا، بە فەرماندەیی سەرهەنگ میرحوسێنی هاشمی و سەرهەنگ هوشمندی ئەفشار، بە شەو بەرزاییەکانی مەخنەس ـــ یان گرت و ڕۆژی دوایی کوردەکانیان پەلاماردا . قەرار وابوو کە:«... گوندەکانیان بە هۆی بەشەکانی دیاریکراو گەمارۆ بدرێن و تا نێوەڕۆی ئەم ڕۆژە هەموویان زیندو و یامردوو بگیرێن و قەلاچۆ بکرێن.»٣٣) هەر چەند لە بەر ڕەوینەوەی ئەسپی کوردەکان کە شەو و ڕۆژ لە دەورەی ئاوایی دەلەوەڕان، خافڵگیرییەکە تەواو بە ڕێوە نە چوو، و لە گەڵ نیزیکبوونەوەی هێزی نیزامی تەقە دەستپێکرا . بەلام لە شەڕێکی توندا نیزامیەکان بە دانی خەسارێکی قورس و کوژرانی سەرگورد حەسەنی بەنی سەدر و سەروان عەزیزولای بەدرخانی، شوێنی ناوبراویان گرت،(٣٤)

هەرچەند هێندێ لە کوردەکان توانیان ڕابکەن، بەلام ئەوە ئاخرین زنجیرە عەمەلیاتێکی گرنگی نیزامی بوو کە بۆ زاڵبوونی هێزی ئەرتەشی بە سەر سنووری سەرووی ڕۆژئاوای ئێراندا بەڕێوە چوو. وا دیارە کاری خۆشی کردوە. چونکە پاش ماوەیەک لە ئاخری سەرماوەزدا، توفیق روشدی بەگ خۆی هاتە تاران و لە نێو هیواداریەکانی زۆر کە ڕایگەیاندن، یەکیشیان ئەوە بوو کە«... مەسەلەکانی سنوور بە شێوەیەکی باش کە بەرژەوەندی ئێران و تورکیا بە تەواوی دابین کرابێ و چارەسەربکرێ.»(٣٥)

دوای چەند ڕۆژ دیدار و وتوێژ و میوانداری، روشدی بەگ لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەگەریدا ڕایگەیاند:« مەسەلەی دیاریکردنی سنوور چاری کراوە و ئێترهیچ

مەسەلەیەکی ناله بار له گۆڕێدا نەماوە و له مەو بە دوا دەبێ له سەر مەسەلەکانی له بار باس و کاربکرێ..» یەک لەو مەسەله (نالەبارانە) مەسەلەی کوردەکان بوو کە توفیق روشدی له وەڵامی پرسیاری هەواڵدەرێکی ئەڵمانی داگوتی «... ئیتر بە بەشێک له مێژوو حیساب دەکرێ. چونکە کێشەکە بە یارمەتی و هاوکاری تەواوی دوو دەوڵەتەکە بە تەواوی چارە سەرکراوە و ئیتر جێگای نیگەرانی نەماوە.(٣٦)

له راگەیاندنی رەسمی دەوڵەت دا له بواری دیاریکردنی سنوور، له١٢/١١/١٣١٠دا، واتە چەند رۆژ دوای گەرانەوەی رشدی بەگ بڵاو کرایەوە گوتراوە:«... بریار وایە دیاریکردنی سنوور هەر له سەر هەمان بنەمایە جێ بەجێ بکرێ کە پێش ٣ساڵ له نێوان فروغی و رشدی بەگ له ئانکارا له سەری رێک کەوتبوون کە:«...له ناوچەی ئاگری داغ پارچە عەرزێک له چیای ناوبراو بدرێ بە دەوڵەتی تورکیا و له بەرانبەر ئەوەدا له ناوچەی بارژ دەوڵەتی تورکیا هێندێ عەرز بدا بە ئێران. هەر وەها له ناوچەی قەتوریش کە چەند ساڵ بوو له نێوان ئەم دوو وڵاتەدا ناکۆکی له سەربوو، و سنووری دیاری نەکرابوو، دەوڵەتی تورکیا ئامادە بوو هێندێ له عەرزی جێگای ناکۆکی بدا بە ئێران وخەتی سنووریش له وێ دیاری بکرێ و ناتەبایی سنووری دو وڵات بە تەواوی له بەین بچێ. (*)

---

(*)- بە درێژایی مێژوو حکوومەتانی داگیرکەری کوردستان کێشەی نێوانی خۆیان لەسەر کوشتاری خەڵکی کورد ودارو بەشکردنی زێد ونیشتمان وعەرزی کورد چارسەرکردوە. سەیرکردنی رووداوە باسکراوەکانی ئەم نووسراوەیە روونی کردەوە کە دووحکوومەتی تورک وئێران پاش سەرکوتکردنی کوردەکان بەهاوکاری یەکتر،چۆن کێشەی نێوخۆیان بە بەخشینی خاکی کورد بەیەکتر چاردەکەن. نموونەی هەرەتازەشی پەیمانی شومی ئەلجەزایری نێوان سەدام حوسێن وشای ئێران بوو، کە بۆ له بەینبردنی بزووتنەوەی ١٤ ساڵەی کورد وازیان له ناتەبایی قوڵی خۆیان هێنا و بزووتنەوەی کوردیان تووشی هەرەس هێنان کرد. بەڵام ئەو هەموو ئەزموون و خەیانەتەی حکوومەتانی داگیر کەری کوردستان بۆ رێبەرانی ئێستای بزووتنەوەی کورد نە بۆتە دەرس و هەر وا بە فەرمان و پلانی دوژمنانی کورد و بۆ بەرژەوەندی کاتی و تەسکی حیزبایەتی کەوتوونەتە داوی دوژمنانی له مێژینەی نەتەوەی خۆیان و بە هاندانی ئەوان بە ناوی (کوردایەتی و

ئاخرەکەی کومیسیۆنی دیاریکردنی سنووری ئێران و تورکیاپاش ماوەیەک وێستان لە ئاخری ساڵی ١٣١١ کاری خۆی دەست پێکرد. دەستەی نوێنەرایەتی ئێران بە سەرپەرشتی موزەفەر ئە علەم(سردارانتصار)، بە هاوکاری دەستەی نوێنەرایەتی تورکیا کاری دیاریکردنی سنوور و نیشانە دانانی سنووریان لە تێکەڵبوونەوەی چەمی ئاراز و قەرەسو دەست پێکرد و تاتێوەی ساڵی ١٣١٢ لە چیای دالانپەر، واتا سنووری هاو بەشی ئێران و تورکیا و عیراق کۆتایی پێهێنا. بە گوێرەی ئەم قەرارداده ئاراراتی بچوک کە لە کاتی لەشکرکێشی تورکان بۆ سەر هێزەکانی ئیحسان نوری کەوتبوە دەستی لەشکری تورک، درا بە دەوڵەتی تورکیا. لە بەرانبەر ئەوەدا دەوڵەتی تورکیا وازی لە داوا کردنی ناوچەی قەتور هێنا کە بە گوێرەی پرۆتوکۆلی ١٩١٣ درابوو بە دەوڵەتی ئێران.

بەم چەشنە دەورەیەکی دیکەش لە ناکۆکی سنوور و سیاسی ئێران و تورکیا، کە لە هێندێ قۆناخدا گەیشتە قەیرانیش کۆتایی پێکهات. لە کتێبێکدا کە هەر لەو رۆژانەدا بە مەبەستی بەربەرەکانی لە گەڵ« بیروباوەڕی کۆمەڵێک لە لێکۆڵەرانی بەغەرەزی دەوڵەتانی ئیستیعماری لە بارەی کوردستانەوە بڵاو کرایەوە.(٣٧) بە ئاماژە بە گۆڕانکاریەکانی ئەم دوایەی ناوچەدا نووسرا:« دەوڵەتی خاوەن بەرژەوەند دەیانویست خۆشیی و بەختەوەری ئەو قەومانەی کە جگە لە گوێ لە مستی و سەر دانواندن بۆ دەوڵەتی خۆیان کۆتاییان نەکرد بوو، بیانکەنە دەستخۆشی مەبەستی سیاسی و بۆ پێشکەوتنی ئامانجی سیاسی خۆیان دەوڵەتیکی پوشاڵی لە نێوان ئێران و تورکیا و عیراق دا پێک بێنن، بەڵام چونکە بەرژەوەندی هاوبەشی دوو دەوڵەتی دوست و دراوسێی ئێران و تورکیا لە ئەنجامی بە جێگەیاندنی ئەم نیەتە مغرضانەدا پێشێل دەکرا، هیچ یەک لەو دوو دەوڵەتانە نەچوونە ژێربار و هەرای سیاسیش بێدەنگ بوو.(٣٨)

---

بەکبوونی کوردستان و یەکێتی نەتەوەیی) شەڕی یەکتر دەکەن و کورد کوشتنیان کردۆتە ئامانج و سیاسەتی نا پیرۆز و نا ڕەسەنی خۆیان.

## سەرچاوەکان

١ - وزارت داخله،ایالت ازربایجان، سوادمراسله قنسولگری نخچوان، نمره٢٤٣،اول خرداد١٣٠٩،اسنادملی(ک)٤٢١١

٢ - وزارت امورخارجه، ادارمجماهیر شوروی، نمر ٢٠٣، تاریخ١٧/٥/١٣٠٨، اسنادملی(ک)٤٢١٩.

3 – MaxBeloff,Thr Foreign policy of Soviet Russia,1929–1941,vil,1,Oxford univerci ty,press,1965,pp,9–10

٤ - خبرگزاری مسکو، بەنقل ازاطلاعات،٢شهریور ١٣٠٩

5 – Kurdish Life,No9, winter 1994,n,y,pp,1–2

٦ - وزارت داخله،استخراج تلگراف تبریز، نمره٢٨٣،تاریخ١/٤/١٣٠٩، اسنادملی،(ک)٤٢١١

٧ - اسناد ضمیمه، سند شماره ٢٥

٨ - اسناد ضمیمه، سندشماره ٢٩

٩ - وزارت داخله،ایالت ازربایجان،نمره١٠٦٠، ٢٦بهمن١٣٠٨-اسناد ملی ،ک ٣٠٦١

١٠ - وزارت داجله، ایالت ازربایجان، سواد راپورت نظمیه ساوجبلاغ نمره٢،١٠٢ ،١٣٠٩/٢/٢٣، اسناد ملی، ک، ٣٠٦١

١١ - وقایع ارارات، ص ص ٧ ـــ ٢٥٧

١٢ - همان ، ص ٢٥٩

١٣ - حبل المتین، ١٨شهریور ١٣٠٩، ص ٢١

١٤ - بۆئاگاداری لەبەیاننامەی رەسمی دەوڵەت بڕوانە: رۆژنامەی اطلاعات،

٣٠تير و٦مرداد ١٣٠٩

١٥ – حبل المتين، ٢٨ مرداد ١٣٠٩

١٦ – اطلاعات، ٣٠ مرداد ١٣٠٩

١٧ – وقايع ارارات، كوهستان، ش، ٣٢ ــــ ٢٤/٨/٢١

١٨ – سرلشكر محمود امين، «خاطرات» مهنامه‌ارتش شاهنشاهى، فروردين ١٣٥١، شماره ا، ص ٨٦

١٩ – اطلاعات ٢مهر ١٣٠٩

٢٠ – همان ، ٢٤مهر ١٣٠٩

٢١ – وزارت داخله، ايالت ازربايجان، موادراپورت نظميه ايالتى، نمره٣١١٤-٤٤٩٤، مورخه١٣/١٠/١٣٠٩، ك(٢)،٢٥٣٧ به‌ڵگه‌كانى پاشكۆ، به‌ڵگه‌ى ژماره ٣٥

٢٢ – وزارتخارجه، اداره كل امورسياسى، نمره ١٣١٥ ١٢٩٤/٧/١٠تاريخ ١٣٠٩/٨/١٢،اسنادملى ، ٢٢٣٤ ٢٩٣٠٠، به‌ڵگه‌كانى پاشكۆ، به‌ڵگه‌ى ژماره ٣٣

٢٣ – وزارت داخله، ايالت ازربايجان، نمره ٨٢٦، مورخ، ١٣٠٩/١١/٢٩. اسناد ملى٢٢٣٤ ٢٩٣٠٠به‌ڵگه‌كانى پاشكۆ، به‌ڵگه‌ى ژماره ٣٤

٢٤ – اطلاعات، ١٢بهمن ١٣٠٩

٢٥ – سرلشكر محمودامين. «خاطرات» مهنامه ارتش شاهنشاهى، شماره١٠ دى ١٣٥٢، ص٨٦

٢٦ – سرهنگ احتسابيان، مهنامه ارتش، ص ١٨ ــــ١٩

٢٧ – بيگلرى ، همان ، ص ٧٨

٢٨ – بيگلرى، همان ص ٧٨، احتسابيان ص ١٩

٢٩ – امين همان، شماره يكم، فروردين ١٣٥٤، ص ٨٦

٣٠ – همان، شماره دوم، ارديبهشت ١٣٥٤، ص٨٤

٣١ – همان

٣٢ – همان ، ٨٧

٣٣ – همان ، شماره دوم اردیبهشت ١٣٥٤، ص ٨٦
٣٤ – شــرح دقــيق فــرامين وبرنامــهعــمليــات اين لشكركــشى دراسناد سرلشكرمعين منعكس شدهاست، همان شمارها ١تا٦،فروردين ــــشهريور ١٣٥٤
٣٥ – اطلاعات، ٢٦ دى ١٣١٠
٣٦ – همان، ٢٩ دى ١٣١٠
٣٧ – على اصغر شميم همدانى، كتاب كردستان، تبريز، كتابخانه سعادت وسروش ١٣١٢، ص ٢
٣٨ – همان ، ص ٤٥ ــــ ٤

## پاشکۆیەکان :

## چارەنووسی ئیحسان نوری

ئیحسان نوری پاش شکانی راپەرین پەنای بۆ خاکی ئێران هێنا . هەرچەند لە هێندێ سەرچاوە ئەم هەنگاوەی ئەو بە ڕاکردن لێکدراوەتەوە، بەڵام بە سەرنجدانی ئەوەی کە رابرد، لێکدانەوەیەکی دوور لە ئینسافە. چونکە شکانی راپەرین و کۆتایی پێهاتنی ئەم دەورەیەی خەبات تەواوئاشکرابوو. ئیحسان نوری دوای پەنابەری بۆ ئێران، ماوەیەک لە تاران لە ژێر پرسیار و لێپرسینەوە دابوو. پاشان وەک چەند کەسێکی تر لە پەنابەرانی ئارارات کە لە شارە جیاوازەکانی ئێران لە ژێر چاوەدێری دابوون، بۆ یەزد و ساوە دوور خرایەوە. لەم نووسراوە و بەڵگانەی ئەو سەردەمە کە بەجێ ماون باسی «٥٣٠ژن ومندالّی ئەشرار ی ئارارات» دەکرێ کەلە پەروەردەخانەی تەورێز راگیراون وهەروەهائەو کەسانەی خوارەوەش کە لە ژێرناوی» کوردەکانی ئارارات «دابۆ ناوچە جیاوازەکانی ئێران دوورخراونەوە و لە ژێرچاوەدێری دابوون: شێخ عەبدولقادر(تاران)، شەمسەدین (مەشهەد )، محەمەد بەگ(تاران)، ئیلخانی (تاران)، مصرۆ(سمنان)، ئەحمەدعەلی(سمنان)، ریابە خێزانی برۆحسۆ(تاران)، بەسرە خێزانی فرزندە کە لە تاران لە بەندیخانەدا مردبوو. (وزارتی داخلە، سوادگزارش کمیسیون رسیدگی بەاشخاص تحت نظر)بدون شمارە،بەتاریخ ١٣١٣/٣/٧ .اسنادملی(ن)٢..١٢٢

پاش ماوەیەک بە هاتنەپێشی روو داوی شهریوری١٣٢٠(١٩٤١)، لە سەرەتای ساڵی ١٣٢١ئیحسان نوری لە گەڵ یوسف عەلی مهاجر، خانم بسرە حسنانی، تەیمور جەلالی، شەمسەدین جەلالی، ئیلخانی جەلالی و محەمەد دەروێش داوایان لە وەزارەتی خۆجێی کردوە کە بە سەرنجدانی زۆربوونی لە رادە بەدەری موخارجی

ژیان، یامەعاشیان زیاد بکرێ یالە ژێرچاوە دێری بێنە دەر تاخۆیان ژیانی خۆیان بە ڕێوە بەرن.(١)

لە هەوڵی پۆشپەری ئەو ساڵەدا ئیحسان نوری بە ناوی «مودیریەتی هەرەکاتی پێشووی هێزەکانی نەتەوەیی کوردستانی تورکیا» داوای لە سەرەک وەزیرکرد: «... یاکارێکی بە گوێرەی پایە و وەزعی خۆی بدرێتێ، یائازادی بکەن کارێکی ئازاد بۆ خۆی پەیدابکات وموخاریجی ژیانی خۆی وەدەست بێنێ.» یائەگەر دەوڵەت لە بەر هەر شتێک بێ«...خستنە ژێرچاوەدێری من بە پێویست دەزانێ موخاریجێکی ئەوتۆم بۆ دیاری بکا، لە گەڵ وەزعی من ڕێک بکەوێ. ناوبراو ڕایگەیاند لە بەرئەوەی«...مەدرەسەی بەرزی عەسکەری تورکیای لە ئەستەمبوڵ تەواوکردوە و لە گەڵ ئەو تۆپۆگرافیشم خوێندوە» بۆ کارکردن لە نەخشەکێشان هەولم داوە، بەڵام ئاکامی نەبوە.(٢)

لەم ناوەداڵە سوپای ڕۆژ ئاواوە خەبەر گەیشت کە دەستەیەک لە کوردان بە سەر پەرشتی کوری سمکۆ و شەریفخانی (*) کوری سەید تەها بۆ بردنی ئیحسان نوری نوێنەریان ناردۆتە تاران. لە نێوان سەید عەبدوڵا ئامۆزای سەیدتها و سەیفولقوزات و قازی محەممەد و ئیحسان نوری - ش دا چاوپێکەوتنێک بەڕێوە چوە، بەڵام شارەوانی پاش توێژینەوەیەک ڕایگەیاند کە ئەونایەوێ لە تاران بچێتە دەر.(٣) وەزارەتی جەنگیش بە شارەوانی ڕاگەیاند کە بە گوێرەی لێکۆڵینەوەیەکی کراوە، نە ئیحسان نووری دەیەوێ لە تاران بچێتە دەر و نە ئەوانەی چاویان بەو کەوتوە، خەیاڵی بردنی ئەویان هەیە.» لە بەرئەوە لە سەر بریاری کۆبوونەوەی شەشەمی پوشپەری ١٣٢١ی هەیئەتی وەزیران بۆ ئازادی حەوت کەس لە موهاجرانی تورکیا، واتە ئیحسان نوری و هاوڕێکانی موافەقەت کرا، و لە سەر ڕاسپاردەی وەزارەتی شەڕ بڕیاردرا تائەو کاتەی کارێکیان نە دۆزیوەتەوە،

---

(*)- دەبێ ئەم ناوە ڕاست نەبێ. چونکە پێم وانیە سەید تەها بە ناوی شەریفخان کوری هەبووبێ. وێدەچێ ئەمەرخانی شەریفی بووبێ، شەریفخان نووسراوە.

مانگانەی ئەوان و هەروەها مانگانەی ئیحسان نوریش کە ببوە ١٥٠٠ ڕیاڵ، هەروا بیاندرێتێ.(٤)

لە چەند و چۆنی دوایی ژیانی ئیحسان نوری زانیاریەکی لە دەست دانیە. دەزانین لە ساڵەکانی ٢٥ - ١٣٢٣(٦٤ - ١٩٤٤) لە گەڵ ڕۆژنامەی کوهستان هاوکاری هەبوە و زنجیرە وتارێکی بە ناوی(مێژووی ریشەی رەگەزی کورد و ڕووداوەکانی ئارارات)نووسی.(٥)

وادیارە لە قۆناخێکدا بۆ کرمانیش دوور خراوەتەوە. پاشان لە ساڵەکانی ئاخری دەیەی ١٣٣٠کە بە سەرنجدانی کۆدیتای عبدولکەریم قاسم و گۆڕانکاریەکانی عیراق، سیاسەتێکی تازە لە ئاست کوردەکانی ناوچەدا گیرایە پێش، ڕێگای درابگەڕێتەوە تاران. لە و ڕۆژانەدا لە بواری ژیان و ئازادی کردەوەش لە چاو ماوەکانی پێشوو، ئاسودەییەکی پتری هەبوو. تەنانەت ڕێگای درا بۆ بەشداری لە کۆنفرانسەکانی نێو نەتەوییدا یەک دوو جاریش بچێتە دەرەوە. (*)

ئیحسان نوری لە ٢٩ی رەشەمەی ١٣٥٥(١٩٧٧/٣/١٩)لەتاران لەگەڵ مۆتۆرسوارێک خۆیان لێکداوکوژرا.

---

*- ئەوەش هەرلایەنێکی فێڵەزانی حکومەتگەلی ئێران و فریودانی کورد نیشان دەدا .کاتێکی بزووتنەوەی کوردلاوازوماتە، ئیحسان نوری وهاورێکانی بۆ شارە دوورکەوتوەکانی خواروی ئێران دووردەخرێنەوە و تەنانەت بەشی ژیانی ڕۆژانەشیان پارمەتی پێناکرێ. بەڵام کاتێ دوای شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژی ٩٥٨ ی عیراق ، ئێران دەیەوێ کوردەکانی کوردستانی عیراق تووشی شەرو بزووتنەوەی چەکداری بکا، (بڕوانە:نهێنی یەکانی بەستنی پەیمانی ١٩٧٥ ئەلجەزایر، نووسراوەی سرهنگ ستاد عیسی پژمان) ڕێگادەدا بەئیحسان نووری پاشا، نەک هەر بگەرێتەوە بۆتاران، بەڵکوو دەینێرێتە دەرەوەش کە لە کۆبوونەوە و کۆنفرانسی خوێندکارانی کورد و هیتردا بەشداریش بکات. ئەم سیاسەتە لەلایەن حکوومەتی ئێرانەوە ئێستاش هەر بەردەوامە وکوردی پێ فریودەدرێ.

# سەرچاوەکان


١ – وزارت جنگ، دفترنظامی، شماره ٧٦٥ــــ٢٦٠٤/٥، بەتاریخ ١٣٢١/٢/٣، اسنادملی(ن)١٠٣٠٠٢

٢ – نامــه مــورخ ١٣٢١/٤/١ احــســان نوری کــه یه شــمـــاره ٦٦٦٥ مــورخ ١٣٢١/٤/٤ دردفتر تخست وزیری ثبت شدەاست، اسنادملی(ن)١٠٣٠٠٢

٣ – وزارت کــشــور اداره کل شــهـربانـی، اداره اگـاهـی، شـمـاره٩٥٢٨/٢٢٩٢، بەتاریخ ١٣٢١/٤/٢٥.

٤ – وزارت جنگ، رونوشت گــزارش دایره یک، شــمــــاره ٢٨٦٢، مــورخــه ١٣٢١/٦/٥، اسناد ملی(ن)١٠٣٠٠٢

٥ – پاش مـاومیەک زنجیـره وتارەکـانی مـێژووی ریشـەی رەگەزی کـورد وەک کتێبێک چاپ کرایەوە(تاران ئەنجومەنی ئێران ناسی کوردیــــمادی، چاپخانەی سپهر، ١٣٣٢، ١٤٥ ص)

# بەڵگەکانی پاشکۆ

نووسەری بەڕێز ئاغای کاوە بەیات لە کۆتایی کتێبەکەیدا ٣٧ بەڵگەشی هێناونەوە. هێندێ لەوبەڵگانە بە جۆرێک لەنێوناخنی کتێبەکەشدا ڕەنگیان داوەتەوە وباسیان کراوە. هێندێکیان وەک هێندێ بەش ولاپەڕی کتێبەکە، پێوەندیەکی ئەوتۆیان بەمە بە ستی نووسین و وەرگێڕانەکەی ئێمە وە نیە، بۆیە بە گوێرەی سەلیقە وتێگەیشتنی خۆم بەڵگەکانیشم گوڵبژێرکردوە وئەوانەی بە گرنگم زانیون و پێم وابوە ڕووناکی دەخەنە سەر گۆشەیەکی تاریکی ئەم قۆناخەی مێژووی بزاڤی کورد و بۆ خوێنەری بە ڕێز کەڵکیان دەبێت کردوومن بە کوردی و وا لە خوارەوە پێشکێشیان دەکەم. ک. ح

**١ ـــ (ڕاپۆرتی فەرماندەی لەشکری سەرووی ڕۆژئاوا، ٥ ی گەلاوێژی ١٣٠٤) (١٩٢٥)**

وەزارەتی داخلە، ئەیالەتی ئازەربایجان، سوادی نامەی ئیدارەی لەشکر، نمرە٣١٦٥، ڕێکەوتی ٥ی بورجی مردادی ١٣٠٤

پاش سەرخەت. نمرە٤١٢٧ لە گەل نێوئاخنەکەی تەماشاکرا. دزییەتی هێندێ مالات لە خاکی رووسیا دوو مەسەلەی جیاوازبوون کە بە گوێرەی لێکۆڵینەوە هێندێ قاچاخچی ئێرانی کە لە ئاگری داغی خاکی تورکیا دەبن، بە هاودەستی چوارکەس لە کوردەکانی خەلیکانلو مالاتی ئەرمەنستانی ناوچەی ئیرەوانیان دزیوە و دوو کەس لە دزەکانی خەلیکانلو گیراون و ئێستا لە حەبسێ دان و دوو کەسی دیکەشیان چوونە کن قاچاخچیەکان بەشە مالاتی دزراو وەربگرن. خالیدئاغا

سەرۆکی تایفەی ئاویراو هەرچواردزی تایفە خەلیکانلوی کۆ کردوونەوە و ئێستا گیراون. سەبارەت بە دزی دوەم کە لە نیزیک شاتەختی کوردەکان حەیواناتی رووسانیان بردوە، ڕاستە. کوردەکانی قاچاخی تورک کە لە خاکی تورکیابوون، هاتوونە قشلاغی چۆلی تایفەی جەلالی ولە وێوە لە ئاراز پەریونەوە و لە نیزیک شاتەختی مەڕ ومالاتیان هەلگرتوە و گەڕاونەوە بۆ ئاگری داغ خاکی تورکیا، عەسکەری تورکیش ڕاویان ناون.

فەرماندەی لەشکری سەرووی رۆژئاو. سەرتیپ محەمەد حوسێنی(ئایرم) (اسناد ملی ک(۲) ۱۰۲۰٤)

## ٤ ـــ (ڕاپۆرتی نظمیەی ماکۆ، ١٦مهر ١٣٠٦)(١٩٢٧)

وەزارەتی نێوخۆ، رونووسی راپۆرت رێکەوتی ١٦ی رەزبەری ١٣٠٦

بەگوێرەی راپۆرتی نظمیەی ماکۆ کوردەکانی تورکیا نیزیکەی ٦٠٠ عەسکەری تورکیان لە چیا گەمارۆ داوە ولە بەینیان بردوو. نیزیکەی ٥٠کەسیان گرتوە و گوللە بارانیان کردون دوو کەس لە نێو ئەواندا ڕزگاریان بوە و خۆیان گەیاندۆتە ئۆردوی ئێران و لە وێوە چوونەوە نێو لەشکری خۆیان. ( جێگای مۆری کابینەی ئەیالەتی ئازەربایجان ، (اسناد ملی، ٢٢٤٩٠٠١/١٠٢٠١٠)

## ٦ ـــ ( وەزارەتی نێوخۆ بۆ حکوومەتی کوردستان، ٢٧ی سەرماوەزی ١٣٠٦ (١٩٢٧).. (حکوومەتی کوردستان لێرەدا مەبەست سنەیە)

زۆرخێرا، بۆ حکوومەتی کوردستان. بە گوێرەی ئاگاداری گەیشتوو لە بەغداوە، یەکێ لە برایانی شێخ عەلیرمزای کوری شێخ سەعیدی کوژراوی سەرۆکی کوردان، لەم دواییەدا لە ڕەواندزەوە دەچێتە بەغدا و چاوی بە میجر ئێدمۆندز یاریدەری ڕاوێژکاری وەزارەتی نێوخۆی عیراق دەکەوێ و بۆ هاتنی ئێران مەعموریەتێکی نهێنی وەردەگرێ. پێشتریش یەکێ لەوان هاتۆتە ئێران. پێویستە لەم بارەوە لێکۆڵینەوەبکرێ ونەتیجەش ڕابگەیێن. ( اسناد ملی، ١١٠٠٢٩٧١)

٧ ـــ ( وەزارەتی ئێوخۆ بۆحکوومەتی کرماشان، ٢٦ی وەرماوەزی ١٣٠٦) (١٩٢٧)

.... بە گوێرەی راپۆرتی ژەنرال قونسولگەری بەغدا کومیتەیەکی نهێنی سەربەئەرمەنی داشناکسیونی بەغدا و هیتر لە کرماشان پێکهاتوە وئیحسان مینباشی ناوێک، ئەفسەری تورک وتورکێکی دیکە کە لە کرماشان کاراژیان هەیە ولە گەڵ قونسولخانەی تورک پێوەندیان هەیە، ئەندامی کومیتەی ناوبراون. پێویستە بە نهێنی لەو مەسەلەیە بکۆڵنەوە و چۆنیەتی رابگەیێنن. بۆچی لەپێشدا لەم بارەوە راپۆرت نەدراوە؟

خێرا رمز بکرێ. (اسناد ملی، ٢٩٠٠٦٧٤٧)

١٢ ـــ (والی ئازەربایجان بۆ سەرۆک وەزیر، ٣ی رێبەندان ١٣٠٦) (١٩٢٧)

ئیدارەی تێلگرافی دەوڵەتی ئێران، لە تەورێزەوە بۆ تاران نمرەی تێلگراف ٥٥، تاریخ، ١٣٠٦/١١/٣

سەرەک وەزیر، ٢٩١ وەرگیرا. داشناکسیۆنەکان لە گەڵ کوردەکان یەکن. وا دیارە مەبەستیان دژایەتی تورکەکانە. بەڵام ئەم یەکەتیە دژی ئێرانیش تەواو دەبێ. بۆیە ماوەیەکە مەسەلەکە خراوەتە بەرچاو. هێندێ تەبلیغاتچی داشناکسیۆنەکان کە هاتووچۆی کوردستانیان دەکرد، گیران و لە هەموو شوێنێ مەعمورەکانی لەشکری و مەدەنی تەشکیلات و کردەوەکانی ئەوانیان خستۆتە ژێر چاوەدێری. بەتایبەت لێکۆڵینەوەیەک لە گۆڕێ دایە کە دەرکەوێ داخوا لە سەرچاوەی بێگانەوە پارە دەگاتە داشناکەکان یان نا؟ ( اسنادملی .ن.١٢٢٠٠٢)

١٣ ـــ ( ئەیالەتی ئازەربایجان بۆسەرەک وەزیر، ٦ی رێبەندانی ١٣٠٦) (١٩٢٧)

ئیدارەی تێلگرافی دەوڵەتی ئێران. لە تەورێزەوە بۆ تاران، نمرەی تێلگراف ١٥٦ تاریخی گەیشتن ١٣٠٦/١١/٦

سەرمک وەزیر ۲۹۳ گەیشت . مەسەلەکە لە ژێر موتالا و چاوە دێری دایە. تائێستا ۹کەس لە تەبلیغاتچیەکانی ئەرمەنی لە ماکۆ و خۆی و ورمێ گیراون لە تەوریز لە ژێر پرسیاردان. لە سابڵاغیش ئەو کەسانەی ئامازەت بۆ کردبوون، لە ژێر زیرەوانی دان وبەم زوانە دەگیرێن و پرسیاریان لێدەکرێ. بە گوێرەی ئەو درکاندنانە نەخشەی یەکێتی کورد وئەرمەنی کە ناوەندی بێگانەی هەیە، لە ئازەربایجان لە باو کەوتوە و لە ڕاستیدا وەستاوە. چەند ڕۆژی دیکە کە دێمە لات، مەسەلەکەت بە زمان پێڕادەگەیێنم. ( اسناد ملی.ن۲۱۲۲۰۰ )

۱٤ ــــ ( ڕاپۆرتی نظمیەی ئازەربایجان، ۲ بانەمەڕی ۱۳۰۷) ( ۱۹۲۸)

وەزارەتی نێوخۆ، ئەیالەتی ئازەربایجان، ڕونووسی ڕاپۆرتی نظمیەی ئەیالەتی، بێ نمره، تاریخ ۱۳۰۷/۲/۲

۱ ــــ بە گوێرەی ئاگاداری گەیشتوو لە لایەن خەلیفەگەری ئەرمەنییان، کوردەکان دوو جار لە گەڵ لەشکری تورک توشی شەڕ بوون. لەشکری تورک لە قارس ڕاگیراوە. لە لای بایزیدەوە کوردەکان لە دوو شەڕدا سەرکەوتوون،

۲ ــــ رووسەکان بۆ پێشگری لە پەڕینەوەی کوردەکان بۆ خاکی رووسیا بۆ نەخچەوان کە لە بەرانبەر ئاراراتە، لەشکریان هێناوەتە ئەو دەور و بەرە. نمره ۱۰۹ ئەحمەد عەلی زەند .( اسناد ملی، ۲۹۰۰۷٤۳۷ )

۱٥ ــــ ( ڕاپۆرتی نظمیەی ئازەربایجان، ۱۱ی پوشپەڕی ۱۳۰۷

وەزارەتی نێوخۆ، ئەیالەتی ئازەربایجان، نمره ٥۱۳/٤۲۲، تاریخ ۱۳۰۷/٤/۱۱

ڕاستەوخۆ. بە گوێرەی دەنگۆ لەم دوایەدا ئینگلیزەکان لە گەڵ ئارارات پێوەندیان پچڕاندوە. لەم ڕوانگەوە هەم دەوڵەتی سۆڤیێتی رووس و هەم دەوڵەتی تورکیا بۆ ڕاکێشانی بیر و ڕای کوردەکانی ئارارات ناردوویانە. وەڵامی هیچیان نەدراوە تەوە، ڕاست و درۆی مەعلوم نیە. سەرۆکی نظمیەی سەرووی ڕۆژئاوا، ئەحمەد زەند.. ( اسنادملی. ۲۹۰۰۷٤۳۷ )

وەزارەتی پایە بەرزی دەرباری پەهلەوی. لەم سەفەرەی دیاریکردنی سنووردا کە زۆربەی لە گەڵ کوردە سنوورنشینەکان پێوەندیم هەبوو، لە هەموو کات و هەلێکدا وتوو وێژم لە گەڵ کردوون و بۆ رەوشتی راستی و خزمەتگوزاری دەوڵەت دەستم لە پشتێ سەرۆکەکانیان داوە و تێمگەیاندوون کە رەگەزی کورد، ئێرانی پاکە و پێویستە سەبارەت بەو ئاو و خاکە خزمەتگوزاربن و وەک رابردوو نەبنە ئامرازی دەستی خەڵکی دیکە و باش بزانن کە زەمانی رابردوو تێپەڕ بووە ئێمڕۆ دەوڵەت خاوەنی دەسەلات وتوانایە وەرکەسی کاری سنوور تێکبدا، خۆی و عەشیرەتی لە بەین دەچێ. زۆربەی عەشیرەتەکان هەستیان بەو راستیە کردوە، داخی رابردوو دەخۆن و تەواو تێگەیشتوون(کە لە خەڵکی دیکەی وڵات دواکەوتوو ترن)، خافڵبوونی رابردوو سەبارەت بە نەزانی بوە وهۆی ئەم دواکەوتوییەش نەبوونی مکتەب و مەدرەسەیە. بەم بۆنەوە زۆربەیان داوایان دەکرد کە دەوڵەت مەکتەب و مەدرەسەیان بۆ دروست بکا کە لە نیعمەتی زانست و زانیاری کەڵک وەربگرن و خزمەت بە نیشتمانی خۆیان بکەن. هێندێ لە سەرۆکە بە هۆشەکانی وەک خالیدئاغای سەرۆکی خەلیکانلو کە ئێمڕۆ لە نێو کورداندا ئیعتباری هەیە. کاتێ لەم بارەوە باسمان دەکرد، ناویراو بە ئاشکرادەیگوت: دەوڵەت سەبارەت بە کوردان مەرحەمەتی نیە، ئەگەر وانەبێ، بۆچی دەوڵەت سەربازیان لێ ناگرێ؟ بۆچی داوای ماڵیاتیان لێ ناکات؟ بۆچی مەکتەبیان بۆ دروست ناکا؟ ئەوانە هەموو بەڵگەن بۆ ئەوەی دەوڵەت لە گەڵ ئەوان لوتفی نیە. ئەگینا ئێمەش خەڵکی ئەم وڵاتەین، دەبێ لە مەرحەمەتی دەوڵەت کەڵک وەربگرین. بەلام دەوڵەت قەدەغەی دەکا کە گەنم بەئێمە بفرۆشن{ چونکە ئەو کوردانە لە ماکۆ و ئاواجیق گەنم بۆ ناوچەی ئاگری داغی تورکیا دەبەن ولە کرینی گەنم لە ژێر چاوەدێری دابن}. من پێم گوت ئەوانەی دەیڵێی وانین. ئەم دامەزراو وتەرتیباتە لە سایەی سەردەمی ئالاحەزرەتی هومایونی شاهەنشاهین و هەموو خەڵکی وڵات دەگرێتەوە. بەلام چونکە ئێوە لە سنوور دەژین ولە ناوەند دوورن. چەند رۆژ درنگتر پێتان دەگات. بەلام دڵنیابن کە

دەوڵەت سەبارەت بە کوردان مەرحەمەتی هەیە و لە هەموو تەشکیلاتی تازە کەڵک وەردەگرن. خاتری موبارەک لە بیر وبۆ چوونی کوردان ئاگادارە و باش دەزانن کە تورکـــان وە شک کـــەوتوون و تەواو ڕوویان لە ئێـــرانە.(گـــۆیا ویســـتی خودایە)هەرئەوانەی کـە تا دوێنێ ئـامرازی دەســتی بێگانان بوون و بە شـێوەی جۆربەجۆر دەبوونە هۆی چارەرەشی ئێمە، ئێمرۆ داوای مەکتەب لە ئێمەدەکن و دەیانەوێ لە ژێر کەرەمی شایانەدا، خزمەت بە نیشتمان و وڵاتی خۆیان بکەن. کە وابوو هەر چەندی بکرێ ئێمەدەبێ ئەم بیروباوەڕەی ئەوان بە هێزبکەین وئەوان بۆ لای خۆمان ڕابکێشین و سەرنجی هەموو کوردستان بە لای خۆماندا بێنین. لەم حاڵەدا پێموایە دانانی چەند مەدرەسەیەک، هەرچەندە مەکتەبی گەرۆکیش بن و، لە گەڵ ئەوان گەرمێن کوێستانێ بکەن تەواو لە گەڵ سیاسەتی وڵات بێتەوە. ن. خەلعەتبەری...(موسسە مطالعات ٥٧٥٤٧ )

٢٣ ــــ (باڵیۆزی بەریتانیا لەتاران بۆکۆمیسیۆنەری بەرزی بەریتانیا لەعیراق ٢٧ی خاکەلێوەی ١٣٠٩

پاشکۆی ژمارە ٥٢، سرآر. کلایو بۆسـر اف هـمـفریز، تاران، ١٦ی ئـاوریلی ١٩٣٠

ئاغـای بەڕێز،لە دانیـشـتنێکدا کـە دوێنێ لە گـەڵ وەزیری دەربارم هـەبوو، حـەزرەتی ئەشرەف، تەواو نیگەرانی ئەومەسەلەیە بوو کەناوی دەنا « بزووتنەوەی کوردان». ناوبراو گوتی: مەسەلەی کوردستانێکی یەککرتوو وەک مەسەلەی ئەرمەنستانی سەر بەخۆ، سەرلە نوێ بۆتە جێگای وتو وێژ. بە بڕوای ئەو کوردەکانی ئێران لەم بزووتنەوەیە بە دوورن، بەڵام هەڵوێستی تورکیا سەبارەت بە خەڵکی کورد هەمیشە بۆتە هۆی نیگەرانی دەوڵەتی ئێران. لە کاتی ئێستادا دەڵێن دەوڵەتێکی بە ڕواڵەت کـوردی لە دەور و بەری ئارارات دامـەزراوە و تەنانەت وەزیرێکی دەرەوەشی هەیە.

٢ ــــ هەرلەو کاتەشدا ئەو بیستبووی کە کاربەدەستانی ئینگلیزی ــــ ش لە

عیراق لە گەڵ بزووتنەوەی کوردستانی سەربەخۆ جۆرە هاو دڵیەکی هەیە و لە گەڵ شێخ مەحمود پێوەندیشیان گرتوە. لەم دواییەدا رۆژنامەکانی تورکیا خەبەریان داوە کە کلنل لاورنس لە کوردستانە، و خەبەری ئەوەشی هەیە کە ئەو راپۆرتە لە رۆژنامەکانی عیراقیشدا رەنگیان داوەتەوە. ناوبراو گوتی: سوپاس دەکا ئەگەربتوانم لەم بارەوە خەبەرێک لە بەغدا وەربگرم. لە پێشدا لە بارەی کلنل لاورنس پێمگوت: لەو چیرۆکانە ماندوویووم کە لە بارەی بوونی ئەولە ناوچە جیاوازەکانی ئاسیای رۆژئاوا وناوەراست دا، دەبیستم. مەسەلەی هاودڵی کاربەدەستانی ئینگلیزیش لە گەڵ بزووتنەوەی پان کوردی بە راستی باوەر ناکەم. لە گەڵ ئەوەش لە بەر ئەوەی پرسیاری لە من کردوە، قسەکەی ئەو بۆ لێ ورد بوونەوەی بەغدا دەنێرم، تاکومیسیۆنەری بەرزی (بەریتانیالە عیراق)چاوی لێ بکات.

٣ ـــ هەروەها تەیمورتاش لە قسەکانیدا ئامازەی بۆ « حیزبی مساوات » کرد بۆ قەفقازێکی سەربەخۆ کە ئێستا ناوەندی لە ئەستەمبوڵە. بەرنامەی ئەو دەستەیە سەبارەت بە ئێران هەمیشە نا دۆستانە بوە. چونکە ئازەربایجانێکی« یەکگرتوو» کە تەواوی ئەیالەتی (ئازەربایجانی) ئێران تازەنگان دەگرێتە بەر. ناو براو گوتی ئێستا پێویست نیە کە حیزبی «مساوات» ئەوەندە گرنگ بگیرێ. ئاگاداری لە هەر چەشنە دانوساندنێک لە نێوان ئەوان و بزووتنەوەکانی تر بۆ ئەرمەنستانێکی سەربەخۆ و کوردستانێکی یەکگرتوو، دەتوانێ سەرنج راکێش بێ.

٤ ـــ نوسخەیەک لەم نامەیە بۆ سکرتێری ئەسڵی وەزارەتی دەرەوە و وەزیری دەرەوە و وەزیری دەرەوەی حکوومەتی هیند ناردراوە. آر.ا چ.کلایو.

**٢٥ ـــ { کومیسیونەری بەرزی بەریتانیا لەعیراق بۆ باڵیۆزی بەریتانیالەتاران، ٩ بانەمەری ١٣٠٩**

**سر اف. همفریز بۆ سر آر کلایو(لەرێگای ئیدارەی موستەعمەراتەوە، ١٧ی مایەغدا، ٢٩ی ئاوریلی ١٩٣٠**

ئاغای بەرێز ! شانازیم هەیە بە نامەی ژمارە٥٧ ڕێکەوتی ١٦ی ئاوریلی ١٩٣٠ کە منت لە وتو وێژێک سەبارەت بە ناسیۆنالیستەکانی کورد لە گەڵ حەزرەتی ئەشرەف وەزیری دەربار و نیگەرانی ئەولە هاودڵی کاربەدەستانی ئینگلیزی عیراق لە گەڵ بزووتنەوەی سەربەخۆیی کوردستان ئاگادار کردوە.

٢ ـــ دەسپێرم ئەگەر حەزرەتی ئەشرەف جارێکی دیکە باسی ئەم مەسەلەیەبکاتەوە، تۆ دەتوانی وەبیری خەیەوە کە لە ئەنجامی ڕاسپاردەکانی شورای کۆمەڵی نەتەوەکان کاتی بڕیاردان لە بارەی کێشەی سنووری موسڵ لە گەڵ تورکیا، دەوڵەتی ئالاحەزرەتی (پاشای بەریتانیا)ئەرکداربوە، هێندێ زێدەیی تایبەتی بۆ کوردەکانی عیراق، وەک گەلک وەرگرتنی ڕەسمی لە زمانەکەیان قەبوڵ بکات. لە بەرئەوە سروشتیە کە کاربەدەستانی بەریتانیا لە عیراق ئەرکەکەیان بە شێوەیەکی پێویست بەجێ بگەیێنن.

٣ ـــ هەروەک ئاگادارن کاربەدەستانی بەریتانیالە عیراق، لە وانە دوانی بەرلە من نەک هەربیری خودموختاری کورد کە لە نێو هێندێ ناسیۆنالیستە هەڵەشەکانی کورد دا برەوی هەیە، پاڵ پشت ناکەن، بەڵکوو بە تایبەت تێکۆشاون کە لە کۆرانی عیراق بە ناوەندی پلانی ناسیۆنالیستەکانی کورد بۆ پێکهێنانی ئاژاوە و گێرەشێوێنی لە نێو کوردەکانی خاکی دەوڵەتانی دراوسێ، پێشگری بکەن. چۆنیەتی ئەو هەنگاوانەی کە لەو بوارەدا لە ١٩٢٨هاوێژراون لە پاشکۆی نامەنهێنی یەکانی سرهێنری داب، بە ژمارەکانی ١٦٢٣، ڕێکەوتی ١٤ی یولی(٢٣ی پوشپەر) و١٨٢٥، ڕێکەوتی ١٠ی ئاوگوستی ١٩٢٨، لێ یان ئاگاداربووی. ڕەنگە خەراب نەبێ کە سەرنجی وەزیری دەربار بە تایبەت بۆ ڕووداوی باسکراو لە بەشەکانی ١١و١٢نامەی دوایی ڕابکێشی. جگە لەوە ڕاگەیاندنی ڕیزە ناوێک لە ناسیۆنالیستەکانی کورد و ئەرمەنی بۆ هەموو بەرپرسانی پاسپۆرت بۆ نەدانی ڤیزا بۆ عیراق لە سەر داوای ڕاستەو خۆی کومیسیۆنەری بەرز لە دەوڵەتی بەریتانیا بەرێوە چوو.

٤ ـــ بڕوام وایە ئەگەر حەزرەتی ئەشرەف وەزیری دەربار لەم مەسەلانە

ئاگادارین، ئیتر لە بارەی هەڵویستی کاربەدەستانی ئینگلیزی عیراق سەبارەت بە بزووتنەوەی سەربەخۆیی کورد گومانی نامێنێ.

٥ ـــ نوسخەیەک لەم نامەیە بۆ وەزیری موستەعمەرات ناردراوە. لە گەڵ رێز. اف.اچ.همفریز، کومیسیۆنەری بەرزی عیراق.

**٢٦ ـــ { راپۆرتی وابەستەی نیزامی باڵیۆزی بەریتانیا، ٧ی پوشپەری ١٣٠٩ پاشکۆی ئەوەڵ ژمارە٩٥، لیتنان کلنل داد، بۆسرآر، کلاین، فلهک، ٢٨یونی ١٩٣٠{٧ی پوشپەری ١٣٠٩}**

ئاغای بەرێز ! شانازیم هەیە بەم بۆنەوە راپۆرتێک لە وتووێژی خۆم لە گەڵ رۆبن پاشا ناو لە ٢٦ی یونی ١٩٣٠ پێشکێش بکەم.

نوسخەیەک(لەونامەیە)راستە و خۆ بۆ مودیری عەمەلیاتی نیزامی و ئاگاداری وەزارەتی شەڕ و سەرۆکی ستادی ئەرتەشی هیند دەنێرم.

**راپۆرتی وتو وێژ لەگەڵ رۆبن پاشا لە٢٦ی یونی**

لە٢٦ی ژۆئن بە گوێرەی قەراری پێشوو چاوم بە رۆبن پاشا ناو کەوت کە رایگەیاند لە١٩١٤لە ئەرمەنستان وەزارەتی جەنگی لە ئەستۆبوە، و ئێستابۆ مەعموریەتێکی نهێنی لە تارانە. ئەو هیوادار بوو کە لە دەوڵەتانی بەریتانیا و ئێران یارمەتی بۆ کوردەکانی تورکیا لە ئارارات وەربگرێ.

من خەبەرم پێگەیشت کە(کوردەکانی تورکیا)لە سێ چوارساڵی رابردوودا خەریک بوون لە ژێردەسەڵاتی تورکان رزگاربن و ئێستا سەرەڕای تەقەلای تورکەکان بۆ سەرکوتکردنیان، بە کردەوە کەمو زۆر سەربەخۆن.

لە سەرو بەندی مانگی یۆنی تورکەکان هێرشێکی بەرنامەییان دژی کوردەکان دەست پێکرد. بە گوێرەی بەرئاوردی رۆبن پاشا هێزی تورک دەگاتە ١٥٠٠عەسکەری رێکوپێک و ٥٠٠٠هێزی غەیرە نیزامی. کوردەکان دوو ناوچەیان لە ژێرکۆنترۆل دایە، یەکێ لە سەرووی ئەرجیش و ئەویتریش ناوچەی چیای ئاراراتە لە لای رۆژئاوایە. ئەوان هیوادارن کە مابەینی ئەم دوو ناوچەیە بگرن و بیکەنە یەک

ناوچەی شۆرشگێری. هێزی تورک بە دوو بەش دابەشبوون. بەشێکیان لە خوارووی ئەرزەرۆم بەرەو ئارارات کاردەکا. بەشەکەی ترلە سەرووی رۆژئاوای گۆلی وان، بەرە و ئەرجیش و بایزید. مەیدانی عەمەلیات بۆ لەشکر دژوارە، تورکەکان بۆ پاراستنی هێزەکەیان لەو ناوچەیە تووشی دژواری بوون. سۆڤێت رێگای داوە لە رێگای شەمەنندەفەری سۆڤێت ولە خاکی سۆڤێتەوە پێداویستی ئەرتەشی تورکیا دابین بکرێ. کوردەکانی تورکیا لە بەر کەمی چەک و جبەخانە لە ئاستەنگی دان. ئەوە تەنیا داخوازێکە دەتوانێ بەربەرەکانی ئەوان لە بەرانبەر تورکاندا مسۆگەر بکا. تاقە داخوازی رۆبن پاشائەوەیە کە بە چەشنێکی غەیرە رەسمی کەرەسەی شەر بگاتە کوردەکانی ئارارات.

کاتێ بە منی گوت کە ئەگەر دەوڵەتی بەریتانیا موافەقەت بکا، ئەو دەتوانێ بە نهێنی لە رێگای عیراقەوە چەک بگەیێنێتە کوردەکان. ناچار بووم پێی بێژم کە ئەم داخوازە کاڵتەیە و تەنانەت ناتوانم ئەوەی بە باڵیۆزی بەریتانیاش بڵێم. لام وایە ئەو هیوادار بوو لە گەڵ دەوڵەتی ئێران سەرکەوتنی زیاتری هەبێ. مێلی گشتی بەڵگەی رۆبن پاشا ئەوە بوو کە سۆڤێت تورکەکان لە مۆرەیەکی دەستی زیاتر حیساب ناکەن. ئەوان لە لاوە بۆ سەرکوتکردنی کوردەکان یارمەتی تورکان دەکەن تاخۆیان لە ئاخردا لە رێگای خۆتێخزاندنی هێمنانەوە بە سەرئەم ناوچەیە دا زاڵ بن. ئەو دەم سۆڤێت لە هەڵکەوتێک دا دەبێ کە نفوزی خۆی لە رۆژهەڵات تالێوارەکانی خوارووی دەریای خەزەر و بۆلای باکور و عیراقیش درێژە پێدەدا. ئەمە هەرەشەیەکە رۆبن پاشاهیوادارە لەو رێگایەوە لە تاران بگاتە ئامانجی مەعمورییەتی خۆی.

پرسی. سی. آر. داد، لێتنان کلنل، وابەستەی نیزامی.

**٢٨ - [راپۆرتی کونسولی تەورێز بۆباڵیۆزی بەریتانیا لەتاران، ٢٠ی گەلاوێژی ١٣٠٩]**

**پاشکۆی ئەوەڵ لەژمارە ٨٣، کونسول پالمر بۆ سر آرکلارو( ژمارە ١٤٥ نهێنی) تەورێز ١١ئاوگوست ١٩٣٠( ٢٠مرداد ١٣٠٩)**

ئاغای بەرێز! شانازیم هەیە بە عەرزت بگەیێنم:

١ - گوندەکانی ئارارات لە بنارەکانی(چیای ئارارات) چۆل بوون و سەر هەڵداوان لە گەل خاو و خێزانیان لە ٦٤ئۆردوی خێوەتی دا-نیزیکەی چل تاپەنجا ماڵ لە ئۆردوێکدا- بڵاوبوون.

٢ -برایم بەگ، سەرۆکی تەواوی کوردەکانی جەلالی{ تورکیاوئێرانیش }فەرماندەی گشتی یە.ە فەرماندەی ستادی ئەو ئیحسان نوری بتلیسی یە کە یەکێ لە ئەفسەرانی پێشووی تورکیایە. راوێژکاری ئەسڵی ئەو شێخ «خەلیل»(ناوی ساختە) خەڵکی ناوچەی بۆتان(خوارووی وان و سەرووی جزیرە)یە.

٣ - بە گشتی نیزیکەی ٣٠٠٠چەکداریان هەیە کە بە هاسانی دەتوانێ لە تایفەکانی دەور و بەر بگاتە ٥٠٠٠کەس.

٤ - بولاغباشی پاسگایەکی هێزەکانی ئێرانیە لەو سنورە و نیزیکەی ١٢٠٠یارد لە هەوەڵین پاسگای تورکان دوورە. تورک پاسگای ناوبراویان لەوبەهارەدا چۆل کردوە و ئێستا تائەو دیوی بایزید هیچ پاسەوانێکی تورکی لێ نیە. {بایزید[لە ژێر هەرەشەی دایمی کوردەکان دایە و زۆر جار دەست بە دەست دەبێ.«پۆستی بایزید» بە خوارووی شاردا تێدەپەڕێ و تائێستا کوردەکان دەستیان لێ نەداوە.

٥ - دەشتی بایزید لە بەشی رۆژهەڵاتی لە دەورەی سنووری ئێران نیزیکەی {٣٦میلی چوارگۆشە} پان و بەرینە و قامیشەڵان و زەلکاوێکی ئەوتۆیە کە تێپەربوونی پێدانا کرێ. لە دەور و بەری سێ یا چوارەمی مانگی یول تورکەکان بۆلای خوارووی رۆژهەڵاتی ئەم زەلکاوە چوونە پێش و لە وێوە ئۆردوگای کوردەکانیان تۆپ باران کرد. بەڵام کوردەکان پەلاماریان دان و پەنجاکەسیان لێ بە دیل گرتن و چوار شەست تیر و تۆپێکی سەحرایی - شیان لێگرتن.

٦ - پاش ٤-٥ رۆژ دیلەکانیان بە سلامەتی ئازاد کرد. بەڵام ئەفسەرێکی تۆپخانەی ئەرتەشی تورکیا، بە ناوی سمایل کە کورد و خەڵکی ئەرزەرومە، نەگەرایەوە و رەگەڵ ئەوان کەوت.

٧ - تورک چاوه ڕوان بوون له کاتی سەرکەوتنی ئەم هێرشەدا، بە هیوای گرتنی بستوی بولاغباشی، ئێرانیەکانیش پەلاماربدەن.

٨ - دوو ڕێگا بە بولاغباشیدا بۆ ئارارات دەچن. یەکیان بە نێو زەلکاوەکان و بنارەکانی ئارارات دا دەڕوا و ڕێگاکەی دیکە بەلای سەرووی ئەم ڕێگایەدا دەڕوا. هەریەک لەو ڕێگایانە بۆ پیادە ٢٤سەعات دەخایەنێ. ڕێگای دوایی بێ ئاوە و ماری ژاراویشی هەیە.

٩ - وەک دەبینین بار و دۆخی باسکراو، عەمەلیاتی نیزامی لەم ناوچەیەدا زۆر دژوار دەکا.

١٠ - لە ئارارات ئەشکەوتی زۆر هەنە کە لە هەموویان گەورەتر بەرەو رووی روسیایە کە دەتوانێ جێگای سەرهەڵداوان وخێزان وماڵاتیشیان بپێتەوە. ئەم ئەشکەوتە تەنیا دوو ڕێگای هەیە کە لە پاراگرافی ٨ داباسیکرا کوردەکان دەتوانن لە یەکیان بەباشی بەرگری بکەن، ئەوی دیکەیان بە هاوینێ هاتوو چۆی پێداناکرێ. بەزستانیش بەفرە.

١١ - لە ئۆردووی سمایل بەگەوە تا دەشتی بایزید نیزیکەی ٨میلە.

١٢ - کوردەکان ١٣ناگربار ( شەستتیر)یان هەیە. تۆپیشیان هەیە، بەلام کەرەسەیان نیە.

١٣ - تورک دەڵێن ئێستا ١٥فرۆکەی شەڕیان وەکار خستوە. بەلام لە یەکجاردا لە ٦ فرۆکە زیاتر نەبینراوە.

١٤ - کوردەکان بە دەستەی بچوک دابەشبوون و هەر یەکەیان بۆتە مەعموری ناوچەیەک. کوردەکان لەم ناوچانەدا مەڕ و ماڵاتی دەور و بەر بە تالان دەبەن. ئەومێگەلانە لە بەین نابەن. لە بەرانبەر پارە و بافیشەک دا -بە لە بەر چاوگرتنی کاتی دیاری کراو - دەیاندەنەوە بە خاوەنەکانیان. سمایل بەگ ڕێگاناد وەرزیرانی ئاشتیخوازی تورک توشی زیان بن. مەیدانی هەڵسوڕانی ئەم دەستە هێرش بەرانە، لە باکور تائیگدیر و لە باشور- یشەوە تا دەور وبەری ئەرزەروم درێژەی هەیە.

١٥ – ناوەندی فەرماندەیی تورکان ئێستا لە قەرەکلیسایە. وەک دەڵێن سالح پاشا فەرماندەی لەشکری نوهەم و ئێستا فەرماندەی گشتی رۆژهەڵاتە. پێشتر یەکیتر بە ناوی سوبحی پاشا فەرماندەی عەمەلیاتی پەلاماری مانگی یون بوە لە ئیگدیر.

١٦ – زەکی پاشا فەرماندەی لەشکری حەوتەمیش لەو عەمەلیاتەدا هاوبەشە.

١٧ – ئەکرەم بەگ فەرماندەی پێشووی پۆلیسی ئەستەمبوڵ، سەرۆکی ستادی سالح پاشایە کە فەرماندەی لەشکری نۆهەمی عەمەلیاتی رۆژ هەڵاتە.

١٨ – وادیتە بەرچاو، هێندێ لەو کوردانەی کە چاویان بە پاسگای باسکراوی ئێرانیان(بولاغباشی) کەوتوە، باسیان کردوە کە کلنل لاورنس یارمەتی بە کوردەکان دەکات.

١٩ – سەر هەڵداوانی جەلالی بە گشتی سێ ناوەندیان هەیە. برایم بەگی ناوبراو لە چیاکان، خالیدبەگ لە بەشی ئێران، سێ یەمی کە ئێشتاناوی نازانین لە قەرەسو، لە نێوان دوو ناوەندی باسکراو دایە. وەک دەڵێن ئەوەی سێ یەمیان لە گەڵ رووسان پێوەندیی باشی هەیە. ئەو دەنگۆیەی کە لە بارەی کلنل لاورنس لە رۆژنامەکانی روسیادا بلاو بۆتەوە دەستکرد و ساختەیە.

٢٠ – ئەم ئاگادارییانە شاهیدێکی عەینی ئامادەی کردوون کە پتر لە ٦حەوتوو لە ئارارات بوە. لە گەڵ ئەوەش نیزیکەی سێ حەوتوولەم روو داوانە رادەبرێ، چونکە کابرا دوای گەڕانەوەی بۆئێران نیزیکەی دووحەوتوو گیرا.

٢١ – ئیمرۆ کابرایەکیان هێنا کە من بۆ بە خزمەتگرتن بۆ جاسوسی کونسولگەری ورمێ باسم کردبوو.

٢٢ – هێشتالێرەوە هێزبۆ ماکۆ دەنێرن.

٢٣ – نوسخە بۆ باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە ئانکارا و کومیسیۆنی بەرز لە بەغدا ناردران. لە گەڵ رێز، ستنهۆپ پالمر .

٣١ ـــ كـاغـلـي بـالـيـوزخـانـەی مـۆسكۆ بۆوەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا، ٢٧ی گـەلاوێژی ١٣٠٩ . ژمـارە٨٠، ئاغـای سـتـرنج بۆئاغـای ای . هیندرسـێن(لە١٨ی ئاوگوست گەیشت)

مۆسكۆ ١٨ژ ئاوگوستی ١٩٣٠ (٢٧ی گەلاوێژی ١٣٠٩

ئاغـای بەرێز ! ستـآرنكـلایۆ لە نامـەی ژمـارە٣٢٧رێكەوتی ١٤یولی ١٩٣٠ی خۆی(كە نوسـخـەی چاپكراوی بەمن گەیشتوە} خەبەری داوە كە وەزیری دەرەوەی ئێران بروای تەواوی هەیە دەوڵەتی سۆڤێت خەریكە بە هێنانە گۆڕی ئەو بوختانە نارەوایە لای توركان كە دەوڵەتی ئێران سەر هەڵداوانی كورد هان دەدا و پشتیان دەگرێ، پێوەندی ئێران و توركیا تێک بدا. بە شانازییەوە پێت ڕادەگەیێنم لەم دواییەدا لە ڕۆژنامەكانی سۆڤێتی دا ئاماژەیەک بەو مەسەلەیە كراوە كە لە گەڵ قسەكانی فروغی خان جیاوازی هەیە. دیارە ئەوەش مانای ئەوە نیە كە ئەو لە هەڵ دایە.

٢ – ڕۆژنامەی« ئیزڤیستیا» لە١٤ی ئاوگوست تێلگرافێكی ئاژانسی تاسی لە ئانكارا بڵاو كردەوە دەری دەخست كە دەنگۆی ئاڵۆزی پێوەندی ئێران و توركیا تەواو بێ بناغەیە و پێوەندی ئەم دوو وڵاتە هێشتا دۆستانەیە.

٣ – ئیزڤیستیا » لە تەفسیرێكا لە سەرئەم تێلگرافە نووسی: « لەم دواییەدا ڕۆژنامەكانی دەرەوە، دەنگۆیان بڵاوكردۆتەوە كە لە نێوان ئێران و توركیادا خەریكە كێشەیەک سازبێ. سەرچاوەی ئەم دەنگۆیەش ڕاپەڕینی كوردەكانی ڕۆژهەڵاتی ئاناتولیە دژی دەوڵەتی ئانكارا. دەستەی ئەم كوردانە لە خاكی ئێراندا پێكهاتوون و لە وێ وەک پەنابەر دەژین. هەر لەو شوێنە كە لاورنسی ناسراو ڕۆژێک لە وێ نشتەجێ بوو، و دەوڵەتی توركیا لە یادداشتی خۆیدا ناتەبایی ئەم وەزعەی وەبیرهێنابۆوە. دەبێ وای دابنێین كە وتووێژی دەوڵەتەكانی ئانكارا و تاران، سەبارەت بەو مەسەلەیە گەیوەتە ئاكامێكی لە بار كە ئاژانسی رەسمی ئاناتولی توانی ئاگاداری سەرەوە ڕابگەیێنێ. ئێمەش بە بەشی خۆمان پاراستنی پێوەندی دۆستانەی نێوان دوو نەتەوەی براكە لە سیاسەتی خۆجێیی و دەرەوە دا

ئامـانجی وەک یەکی زۆریان هەیە و لە بەرانبەر دوژمنێکی هاو بەشدا وێستـاون ڕێز لێـدەگـرین. هەروەک هـەواڵدەری ڕۆژنامـەیەکی بیـرلین ڕایگەیاند، ئیمپریالیستەکان بە مەبەستی تێکدانی پێوەندی ئێران وتورکیا، کوردەکانیان بۆ ڕاپەرین هانداوە. ئاگاداری گەیشتووە ئاژانسی ئاناتولی دەری دەخات کە ئەم تاقەلایە سەرنەکەوتوە.»

٤ – ئەگەر مەتلەبی «ئیزڤیستیا» قەبوڵ بکەین، ئاگاداری ناو براو هەمان ڕاپۆرتی هەواڵدەری Borsen–Kurier برلین بوە لە تورکیا کە لە ژمارەی ١٣ی ئاوگوستی «ئیزڤیستیا» دا دووبارە چاپکراوەتەوە و لە وێدا گوتراوە کە پەلەکانی کورد بە ئاخرین جۆری ئاگربار و ڕۆلوێری ئینگلیزی چەکدارن و لە لایەن موهاجرێکی تورکەوە بە ناوی مەحمود ڕێبەری دەکرێن. ناوبراو وەک یەکێ لە پیاوانی کۆرێکی ئایینی – کۆنەپەرستی میسر–باسکراوە. لە درێژەی ئەم ڕاپۆرتەدا هاتوە کە لە مانگی فێورال کلنل لاورنس بە ناوی مەجید مەحمود چۆتە بەغدا و لە سەردانی نەخۆشێکی کورد دا پێشبینی کردوە کە لە ڕۆژرکانی داێ ڕووداوێک ڕوودەدا. پاشـان لاورنس لە ئێران لە شـاری مـاکۆ دەرکەوتوە کە لە نیزیکی سنووری تورکیا وناوەندی سەرهەڵداوانە.

«ئامـانجی ئەم ڕاپەرینە – سـەربەخۆیی کـوردەکـان – لە گەڵ بەرژەوەندی ئیمپریالیزمی ئینگلیز یەک دەگرێتەوە کە دەیەوێ نوختەیەکی ستراتیژی دژی یەکێتی سۆڤێتی لەم ناوچەیەدا پێک بێنێ. جگە لەوە سەرکوتکردنی کوردەکان بۆ تورک زۆرگران تەواوبوە. مەبەست ئەوەیە لەم ڕێگایەوە ئابووری تورکیا ئەوەندە لاوازبێ کە بۆ یارمەتی ماڵی بە ئینگلستانەوە ببەسترێتەوە. بەمجورە بە ڕاپەرینی کـوردەکـان دەکرێ بە بەردێک دوو باڵندە بکوژی. قـازانجی دووەمی شـێواندنی پێوەندی نێوان ئێران وتورکیایە.»

لە کۆتاییدا هاتبوو کە تێکهەڵچوون لە گەڵ تورکیا مەسەلەیەکی لاوەکی زیاتر نیە. ئامانجی سەرەکی، سازکردنی زەمینەی شەڕە دژی سۆڤێت. هەربۆ ئەم مەبەستەشە کە دوژمنەکانی دەیانەوێ شوێنێکی لە باری ستراتێژی بۆخۆ وەدەست بێنن.

٥ - گومانی تێدانیه ئیحساساتێکی وەها سەیرکە هاوسانی ئیزڤێستیایە، لێرە لە گەڵ پێشوازی یەکی گەرم بەرەو روو دەبێ.
لە گەڵ رێز .. ویلیام سترنج .

**٣٢ - [کونسولگەری ترابوزان بۆ باڵیۆزخانەی بەریتانیا لەئانکارا، ٢٤ بەکەلارێزان ١٣٠٩]**

**پاشکۆ لەژمارە، ٩٢ کونسول متی یوز بۆسرجی کلرک ژمارە ١٢٤ ترابوزان، ١٥ نوامبر ١٩٣٠ (٢٤ ابان ١٣٠٩)**

ئاغای بەرێز، شانازی راپۆرتم هەیە کە عەمەلیاتی عەسکەری دژی کوردەکان لە ناوچەی ئاگری داغ تەواوبوە. لە ناوچە جیاوازەکانی جیا بۆ پێشگری لە گەڕانەوەی کوردەکان لە خاکی ئێران و رووسیاوە، پاسگای نیزامی دانراون.

٢ - ئاگاداریم وەرگرتوە کە ئێستا عەمەلیاتی سەرکوتکردنی کوردەکانی دەرسیم هەربەو شێوەیەی کە سالی ١٩١٥ لە گەڵ ئەرمەنی یەکان کرا، بەرێوەدەچێ. لە گەڵ رێزم، دبلیو، دی، دبلیو متی یوز

**٣٣ ــ [وەزارەتی کاروباری دەرەوە بۆ وەزارەتی نێوخۆ، ١٢ گەلارێزانی ١٣٠٩]**

**وەزارەتی کاروباری دەرەوە، ئیدارەی گشتی کاری سیاسی، ئیدارەی رۆژهەلات، نمرە ١٢١٥/٧٧٠/١٢٩٤، رێکەوتی ١٣٠٩/٨/٩٢**

نهێنی. وەزارەتی نێوخۆ. یادداشتێک لە ژێرنمرەی٦٦/٢٤٤ لە باڵیۆزخانەی تورکیاوە بە وەزارەتی دەرەوە گەیشتوە کە کومیتەی داشناکسیۆنی ئەرمەنیەکانی تەورێز لە هیچ جۆرە یارمەتیەکی نهێنی بە کوردەکانی ئاگری داغ دەست ناگێرنەوە و پارە و چەک و ئازوخەیان پێدەگەیەنێ. بوونی کومیتەیەکی ئەوتۆ لەم سنوورە گرنگە بۆ پێشچوونی ئامانجی هەرتک لا بێ زەرەر نیە. هەر چەند وەلامی روونی باڵیۆزخانەی تورکیا دراوەتەوە، بەلام تکام ئەوەیە وەزارەتی دەرەوە لە ئەتیجەی

لێکۆڵینەوەی ئەو مەسەلەیە ئاگادار بکەن. هەروەها لە لایەن کونسولگەری دەوڵەتەوە لە موسڵ ڕاپۆرتێکیش سەبارەت بە بەشداری کومیتەی داشناکسیۆنی ئەرمەنی دانیشتووی سوریە و عیراق ،لە گەڵ سەربەخۆیی خوازانی کورد گەیشتوە و لەو بڕوایە دایە کە ئەرمەنیەکان لە ژێر چاوە دێری دوور نەخەنەوە و بە تایبەت کردەوەی شۆڤیرەکانی ئەرمەنی کە لە سنووری کوردستان و ئازەربایجاندا هاتو چۆ دەکەن و یانیشتەجێن زیاتر بخەنە ژێر زیرەوانی. [مۆر] وەزارەتی کاروباری دەرەوە [اسناملی.ک. ۲۳٤ ,۲ ,۰۰۲ ۲۹۳]

**۳٤ ــ[ایالت آزربایجان بەوزارت داخلە، ۲۸ابان ۱۳۰۹]**

**وزارت داخلەایالت آزربایجان، نمرە۱۱۹۹ بەتاریخ۲۸ابان ماە سنە ۱۳۰۹**

مستقیم ومحرمانە، وەزارەتی نێوخۆ، گەڕانەوە بۆ نامەی نمرە۶۵۷/۲٤٤ ڕێکەوتی ۲٤ی خەزەڵوەر، سەبارەت بە قسەکانی باڵیۆزخانەی تورکیا لە بارەی ئەرمەنیەکانی داشناکی تەورێز بە ڕێزتان ئاگاداردەکەم کە چۆنیەتی کێشە و بیر و ڕای تورکانو جاسوسانی سۆڤیێت لەم بارەوە پێشتر بە درێژی گوتراوە و دیارە پێشنەشی لە وەزارەتخانەی بەرێزدا هەیە. بۆیە ئێستا پێویست بە ڕوونکردنەوە ناکا، هەر ئەوەندە وەبیر دێنمەوە کە قسەکانی باڵیۆزی تورکیا، بە هەڵە یابە ئانقەست، بێ بناغەن. بە هێزترین بەڵگەی وریایی مەعمورەکانی ئازربایجان ئەوەیە کە ئەسڵەن هێنانە گۆڕی سیاسی ئەرمەنیان دژی بەرژەوەندی ئێرانیانە. جگە لەوە ئەگەر وریایی تەواوی مەعمور و هێزەکانی ئێرانی نە بایە، تورک نەیاندەتوانی بە لەشکرێکی نە زۆر ئاژاوەی ئاگری داغ دابمرکێنن. ئاژاوەی ناو براویش دوو مانگە کۆتایی هاتوە و دیارنیە لە تەورێزەوە چەک و کەرەسە بۆ کێ دەنێردرێ و عەمباری ئەم چەک و جبەخانەیە لە کوێیە ؟ داخوا دەکرێ گوێ بدرێتە ئەم جۆرە قسە قۆڕانە و بە مەیلی تورکان هێندێ کەس بخرێنە ئاستەنگی و لە ئاکامیشدا تورک کەلکی لێ وەرگرن. لە کاتێکا دەوڵەتی ئێران کوردەکانی جەلالی و عەشیرەتەکانی دیکەی مەڵبەندی ماکۆ چەک دەکا، داخوا دەکرێ بیرلە وە

بکرێتەوە کە لە تەورێزەوە ناوەندی ئەیالەتی ئازەربایجان چەک بۆ ناوچەی ناوبراو بنێـردرێ. بە بڕوای من ئەم قـسـانە نەک هـەر درۆن، بەڵکوو سـوکـایەتیـشـن بە ئابڕووی دەوڵەتی شـاهەنشـاهی. دەبێ بە جـیـددی ڕەخنە لە بالیۆزخـانە بگیـرێ. پێویستـە ئەوەش ڕوون کـەینەوە کە تورکـەکـان بۆ ئەوەی هێندێ لە ئـەرمـەنی و یاقـەفـقـازی یەکانی پێشـوو کە بوونە تەبـەعەی ئێران، بترسێن و بیانهێننە ژێر دەستی خۆیان، هەرەشەیان لێدەکەن کە دەتوانن بە دەستی مەعمورەکانی ئێرانی تووشی ئازاریان بکەن. ئاشکرایە لە کـاتی ئاوادا ئەرکی مـەعـمـورەکـانی ئازەربایجان ئەوەیە کە پێشی پێدان و دەست تێوەردانیان بگیرێ. بەڵام سەبارەت بە ڕاپۆرتی قونسولی موسڵ ئەوەی پێوەندی بە حـەوزەی ئازەربایجانەوە هەیە، هەمـیـشـە لە ژێر چاوەدێری دایە و جێگای نیگەرانی نیـە. بەڵام وەک قـونسـولی ناوبراو لە ڕاپۆرتی خۆیدا ئەمـاژەی بۆکردوە ناوەندی داشناکەکان کـە لە وێوە لە وانەیە لە تورکیا عەمەلیات بکەن، ناوچەکانی دەرەوەی ئێران وەک حەڵەب و بێروت و بەغدا و ناوەندی سـەرەکیـشیـان پاریسە. ئەگەر پێدانێک هەیە لەو ناوەندانەوە سـەر چاوە دەگرێ و پێـوەندی بە تەورێزەوە نیـە. [ئیمـزا] عـەلی مـەنسـور. مۆری ئەیالەتی ئازەربایجان [اسنادملی.۲۹۳۰۰۲۲۳٤]

**۳٥ـــ [ڕاپۆرتی نەظمیەی ئازەربایجان، ۱۳ی سەرماوەزی ۱۳۰۹]**

**وەزارەتی نێـوخـۆ، ئەیالەتی ئازەربایجـان، ڕوونووسی ڕاپۆرتی نەظمیـەی ئەیالەتی نمرە ٤٤۹٤/۳۱۱٤ ڕێکەوتی ۱۳۰۹/۱۰/۲۳**

بەدوای نامـەی نمرە ۲۰۱۲/٤۳٦۰.۲۰۱۲/۱۳، ۰۹/۱۰/۱۳ لە بارەی سـمـایل حـەقی بە ڕێزەوە ڕادەگەیەنرێ، ناوبراو پێشتر شابەندەری دەوڵەتی تورکیابوە لە ورمێ و لەم دواییەدا کە لە تەورێز بوە بە یەکێ لە مەعمورەکانی ئەم ئیدارەی گوتوە کە ناوبراو بە شـابەندەری دەوڵەتی تورکیـا لە خـوراسـان دیاری کـراوە. بەڵام سـەبارەت بە ڕابردوویێکی کە لە ورمێ هەیبوە، دەوڵەتی شـاهەنشاهی موافەقەتی نەکردوە و تا ئێستا [ئاگرمان]ی ناو براو لە لایەن وەزارەتی دەرەوە دەرنەچوە و تەکلیفی دیاری نەکراوە.

وەک بیستراوە سمایل حەقی ناوبراو بۆ مەعموریەتێکی تایبەتی هاتۆتە تەوریز و دوو کەسی بە جاسوسی بۆ بەغدا و موسڵ و کەرکوک ناردوون تاله خەیاڵی ژمنراڵ هاملتۆن، فەرماندەی هێز و حاکمی سیاسی ئینگلیز لە بەغدا لە بارەی وتووێژی مەسەلەکانی سنووری ئاگری داغ ئاگادار بێ کە لە نێوان دوو دەوڵەتی ئێران و تورکیا دەست پێکراوە. هەر وەها وەک بۆتە قاو کوردەکان لە بەهاری ۱۹۳۱تورکیا پەلامار دەدەن و ئێستا لە موسڵ و کەرکوک خەریکن خۆ ئامادە دەکەن و کلنل ئەمۆندز نوێنەری ژمنراڵ هاملتۆن مەعموری ئانجامدانی ئەم کارەیە. هەرتک کەسی ناوبراو کە دەبوایە ئاگاداری پێویستی بۆ کۆبکەنەوە وێی رابگەیێنن، لە موسڵ و بەغد اگیراون.

سمایل حەقی لە وتووێژدا دەری بڕیوە کە رووسەکان لە هەموو بەشێکی سیاسیدا یارمەتیان بە تورک کردوە وله هێندێ مەسەلەشدا تەواو یەکدەنگن. هەر وەها هەموو ئاگادارییەک بە هۆی بێسیمەکانی قونسولی سۆڤیێتی بۆ پیاوانی تورکیا وەردەگیرێن و لە ڕوو داوەکانی دنیا ئاگادار دەبن. بۆ ئاگاداری هەر وەک پێشتر پێتان راگەیەنراوە، سمایل حەقی لە تەورێزەوە بەرە و هەمەدان دەرکەوتوە، بە تێلگراف بە نظمیەی هەمەدان خەبەر دراوە کە ئاگاداری کردەوەکانی بن.

سەرۆکی نظمیەی شمال غرب، سرهنگ عبدلله سیف. ڕوونووس وەک راپۆرتە مودیری رەمزی ئەیالەتی. اقبال رضی.(مۆر)ی ئەیالەتی ئازەربایجان.
{اسناد ملی (ک) ٤٠٧٦}

### ۳٦ – {وزارت دربار بۆوەزارەتی نێوخۆ، ۲۹ ڕێبەندان ۱۳۰۹}
### {وزارت دربار پهلوی}نمره ۲۸٦ . ۱۳۰۹/۱۱/۲۹

نهێنی. وەزارەتی نێوخۆ. دیارە ئەو وەزارەتە لە یەکدەنگی نێوان کوردەکان و ئەرمەنیان ئاگادارە کە لە ڕێگای جۆربەجۆرەوە بۆ وەدەستهێنانی سەربەخۆیی کوردستان و ئەرمەنستان بە هاوکاری یەکتر تێدەکۆشن. بە تایبەت ئەم مەسەلەیە لە ئەیالەتی ئازەربایجان کە پێوەندی سنووری لە گەڵ ناوچەکانی کوردستان و

ئەرمەنستان هەیە و مەیدانی تێکۆشانی عناصری ناو براوە، زیاتر بەر چاوە و پێویستی بە سەرنجدانی ورد تری کار بەدەستانی خۆجێیی هەیە بۆ پێشگری لەو کارانە کە رەنگە لە ئاخردا زیان بە دەوڵەت بگەیێنن.

وەک ئاغای وەزیری نێوخۆ کە ئەیالەتی ئازەربایجانیشی لە ئەستۆ بوە و بە باشی ئاگاداری مەسەلەکانە، دەزانن کە تائێستا زیاترسەرنجی عنصری کورد دراوە و هەڵسورانی ئەوان لە ژێرچاوەدێری دابوە و سەبارەت بە فیرقەی داشناکسیۆن و هەنگاوی ئەرمەنیان بۆ یەکگرتنی تێکۆشان لە گەڵ کوردان ئاوڕی وە سەر نە دراوە. لە بەرئەوە دەستوری جیددی بدەی بە مەعمورەکانی خۆجێیی کە بە توندی لە هەڵسورانی فیرقەی ناوبراو بۆ تێکۆشانی هاوبەش لە گەڵ کوردەکان پێشگری بکەن و تێکۆشانی هەرتک فیرقە بە شێلگیری بخەنە ژێر چاوە دێری.
{مۆر}وەزیری دەرباری پەهلەوی،{ئیمزا} تەیمورتاش.

{لەپەراوێزدا}نهێنی، ٤٩١، نامەی ژمارە٢٨٦، ٢٩ /١١/ ٩، سەبارەت بە پلانی کورد و ئەرمەنی لە ناوچەکانی ئازەربایجان گەیشت. هەروەک پێشتریش بە ئەیالەتی ئازەربایجانتان ڕاگەیاندوە و چونیەتی هەنگاونان و ڕوونکردنەوەکانی ئەم بابەتە تان پێڕاگەیەنراوە، مەعمورەکانی ئازەربایجان هەمیشە مەسەلەی هاوکاری و یەکێتی کورد و ئەرمەنیان لە ژێر چاوەدێری دابوە و بە توندی پێشیان گرتوە. بە تایبەت سەبارەت بە ئەرمەنیان کە لە شاری تەورێز و هێندێ ناوچەکانی نیشتەجێن، هەرچەندە لە کوردستان دوورن ، لە گەڵ ئەوەش وریایی کراوە کە نەتوانن پێکەوە دانوساندنیان هەبێ و ئەگەر پێشتریش پێوەندی یان هەبووبێ، پچڕاوە. هەر وەک لەو ساڵانەی دواییدا چەند جار پەیکەکانیان گیراون و نووسراوەکانیان ڕاگیرکراون کە جارێکیان بۆ وەزارەتی دەرباری پەهلەویش ناردراوە. ئەرمەنیەکان لە شارەکانیش لە ژێرچاوەدێری دان و تەنانەت ماڵی هێندێکیان چەند جار پشکنراوە بە دایمی لە ژێر چاوەدێری مەعمورەکانی نظمیە دانە. وێناچێ بەم زیرەوانیە ئەوان بتوانن کارێکی زیانبار بکەن. هەر وەک نووسیوتانە دەستوری توند بە ئەیالەتی ئازەربایجان درا کە لەم بارەوە ئەو پەری

وریایی به کاربێنێ و له هەموو چالاکی یەکی ئەرمەنیان بە توندی پێشگری بکات...
{اسناد ملی ٢٩٣٠٠٢٢٣٤}

**٣٧ ـــ {نظمیەی ئازەربایجان بۆوەزارەتی نێوخۆ، ٣ خەرمانانی ١٣١٠ }**
**{وەزارەتی نێوخۆ، ئەیالەتی ئازەربایجان، ڕوونووسی ڕاپۆرتی نظمیەی ناوچەی سەرووی ڕۆژئاوا، ژمارە٥٥٩٥/٢٩٠٢/ ڕێکەوتی ١٣١٠/٦/٣٠**

نهێنی و ڕاستە و خۆ، ئەیالەتی ئازەربایجان... سەبارەت بە حسام الدین بەگ ئەتاشەی پێشووی باڵیۆزخانەی تورکیا ئاگادار دەکرێی هەرچەند ناوبراو لە ماوەی مانەوەی لە تەورێزدا چاوی بە کەسانی گومان لێکراو نەکەوتوە بەڵام بە گوێرەی لێکۆڵینەوەی دەرەوە دەردەکەوێ مەبەستی گرنگی ئەو لە هاتنی ئەم سنوورە وەدەست هێنانی ئاگاداریە لە بار و دۆخی کوردەکان و هەڵوێستی دەوڵەت لە گەڵ ئەوان و لێکۆڵینەوە لە بارەی هەڵسوورانی ئەرمەنیەکانی داشناکی تەورێزە. جگە لەوە هێندێ وتووێژی لە بارەی هاتنی شێخ قادر بۆ ئێران ونەگەڕانەوەی ئەو کردوە و مەبەستیشی ئەوە بوە کە مەعمورەکانی دەوڵەتی ئێران بە هۆی شێخ قادرەوە دڵنیاییان داوە بە کوردان کە دوای لێخۆشبوونی گشتی لە لایەن شاوە، سەرلە نوێ ئەوان لە ئاغگۆلی نیشتەجێ دەکەنەوە و لەم ڕووە زیان بە عەمەلیاتی پێشووی تورکان دەگات. سەبارەت بە سەفەری خەلیفەی ئەرمەنیانیش بۆ تاران ڕایگەیاندوە کە لە ئاکامی سەفەری ئەود ابریار دراوە ئەرمەنیەکانی داشناک لە گەڵ کوردەکان یەک بگرن و دژی دەوڵەتی تورکیا بۆ ڕاپەرین هەنگاو بنێن. هەر وەها لە بارەی سووتانی عەمباری زەخیرەی نظامیە و بیر و ڕای کار بەدەستان سەبارەت بە تورکان توێژینەوەیەکی ئەنجام داوە. لە سەفەری ورمێ-یش هەست بە چالاکیەکی نەکراوە و لە٢٥ی خەرمانان لە ڕێگای خۆیەوە بۆ لای ماکۆ ڕۆیشتوە. سەرۆکی نظمیەی ناوچەی سەرووی ڕۆژئاوا، سرهنگ عبدالله سیف، مۆری نظمیە {اسناد ملی .ک(٢) ٢٥٣٧}

## ئەوسەرچاوانەی ئاغای(بەیات) کەلکی لێ وەرگرتوون:

-اسناد منتشر نشده

- سازمان اسنادملی ایرا، اسناد وزارت کشور و نخست وزیری

- موءسسەپزوهش ومطالعات فرهنگی، اسناداعتلاء الملک خلعتبری وغیره.

Extrcts from Crrespondence relative to the TURCO–PERSIANBOUNDARY RELATIONS,1843–45,2PARTS,PART 1, 00910275.P.51.

منابع فارسی

- اقابکف،گ.س.،خاطرات اقابکف، ترجمه دکترحسین ابوترابیان، تهران،انتشارات پیام، ۱۳۵۷

- ابراهیمی بزرگ،« من کلنل لورنس ا نگلیسی رادستگیرکردم»، سالنامه دنیا،۱۳۳۵، ص ص ۴۹ــ۱٤۱.

- احتسابیان ، سرهنگ احمد،«تاریخچه نیروی تامینیه(ارتش)ایران» مجله ارتش شاهنشاهی،۳-۱ سال پنجم،فروردین ــ خرداد۱۳۲۵ اسکندری نیا،

- ابراهیم، ساختار سازمان ایلات وشیوهای معیشت عشایر اذربایجان عربی، ارومیه، انتشارات انزلی، ۱۳٦٦

- اعتمادمقدم، مهدی، یادی ازگذشته، تجریش،چاپ ایران، ۱۳٥٤

- افشار محمود،گنجینه مقالات، جلداول. مقالات سیاسی یا« سیاستنامه جدید»، تهران،مجموعه انتشارات ادبی وتاریخی موقوفات دکتر محمودافشاریزدی، ۱۳٦۸

- امیراحمدی، احمد، خاطرات نخستین سپهبدایران، بەکوشش غلامحسین زرگری نژاد،تهران،موسسه پزوهش ومطالعات فرهنگی، ۱۳۷۳

- امین، سرلشکرمحمود،«خاطرات»، مهنامەارتش شاهنشاهی، دی

۱۳۵۲،اردیبهشت ۱۳۵٤

– انتظام، نصرالله‌انتظام، به‌کوشش بهروز طیرانی و محمدرضاعباسی، تهران، انتشارات سازمان اسنادملی ایران، ۱۳۷۱

– بایبوردی، سرهنگ حسن، تاریخ ارسباران، تهران، انتشارات ابن سینا، ۱۳٤۱

– بیات کاوه، « تبانی شوروی و ترکیه، فروپاشی جمهوری ازربایجان ۱۳۲۰ »

– مجله نگاهنو، شماره۱۰، مهر___ابان ۱۳۷۱، ص ص ٤۹___۱۲۱، شورش عشایرفارس(۹۰___ ۱۳۰۷)،تهران،نشرنقره، ۱۳٦٥

– بیگلری، سرتیپ حیدرقلی،خاطرات یک سرباز، تهران، چاپخانه ارتش، ۱۳۵۰

– پژمان،سرهنگ ستاد عیسی، کردها و کردستان، گذشته‌های تاریخی، موقعیت جغرافیایی، وضع اقتصادی،مسائل اجتماعی وارایش ارمانهاودگرگونیهای سیاسی، ۲جلد، پاریس، انتشارات ژن ،ج۲(سیاسی)، ۱۹۹۲/۱۳۷۱

– دفترمطالعات سیاسی و بین ا لمللی(واحد نشراسناد)، اسناد معاهدات دوجانبه ایران و سایردول، ٥ج، تهران، ۷۱ ___۱۳٦۹، ج٥،

– گزیده اسنادسیاسی ایران و عثمانی، ٦ج،تهران،۷۰___۱۳٦۹ ،ج۲و٤ ،

– زارهواند، افسانه پانتورانیسم، ترجمه محمدرضازرگر، بامقدمه کاوبیات، تهران، انتشارات بینش باهمکاری انتشارات پروین،۱۳٦۹

– زرگرعلی اصغر، تاریخ روابطسیاسی ایران و انگلیس در دوره رضاشاه، ترجمه کاوبیات، تهران انتشارات معین وپروین، ۱۳۷۲

– ساسۆنی، کارو،جنبشهای ملی کرد و روابط ارامنه و کردها ، بی جا،بی تا،

– شمیم همدانی، علی اصغر، کتاب کردستان، تبریز، کتابخانه‌سعادت وسروش، ۱۳۱۲

– شیفته ،نصرالله، سه‌مردعجیب، سمیتقو، لورنس، سید فرهاد،تهران،۱۳۲٦

- صفی پور،علی اکبر، نبرد شهریور،جزوه‌های۹تا۱٦ تهران،بنگاه مطبوعاتی پروانه، ۱۳۲٤

- فـــرخ ســـــیـــــدمـــــهـــــدی،نظری بـه‌مـــشـــــرق،جلداول، تـاریخ سیاسیافغانستان،۱۳۱٤ تهران، چاپخانه مجلس، ۱۳۳۰

- کندال و دیگران، کـردها، ترجـمــه ابراهیم یونسی، تـهـران، انتـشــارات روزبهان، ۱۳۷۰

- کوچرا، کریس، جنبش ملی کرد، ترجمه ابراهیم یونسی، تهران، انتشارات نگاه، ۱۳۷۳

- مخبر، محمدعلی،مرزهای ایران، تهران، چاپخانه کیهان، ۱۳۲٤

- مـردوخ کردسـتـانی،شیخ مـحـمـد،تاریخ کـرد و کـردسـتـان و توابـع باتاریخ مردوخ، ۲ ج،سنندج، کتابفروشی غریقی، ۱۳۵۱ ، ج۱

- مشـایخ فـریدونی،آذرمیـدخت، مسـا ئل مـرزی ایران و عراق و تاثیران در مناسبات دوکشور،تهران، انتشارات امیرکبیر،۱۳٦۹

- مکی، حـسـین، تاریخ بیـست سـاله ایران، ٦ج،تهـران،ج۲، بـنگاه ترجـمـه و نشرکتاب، ۱۳۵۹

- منشـورگـرگـانی، م.ع.، سـیـاسـت دولت شـوروی درایران، ج۱ تهـران، چاپخـانه مظاهری، ۱۳۲٦

- نصـرت مـاکـویی، مـحـمـدرحیم، تاریخ انقلاب ازربایجـان و خـوانین مـاکو، چاپخانه علمیه، قم، بی تا

- نوری اسـفـندیاری، فـتـح الله، رسـتـاخـیز ایران، (مـدارک، مـقـالات و نگارشـات خارجی،۱۳۲۳ــــ۱۲۹۹)تهران، بی تا،۱۳۳٦

- نیکیتین، واسیلی، کرد و کردستان، ترجمه محمد قاضی، تهران، انتشارات نیلوفر، ۱۳٦٦.

**کتابهای خارجی**

_Arfa,Hassan,THE,KURDS,ANHISTORIKAL AND PO-

LITICAL SUTDY,OXFORD UNIVERCITYPRES 196
_BELOFF,MAX,THE FORIGION POLICY OF SOVIET RUSSIA 1929, VOL,1,OXFORD UNIVERCITY PRESS, 1965

_Bournoutian,G.A,Eastern Armenia in the Last Decades of Persian Rule1807–1828Undena Publications,Majibu, Californi 198

_Chirguh, Dr, Bletch, La Question Kurd, ses Origines et ses causes,leCaire, 193

_Forbes, Rosita, Conflict, Angora to Afchanistan, Cassell and Co.Ltd., London, 193

_Landau, M. Jacob, Pan-Turkism in Turkey, A study ofIr-redentism, Archon Books,Cinnecticut, 198

_Laqueur, Walter Z., Communism and Nationalism in Middle East7 Rautledge and Kegan Paul, 196

Lewis, Geoffry, Modern Turkey7Ernest Benn Ltd, 1974.

_Mammadzade, Mirza bala, Ermenilar veIran7 Baki, Azar-nasr, 199

_Nouri Pasha, Ceneral Ihsan, La Revolte Del, Ag-ridagh``Ararat``(1927–30)Preface deI,ch,Vanly, Editions Kur Ceneve, 198

_Natting, Anthony, Lawrence of Arabia, Signet Books, N.Y., 196

_Olson, Robert, The Emergence of Kurdish Nationalism, 188o,–1925, Univercity of Texas Press, 199

_Rezun, Miron, The Soviet Union and Iran, Soviet Policy in Iran from the Begning of thePahlavi Dynasty Until the Soviet Invasion in 1941, Westview Press, 1988.

_Silopi, Zinnar,Kurdustan Kurt Milletinin 60Senedenbir Es-aretten Kurtulus Suvasi Hatirati, Stewr Basim–evi, 1969

_سلوپی، زنار، فی سبیل کردستان(مذکرات)، ترجمه ر. علی المکتبه التقدمیه الکردیه___٢___، دارالکاتب

_Kurdish Nationalism, :" In- Siyamend, Othman, stigators andHistorical influence'"`,reproduced inArmenian Rview, Spring1982, vol.24, No.1, 165.

_Sykes, Mark, TheCaliphs Last Heritage, Arrgo Press, N,y., 1973

_VanBruinessen,Martin, Agha,Shaikh and State, The Sosial and Political Structureof Kurdistan, Zed Books Ltd london, 1992.

نشریات

– اینده ، (دوره اول)١٣٠٥

– اطلاعات، ٢٠ ___ ١٣٠٥

– حبل المتین، ١٣٠٤ و٩-٣

– ستاره ایران، ١٣٢٤

– کوهستان ، ١٣٢٤

مجله ارتش ، ١٣٢٥

مهنامه ارتش شاهنشاهی، ٥٤ ___ ١٣٥٣

یغما ، ٣٠ ___ ٢٨

# بزاڤی رزگاریخوازی کورد دوای شکانی ڕاپەڕینی ئارارات

نووسینەکەی ئاغای کاوە بیات تا ئێرە بە گوێرەی بەڵگە و دوکومێنتی باوەڕ پێکراو ڕەوەند و چۆنیەتی ڕاپەڕینی ئەرارات و ئەنجامی خەبات وتێکۆشانی کوردمان لە کوردستانی باکوڕ بۆ ڕووندەکاتەوە و دەری دەخات کە چارەنووسی تێکۆشانی کورد لەم بەشەی نیشتمانەدا چۆن دەبێتە گەمەی نێوان دەوڵەتانی تورکیا و ئێران. ئینگلیز و سۆڤیێتی پێشوش لە ڕوانگەی بەرژەوەند و سیاسەتی خۆیانەوە دە بنە تەماشاچی و پاریدەری سەرکوتکردن و لە بەینچوونی گەلێکی بندەست و بەشخوراو کە دژی زوڵم و زۆر داری حکوومەتی تورک خەبات دەکا و بۆ ئازادی و سەر بەستی وڵاتی خۆی ڕاپەڕیوە..

وەک لە لاپەڕەکانی پێشوو، لە وەرگێرانی بەشێکی کتێبی ئاغای کاوە بەیات دا باسکرا، ڕاپەڕینی ئارارات بە هاوکاری ڕاستەو خۆی لەشکری ئێران و تورکیا لە ساڵی ۱۹۳۰دا، لە دەشتی زیلان لە شەڕێکی دژوار و نابەرانبەردا توشی شکان و هەرەس دەبێ. بە گوێرەی هێندێ سەر چاوەی ئاگادار خەساری کوردەکان دەگاتە ۹۰۰ کوژراو، و۲٤۰۰ بریندار و۳٦۰ کەسیش بێ سەر و شوێن دەبن. خەسار و کوژراوی لەشکری تورک گەلێک لەوە پتر بوە و گەیوەتە ۲۸۰۰ کوژراو و٤۰۰۰ بریندار و ۱۷۰۰ دیل. ۱۲ فڕۆکەی شەڕی خراونەتە خوار و چەک و قۆرخانێکی زۆریشیان لێ گیراوە.

لە نێو مێژوو نووس و نووسەرانی کورد دا، توێژینەوەیەکی خەست و زانستی لە سەر ڕاپەڕینی ئارارات نەکراوە و یا من چاوم پێنەکەوتوە.. ئاکام و ئەزموونی

دەســتــپـێـک و شکانی بۆ بزووتنەوەی رزگـاریخـوازی کــورد شی نەکــراوەتەوە. ڕێبەرانی کوردیش لە سیاسەتی هەڵەی خۆیبوون و ڕێبەرایەتی ڕاپەڕینی ئارارت سەبارەت بە پشت بەستن بە دەوڵەتانی دوژمنی کورد دەرسـیـان وەر نەگرتوە. ئەم ڕێبازە چەوتەی پشت بەستن بە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان و هەڵپەڕین بە سازی ئەوان تا ئێستاش لە نێو بزافی ڕزگاریخوازی کورد دا، هەر بەر دەوامە.

بۆ ڕوونبوونەوەی زیتری کارەساتی دڵخداری ئارارات، بە پێویستم زانی چەند لاپەڕەیەکیش لە نووسـراوەی رۆژنامـە نووسی فـەرەنسی کـریس کـۆچرا بە ناوی (روخانی کۆماری ئارارات) سیپتامبری ۱۹۳۰ بکەم بە کوردی و بیخەمە سەر لاپەرەکـانی پێشـوو، بۆ ئەوەی خـوێنەرانـی کـورد زیاترلە گـەڵ بەشـێکی دیکەی مێژووی خوێناوی نەتەوەکەمان شارەزابن.

## «رووخانی کۆماری ئارارات( سیپتامبری ۱۹۳۰ )

لە نیوەی مانگی ئاوگوست دەوڵەتی تورکیا هاتە سەر ئەوە کە ئیتر گوێ نەداتە ویست و حـەزی دەوڵەتی ئێـران. فـەرمـانی دا بە ژەنراڵ سـاڵح پاشـا ئەو کـوردانە پەلامار بدات کە لە ئارارات پەنایان گرتوە. ڕۆژی حـەوتەمی سیپـتامـبری ۱۹۳۰ ساڵح پاشا فەرمانی هێرشی یەکجاری بۆ سـەروی ئارارات دەردەکا. لە دەیەمی سیپـتامـبر هێزی سـاڵح پاشـا پێگەی نێوان دوو ئارارات واتە ( زینوێ سەردار بولاک) دەگرێ. ئـەوە بە مانای کۆتایی کارە. کوردەکان کە دەکـەونە بەر ڕاوە دووی هێزی تورک، بەرەو خوار ڕادەکەن. ئیحسان نوری« فەرمـاندەی گشتی هێزەکانی کــورد» پەنا بۆ ئێـران دەبا و تا ئـاخـری ژیانی (نیـوەی ئەپریلی ۱۹۹٦) لە تاران ژیاندەباتە سەرەر.

بەڵام لە ڕاسـتـیدا هـیچ شـتێ کۆتایـی پێنەهاتوە. تـورک ڕیوایەتی درۆ لە سـەر ڕووداوەکـان دەگـێـڕنەوە. مـێـژوو نـووسـانی کـوردیش نـایانەوێ هێندێ ڕووداوی

ناخۆشی ئەم کارەساتە روون بکەنەوە. ئەوان بە تایبەت بە سەر ئەم مەسەلەیەدا بازد دەدەن کە ئیحسان نووری لە چ کاتێکدا قەرارگای فەرماندەیی بە جێ هێشتوە و پەنای بۆ ئێران بردوە. لە کاتێکا رۆیشتنی ئەو بۆ ئێران وەک راکردن وایە. بە درێژایی ساڵی ١٩٢١ لە ناوچەکانی سەر سنووری ئێران وئارارات شەڕ درێژەی هەیە و بە گوێرەی هێندێ زانیاری وادێتە بەر چاو کە ئیحسان نوری لە کاتێکی زۆر ناسک دا، لە پایزی ١٩٣٠ لە مەیدان رایکردوە. کۆمیتەی خۆیبوون کە کردەوەی فەرماندەی دەستنیشانی ئەو بۆتە هۆی سەر شۆڕی، ئیتر نەیویستوە کەسێکی دیکە لە جێگای ئەو بکاتە فەرماندەی ئەو کەسانە کە هەروا شەڕ درێژە پێدەدەن. هەر ئەوانە پشت ئەستوردەکا کە لە نێو خۆیاندا دیاری کراون. (١)

لێکدانەوەی کۆماری کوردیی ئارارات گەلێک خەفەت هێنەرە. کوردەکان لە( زیلان و ئارارات) تووشی شکان و هەرەس دەبەن. زۆربەی کادر و سەنگەری ئاراراتیان لە دەست داوە. ئەو چەک و قۆرخانەی کە لە ماوەی چەند ساڵدا کۆیان کردۆتەوە، فەوتاوە و لەکیس چوە. سەرەڕای نەبوونی زانیاری تێر و پڕ لە بارەی شێوەی شەڕ کردنیان، دەکرێ بگوترێ کە کوردەکان بە گشتی بە تاکتیکی شەڕی جەبهەیی و بەرەنگار بوونی بە نەزم لە جیاتی شەڕی پارتیزانی، لە تەواوی کوردستاندا توشی خەتایەکی لە قەرەبوو نە کراوە هاتوون.

## کشانی شەڕ بۆ ناو ئێران(بەهاری ١٩٣١)

دەوڵەتی ئێران سانسۆرێکی گەلێک توندی خستبوە سەر رووداوەکانی سەر سنوور. بەڵام زوو دەرکەوت کە وەزعەکە هێندەش رێک و پێک نیە. لە نیوەی مانگی مارسی ١٩٣١ دوای پەلاماری کوردەکان بۆ ناوچەی ماکۆ، فەرماندەی نیزامی تەورێز هێزێکی گەورەی یارمەتی بە فەرماندەیی ژەنراڵێک بۆ ناوچە دەنێرێ. دیپلۆماتەکانی تاران چاوەڕوانی ئەوەن کە بەفرەکان بتوێنەوە و شەڕ دەست پێبکرێتەوە.

دەوڵەتی ئێران سیاسەتی خۆی دەگەڵ سیاسەتی تورکان دەکاتە یەک و کوردە

جەلالیەکانی دانیشتووی ناوچەی نێوان ئارارات و سنووری سۆڤیێت بە کۆمەڵ ڕادەگوێزێ. لە سەرەتای ئەپریلی ١٩٣١ موسافیرێک توشی کاروانێکی کوردە دوور خراوەکانی باکور دەبێ بە درێژایی دە کیلۆ میتر هەموویان ژن و منداڵن و پیاویان دەنێو دانیە. سەبارەت بە زۆریی عارەبانە و حەیوانات دیاریکردنی تەواوی تاراوەکان دژوارە. بەڵام بە تەخمین ژمارەیان دەگاتە پێنج هەزار کەس. (٢)

خالیدئاغا یەکێ لە سەرۆکانی عێلی جەلالی نایەوێ گوندەکانی چۆڵ بکا، لە گەڵ کەس و کاری خۆی پەنا بۆ تورکیا دەبات. هەر لەو کاتەشدا موسافیرێکی دیکە کە بە ناوچەی بایزید و ئیگدر دا تێدەپەڕێ، تەواوی ناوچە پڕ لە سەربازی تورک دەبینێ. لە لای ئارارتیشەوە دەنگی دەستڕێژی تۆپ و ڕەشاش و هەرای شەڕ دەبیسێ. لە لایەکی ترەوە دەردەکەوێ کە تورکەکان پتر لە دە کیلۆ میتر هاتوونە نێو خاکی ئێران و لە بارەی گۆڕینەوەی ئاراراتی بچوک لە گەڵ بەشێکی ناوچەی قەتور لە گەڵ کار بە دەستانی ئێران خەریکی چەنە لێدانن.

## هێزەکانی مەوجود لە ناوچە :

ژمارەی هێزەکانی دەوڵەتی ئێران ساڵی ١٩٣١ لە ناوچەدا دەگەنە ٢٨٠٠ سەرباز. دوو هەزار سەربازی خزمەت تەواو کردوویشیان بانگ کردوونەوە لە گەڵ ٣٠٠ کوردی سەر بە دەوڵەت. (بە زاراوەی ئێستا جاش). هێزی هەوایی ئێرانیش ٣ فڕۆکەن کە بۆ گەڕان و شارەزایی کەلکیان لێ وەر دەگرن.

هێزی کوردەکان بریتیە لە ٦٠٠ - ٧٠٠ کەس لە عێلی جەلالی و حەیدەرانلو، لە گەڵ ٣٠٠ کەس لە کوردەکانی ئارارات کە بە تفەنگی تازەی ئەفتۆماتی خەشاب ٢٥ فیشەک خۆر چەکدارن. فەرماندەی ئەوان کەسێکە بە ناوی فەرزندە کە لە لایەن کومیتەی خۆیبونیشەوە پەسند کراوە. سەرۆکی ستادیشیان یەک لە کوڕەکانی برایماغای جەلالیە کە بە( برۆ) ناسراوە.(٣) ئەرمەنی داشناکیش هەر وەک ساڵی ١٩٣٠ پێوەندی و کەل و پەلیان بۆ دابین دەکەن.

## هەوەڵین قۆناخی ئۆپەڕاسیۆنی ئێرانیەکان(مای- یونی ١٩٣١)

هێزەکانی ئێرانی بۆ پێشگری لە تێکۆشانی سمایلاغای جەلالی بۆ کۆ کردنەوەی شۆڕشگێرانی ئارارات، لە نیوەی مانگی مای ١٩٣١ دژی قەرە عەینی ( کانیە رەش) دەست بە هێرش دەکەن. کاتێ سمایلاغا لە پێشرەوی ئێرانیەکان ئاگادار دەبێ، بە دار ودەستەوە پەنا بۆ تورکیا دەبات. ئێرانیەکان ناوچە چۆلکراوەکە داگیر دەکەنەوە.

١٩ی مانگی مای کوردەکانی جەلالی بە یارمەتی خەباتگێرانی کوردی تورکیا ئۆردوگای ئێرانیەکان پەلامار دەدەن. بە گوێرەی وەزمانهاتنی کەرەمخانی سەیاح سەرۆکی کومیسیۆنی ئەمنیەتی سنووری ئێران و تورکیا، ئەم پەلامارە بۆ ئێرانیەکانی موسیبەتی بە دواوە بوە. نیزیکە ١٢٤تا ٢٠٠ سەربازی ئێرانی کوژراون، ٣٠٠ کەسیشیان بریندار بوە. بەلام بە قسەی سەرچاوە دیپلۆماتەکانی بەریتانیا ئەژمارەی کوژراوی ئێرانیەکان سێ ئەوەندە بوە. زیانی کوردەکان کەم بوە. تەنیا حەوت مەیتیان لێ بە جێماوە. (کوردەکان هەمیشە کوژراوەکانیان هەڵدەگرن ولە مەیدان لایان دەبەن.) بە دوای ئەوەدا سانسۆرێکی زۆر توند دەخرێتە سەر دەنگو باسی ئەم ئۆپەراسیۆنە. ئەو سەربازانەی دەنگو باسی ئەم شەڕە بڵاو بکەنەوە دەدرێنە دادگای زەمانی شەڕ. سەیر ئەوەیە، ئێرانیەکان کە لە ئاخردا سیاسەتێکی توندیان دژی کوردەکان گرتۆتە پێش، گلەیی لە تورکان دەکەن کە هاوکاری تەواویان نەکردوون. بە تایبەت سەرهەنگ کەرەمخانی سەیاح تورکەکان تاوانبار دەکا کە سیاسەتێکی ئاشتیخوازانەیان لە ئاست کوردان گرتۆتە بەر. هەر ئەو کابرایە لە کاتی ئوپەڕاسیۆنی ئەرتەشی ئێران لە ١٩ی مای تا ٩ی یونی لە شێوەی ڕەفتاری تورکان گلەیی دەکات. (٤)

## دووهەمین قۆناخی ئۆپەڕاسیۆن( یولی ١٩٣١)

سەرەڕای وتاری توند و تیژ، هاوکاری نێوان ئەرتەشی تورک و ئێران پەرە دەستێنێ. لە کاتێکا ئەرتەشی تورک خەریکی ڕاوەدوو نانی کوردەکانە، بە قسەی

سەرۆکی کۆمیسیۆنی سنوور، سێ ئەرک بۆ ئەرتەشی ئێران دیاری کراون :

- بەستنی سنووری ئێران بۆ پێشگری لە کوردەکان بە هەر شێوەیەک بێ.

- چۆلکردنی ناوچەکانی سنووری ئێران لە کورد و قەدەغە کردنی هۆبە چیەکان

- شەڕ دژی ئەو کوردانەی کە لە ناوچەدا خەریکی ( ڕاو و ڕووتن )

لە سەرەتای مانگی یول، هێزەکانی ئێران قەرەعەینی دەگرنەوە. بەڵام لە چواری یول دەکەونە بەر پەلاماری کوردەکانی ئێران و تورکیا و زیانێکی قورسیان پێدەگات. ڕۆژی دوایی کوردەکان گوندێکی ئێران پەلامار دەدەن و ٥٠ کەسیان لێدەکوژن. ئێرانیەکان سەربازانی تورک تاوانبار دەکەن کە جلی کوردیان لەبەر کردوە و بە هاواری کوردانەوە هاتوون. تورکیش هەر لەو کاتەدا ڕووسەکان تاوانبار دەکەن کە گۆیا چەکیان داوە بە کوردەکان. ( ٥ )

## هاوکاری تورکیا و ئێران دژی کوردەکان

سەرەڕای گۆڕینەوەی تۆمەت و بوختان ئانکارا و تاران پترلێک نیزیک دەبنەوە. ئێرانیەکان لە گەڵ ئەوە نین کە تورک چەندی بۆیان بکرێ کوردەکان بەرەو ئێران ڕاو بنێن. بەم بیانوە کە ناوچەکە زۆر شاخاوی نیە و لە بەین بردنیان لەوێ هاسانترە.

لە سەرەتای ساڵی ١٩٣٢ دوو هەیئەتی تورک بە ڕەسمی سەر لەئێران دەدەن. یەک لەوانە بە سەرۆکایەتی جەلال بایار سەرکۆماری داهاتووی تورکیا، قەراردادی ماڵی وئابووری لە گەڵ ئێران ئیمزا دەکا. ئەوی دیکەیان بە سەرۆکایەتی توفیق رشدی وەزیری دەرەوەی تورکیا بەو مەبەستە هاتبوە ئێران کە ناوچەی ئاراراتی بچوک لە جیاتی هێندێ خاکی تورکیا بە شەش گوندی کورد نشینەوە لە ئێران وەر بگرێت، مەسەلەکە بە خۆ تێهەڵقوتاندنی ڕاستەو خۆی رەزاشا چارە سەر دەکرێ . (٦)

وەک لە ڕوانینی بەڵگەکاندا دەر دەکەوێ لە شکانی ڕاپەڕینی ئارارات دا، تاوانی

حکوومەتی ئێران و شەخسی ڕەزاشا لە جنایەت و تاوانی مستەفاکەماڵ و حکوومەتی تورک کەمتر نەبوە. هەر لە وێوە چەوتی سیاسەتی خۆیبوون بۆ پشت بەستن بە دەوڵەتی ئێران و (میللەتی برای فارس و هاو ڕەگەز) و، وە پشت گوێ خستنی پشتیوانیی کورد ئیتر بە جوانی ڕوون بۆتەوە و بە داخەوە تا ئێستاش ڕێبەرانی بزووتنەوەی کورد لە هەموو بەشەکانی کوردستان، هەر لە سەر ئەو سیاسەتەی پشت بەستن بە دوژمنی نەتەوەکەیان ڕۆیشتوون و هیچ سەر کەوتنێکیشیان لە بواری خەباتی نەتەوایەتیدا وەدەست نە هێناوە. هۆی سەرەکی ئەم سەر نەکەوتنە بە ڕای من دەبێ لە وەدا بدۆزرێتەوە کە سەرەڕای لافیتە و دروشمی جوانی « کوردایەتی و نەتەوایەتی» بەر لە هەموو شت بەرژەوەندی حیزبایەتی تەسکیان لە بەر چاو بوە. بۆ قازانجێکی کەم و ماوە کورتی حیزبی بەرژەوەندی گشتی نەتەوەییان خستۆتە پشت گوێ و نەک هەر ئەوە بەڵکو زۆر جار بە سودی دوژمن و زیانی کورد کاریشیان کردوە.

«..... ناکرێ ئەوەش لە بەر چاو نەگرین کە نیزیکبوونەوەی حیزبی داشناکی ئەرمەنیش لە بزووتنەوەی ئارارات تەئسیری مەنفی لە سەر ڕاپەڕین نەبوبێت. هەر چەندە ڕێبەرانی بزووتنەوەی ئارارات بە مەبەستی وەرگرتنی یارمەتی و پشتیوانی لە داشناک نیزیک بووبنەوە، بەڵام دەوڵەتانی تورک و ئێران و سۆڤێتیش نیزیکی و یەکێتی کورد و ئەرمەنیان بە زیانی خۆیان زانیوە و بۆ لە بەینبردنی ڕاپەڕینی ئارارات هاوکاریان کردوە. حیزبی داشناکی ئەرمەنیش بە نۆرەی خۆی ویستوویەتی بە قازانجی خۆی لەم نیزیکبوونەوەیە کەلک وەربگرێت، لە کاتێکدا بە کردەوە دەرکەوتوە کە نیزیکبوونەوەی بزووتنەوەی کورد لە حیزبی داشناک بۆ کورد خێری تێدا نەبوە.شایانی سەرنجە کە (واهان پاپازیان)یەکێ لە ڕێبەرانی حیزبی داشناک، بە نیشانەی یەکێتی نێوانی کورد و ئەرمەنی لە کۆنگرەی دامەزرانی خۆیبووندا بەشداری کردوە. ئەم یەکێتییە بۆ ڕێبەرانی کورد کە بە توندی پێویستیان بە دابینکردنی سەرچاوەیەک هەبوو بۆ یارمەتی و پشتیوانی کارێکی بنگەهی بوو. بەریتانیا ئیتر دەستی بە سەر چالاوە نەوتیەکانی موسڵدا گرتبوو.

پێوەندی نێوان فەرانسە و ئانکارا زۆر باشبوو. لە گەڵ ئەوەشدا ئەم دوو دەوڵەتە( واتە فـەرەنسـە و بەریتـانیـا ح ) ئەم بەیتـو بـاوەیان بڵاو دەکـردەوە کـە ڕۆژئاوای شارستانی لە وانەیە یارمەتی بە کوردان بکات. دیارە لە ڕاستیدا ئەوە بەو مانایە بوو کـە دەسـەڵاتە ڕۆژئاواییـەکان دەیانتوانی لە نفوزی خـۆیان لە سـەر ڕێبـەرانی کـورد بۆ وتو وێژی دوا ڕۆژ لە گـەڵ ئانکارا کـەلک وەربگرن. وادیتـە بەر چاو کـە حیزبی داشناک بە پشتیوانی ڕۆژئاوا پشت ئەستوور بوویێت. ڕەنگە لە بەر ئەوەش بێ کە نەک هەر بۆ ئازادی ئەرمەنستانی تورکیا تێدەکۆشا، بەڵکوو دژی دەسەڵاتی سۆڤێتیش بە سەر ئەرمەنستانی رووسیادا خەباتی دەکرد. ئەم حیزبە ساڵی ١٩٢٠ لە ئـەرمـەنسـتـانی سۆڤێت وەدەر نرابوو. لەم بارەوە تێکۆشانی لە گەڵ بەرژەوەندیی نەیارانی سۆڤێت یەکی دەگرتەوە. بـەڵام حیزبی داشـنـاک لە کوردسـتـان پێگەیەکی کـۆمـەڵایەتی نەبوو، لـە کـاتێکا خـۆیبـوون لە لایەن کـۆمـەڵانـی هـەراوی خـەڵکەوە پشـتیوانی لێدەکرا. بەڵام دەسـتی وەسـەر چاوە و دەرەتانێک ڕانەدەگەیشت کە بۆ درێژە پێدانی خـەبات پێویستی بوو. لە ئەنجامی ڕێککەوتنی نێوان ڕێبـەرانی میللی کورد و ئەرمەنیدا، و ڕەنگە بە ویستی ئەرمەنیەکانیش بوو بێت کە ناوچەی ئارارات لە دراوسیـەتی ئەرمـەنسـتـانـی سۆڤێتی بۆ ناوەندی ڕاپەڕین هەڵبژێردرابێ. هۆیەکی دیکە کـە کـاری کـردە سـەر ئەم هەڵبـژاردنە، سـەرنجـدانی ئەم ڕاسـتـیـە بوو کـە پێکهـێنانی هێـڵی پێـوەندیی نێـوان ئارارات و ئێـران کـە بەڵێنی یارمـەتی بە بزووتنەوەی کورد دابوو، هاسانتر بوو. شای ئێران بە یارمەتی ئەم ڕاپەڕینە هەموو شتێکی وەدەستهێنا. ڕکە بەری خۆی، واتە تورکیای مستەفا کەماڵی لاواز کرد. نفوزی ئەو لە سـەر بزووتنەوە دەرەتانی ئەوەی بۆ پێکهێنا کە لە کوردستانی ئێران پێشی ڕاپەڕینی سمکۆ بگرێ. » (٧)

دوای سـەرکوتکردنی ڕاپەڕینی ئارارات هێندێ لە ڕێبـەرانی بزووتنەوە دەتوانن خۆ بگەیێننە ئێران. هەر وەک باسکرا لە وێش توشی کوشتار و ئازار و بەندیخانە دەبن. هێندێ دەگیـرێن و ئیـعدام دەکـرێن. بە گـوێرەی ڕاپۆرتـی (ال رامـبـوا) لە بازێری (وان)سـەد کـەس لە خـوێندەوارانی کـورد دەخـەنە ناو تەلیس و زارکی

دەدروون و دە گـۆلی ( وان) یان داوێن. حکوومــەتی تورک چەند مــانگیش دوای شکانی ڕاپەڕینی ئارارات دێهاتی کورد بۆمـباران دەکـا و دەیانسـوتێنێ . ناوچە کـورد نشـینەکـان بە جـارێ وێران دەکـرێن. هەزاران کـەس کـە لە ڕاپەڕینیـشـدا بەشدار نەبوون، دەگیرێن و دەکوژرێن و دوور دەخرێنەوە.

محمد ئەسـعەد بوزهوت وەزیری دادی تورکیا ڕادەگەیێنێ: « ئێمە لە وڵاتێکدا دەژین بە نـاوی تورکـیـا کـە وڵاتـی هـەرە ئازادی جـیـهـانە. من وەک نوێنـەری ئێـوە هەست دەکەم بتوانم بیر و ڕای خۆم ڕک و ڕاست دەر ببڕم. من لەو بڕوایە دام کە تەنیـا تورکەکـان ئـاغـا و ئەربابی ئەم وڵاتە بن. ئەوانەی لە ڕەگەزی ڕەسـەنی تورک نین لەم وڵاتەدا تەنیـا دەتوانن یەک مــافـیــان هەبێ، مــافی ئەوەی کــە خــوڵام و خزمەتکار بن.»(٨)

دیارە سەبارەت بە بەرنامە و سیاسەتی خۆیبوون و ڕاپەڕینی ئارارات بیر و ڕای جیاواز هاتوونە سەر کاغەز و باسکراون. «.... بەشێک لە تاوانی کوشت و کوشـتـاری دوای ڕاپەڕینی ئاراراتیش دەزگـای ڕێبـەرایەتی کـورد، واتە خۆیبـوون دەگرێتەوە کە پێش ئەوەی دەرەتانی سیـاسی و مـادی پێویست بۆ ڕاپەڕین ئامـادە بکرێ، ڕاپەڕینیـان دەستپێکرد. کـورت ڕوانیی خـۆیبـوون بوو بە هۆی نیـزیکی و پێوەندی زیاتری نێوان تورکیا و ئێران و یەکێتی سۆڤێتی. بەڵام بە سـەرنجدانی بەرنامەی ئارامسـازی کە لە سـەرانسـەری کوردسـتـان بەڕێوە چوو، تەنیا هەر لە ناوچەی ڕاپەڕین تەنگە بەر نەکرا، دەبێ قبوڵ بکەین ئارارات تەنیا بوو بە بیانوی ئەوە کە ئانکارا بە جێگەیاندنی بەرنامەی ( تواندنەوە) وەپێش بخات. » (٩)

ئەم بۆچوونەی کـەنداڵ نەک هەر بۆ ڕاپەڕینی ئارارات و سـیـاسـەتی ڕێبـەرانی خۆیبوون، بەڵکوو بۆ زۆربەی ڕاپەڕین و سـەرهەڵدانی کوردەکان تاڕادەیەکی تەواو ڕاست دێتە بەر چاو .

کارکرد و دەنگی ڕاپەڕینی ئارارات هەر لەو مەڵبەندەدا تەنگە بەر نابێ و کار دەکاتە سەر هەستی کورد لە بەشەکانی دیکەی کوردستانیش. کۆمەڵێکی پچووکی نهێنی کە لە موکریان دامەزراوە و قازی محەممەد و مەلا ئەحمەدی فەوزی و قازی

کاکە حەمەی بۆکان و شێخ ئەحمەدی سریلاوا و سەیفە لقوزات و هیتر دەجوڵێنێ، پێوەندی لە گەڵ ئاراڕات دەگرن و بە گوێرەی توانا یارمەتیان پێدەگەیێنن. دیارە تێکۆشانی ئەم کۆمەڵەیە لە لایەن پۆلیسی ڕەزاخانەوە هەستی پێدەکرێ و بەڵام نایانەوێ بە ناوی کورد و یا بزووتنەوەی کوردستان ڕاویان بنێن. دەیانەوێ بیلکێنن بە بزووتنەوەی ئەرمەنی و ناوی کورد نەیەتە گۆڕێ. لە تیلگرافێکدا کە عەلی مەنسور والی ئازەربایجان بۆ سەرەک وەزیری ئێرانی ناردوە دەنووسێ :« .. لە سابلاغیش ئەو کەسانەی کە ڕاتگەیاند بوون لە ژێر چاوە دێری دان، بەم زوانە بانگ دەکرێن و پرسیاریان لێ دەکرێ. بەم جۆرە باسی نەخشەی یەکێتی کورد و ئەرمەنی کە ناوەندێکی دەرەوەی هەیە لە ئازەربایجان لە گوڕ کەوتوە و لە ڕاستیدا پوچاوەتەوە.. » (١٠)

دوای شکانی ئاراراتیش کە ئیحسان نوری پاشا دەچێتە تاران، قازی محەممەد و سەیفی قازی و حاجی سەید عەبدوڵا ئەفەندی وەدوای دەکەون و دەیانەوێ بیهێننەوە کوردستان کە ئەرتەشی ئێران ڕێگا نادات.

لە سوریاش خەڵک پشتیوانی خۆی لە ڕاپەڕینی ئارارات ڕادەگەیێنێ. حاجۆ یەکێ لە ڕێبەرانی کوردی سوریا لە گەڵ چەند چەکدارێکی دەکەسی لە سنوور دەپەڕێتەوە و لەپێنجەمی ئاوگوستی ١٩٣٠ لە ناوچەی نسیبەین گوندێک دەگرێ و بەیاننامەیەک بە پشتیوانی سەر بەخۆیی کورد بلاو دەکاتەوە و داوا لە کوردان دەکا بۆ یارمەتی هاونیشتمانانی خۆیان لە ئارارات ڕابن و شەڕ بکەن.

لە عیراقیش شێخ ئەحمەدی بارزانی لە یولی ١٩٣٠ چەند سەت کەس لە شەرکەرانی کورد بە هاواری ئاراراتەوە دەنێرێ. لە ٢٦ی یولی ١٩٣٠ دەوڵەتی تورکیا لە سەر ئەم کارە بە ڕەسمی گلەیی لە باڵیۆزی بەریتانیا دەکات. شێخ ئەحمەد لە مانگی ئاوگوستی ئەو ساڵەدا دەستەی دووەمی شەڕکەرانی خۆی بۆ یارمەتی کوردستانی تورکیا بە ڕێدەکات. ئەم دەستەیە لە گەڵ ئەرتەشی تورک توش شەڕدەبێ و ناتوانی پێشڕەوی بکات. دوای شکانی ڕاپەڕینی ئاراراتیش شێخ ئەحمەدی بارزانی گەلێک لە نیشتمانپەروەرانی کوردستانی تورکیا پەنا دەدا

که لە ئاراراتەوە ڕوو دەکەنە کوردستانی عیراق. دەوڵەتی تورکیا لە سەر ئەم پەنادانە، بە توندی ڕەخنە لە دەوڵەتی عیراق دەگرێ. وەزیری دەرەوەی عیراق دوو سەفەران بۆ ئانکارادەگا. «لەم سەفەرانەدا ڕێبەرانی تورک داوا لە دەوڵەتی عیراق دەکەن کە بۆ کۆتایی پێهێنان بە جموجۆڵی یاخیەکان لە ناوچەی بارزان کە هێندێ لە کوردەکانی تورکیای لێ گیرساونەوە و بوونە هۆی ئاژاوە و تێکدانی ئاسایشی ناوچە، بۆ عەمەلیاتێکی نیزامی هەنگاو هەڵێنێ. دەوڵەتی عیراق کە نایەوێ لەم سنوورە بزووتنەوەی کورد دەرفەت بێنێ و پەرە بگرێ، ویستی تورکەکان قبوڵ دەکا و لە ناوچەی بارزان دەست بە عەمەلیاتی لەشکری دەکا.» (١١)

کاربەدەستانی ئینگلیزی لە عیراق لە بارەی یارمەتی شێخ ئەحمەدی بارزانی بە ڕاپەڕینی ئارارات و ڕەخنەی تورک هیچ ناڵێن و خۆ بێدەنگ دەکەن. بەڵام بوختان و دەنگۆی ئەوتۆ بڵاو دەکەنەوە کە گۆیا لە بەر ئەوەی شێخ ئەحمەد خەریکە دینێکی تازە بنیات بنێ، لافاوێک ناوچەی بارزانی وەلەرزە خستوە. ئێدمۆندز ئەفسەری ئینگلیزی لە عیراق لە گۆڤاری میدل ئیست ژورنال ١٩٥٩ دا دەنووسێ: «... دەوڵەتی عیراق بڕیاری دابوو لە پێش تەواو بوونی دەورانی سەر پەرشتیدا ١٩٣٢ دەسەڵاتی خۆی تا سنوور پەرە پێبدا. بەجێگەیاندنی ئەم بڕیارە هاو کات بوو لە گەڵ( شتە سەیرەکانی مەزهەبیی تازەی شێخ ئەحمەد) پاشان بە لێبڕاوی ڕادەگەیێنێ: بە هیچ هێزێکی خەیالییش ناکرێ سەر بزێوییەکانی بارزان تا ساڵی ١٩٤٣ وەک شتێکی ئیلهام وەرگر لە ناسیۆنالیزمی کورد بزانرێت.»

بۆ کورد واهاتوە. حکوومەتانی داگیرکەری کوردستان و دەوڵەتە ئیستعماریەکانی پشتیوانیان، لە ئاست داخوازی ڕەوایەتی و خەبات و ڕاپەڕینی میللی نەتەوەی کورد، یا خۆیان بێدەنگ کردوە ونەیانویستوە و نەیانهێشتوە دەنگ بداتەوە، یا بۆ بەد ناوکردنی بزووتنەوەی کورد تۆمەت و بوختانی ناڕەوا و بێشەرمانەیان بڵاو کردۆتەوە. هەر لە سەر بناخەی ئەم بوختان و تۆمەتە درۆیانە بوە کە :«... مەعموورێکی سیاسی گومانلێکراو شێخ ڕەشیدی لۆلان دڵنیا دەکا کەشێخ ئەحمەدی بارزان بۆ لە بەینبردنی موسڵمانان لە گەڵ ئاسوورییەکان بۆتە

هاودەست و ناوبراو بۆ شەڕی دژی شێخ ئەحمەد هاندەدا. شێخ رەشید لە بەر ساکاری و دەمار گرژی، دەبێتە دەسکەلای ئەو مەعمورە فیتنە هەلایسێنە و بارزان پەلامار دەدا. بەلام لە ٢٦ی نوڤەمبەری ١٩٣١ زیانێکی قورسی پێدەگات.» (١٢)

حکوومەتی عیراق ئەو کێشەیە دەکاتە بیانوو لە مانگی دیسامبری ١٩٣١ ئەرتەشی عیراق بارزان گەمارۆ دەدا بەو تەمایە کە چەکدارەکانی شێخ ئەحمەد خافلگیر بکا. بەلام ڕاست بە پێچەوانەی بەرنامە و نەخشەی دارێژراوی لەشکری عیراق، خۆیان دەکەونە کەمینی کوردەکان و دەشکێن. چەند کەسیان لێ بەدیل دەگیرێن کە قایمقامی (بلە)یان لە گەڵ دەبێ. ڕۆژی دوایی هێزی هەوایی بەریتانیا بارزان بۆمباران دەکات. بەلام شێخ ئەحمەد پەیامی ئاشتی بۆ دەولەتی عیراق دەنێرێ و پێشنیار دەکات کە دیلەکان ئازاد بکا.

دەولەتی عیراق داوا لە کومیسەری بەرزی بەریتانیا دەکا کە فڕۆکەکانی ئینگلیز بە سەر ناوچەی زێبار و بارزاندا بفڕن و هاوکاری تەواوی لەشکری عیراق بکەن. ئەرتەشی عیراق لە نۆهەمی مانگی فیوریە ناوچەی بارزان پەلامار دەدا. بەلام لەم پەلامارەشدا دەشکێ و ١٤٠ کەسیان لێ دەکوژرێ و زۆریش بریندار دەبن.

لە مانگی مارسی ١٩٣٢ دەولەتی عیراق بە شێخ ئەحمەد ڕادەگەیێنێ کە دەیەوێ دام ودەزگای دەولەتیی لە ناوچەی بارزان دابمەزرێنێ و داوای لێدەکا لە ماوەی ٤٨ سەعات دا، خۆ بەدەستەوە بدا. شێخ ئەحمەد گوێ ناداتە فەرمانی حکوومەت و لە ١٥ی مارسی ١٩٣٢ هێزێکی پیادە و تۆپخانەی لەشکری عیراق بە پشتیوانی هێزی هەوایی بەریتانیا دەگاتە ناوچەی شیروان و تا مانگی یونی ئەو ساڵە شەر درێژە دەکێشێ. فڕۆکەکانی ئینگلیزی بێ وچان ناوچەی بارزان بۆمباران دەکەن. لە ٢١ی یونی شێخ ئەحمەد لە گەڵ ٤٠٠ کەس لە شەڕکەرانی خۆی لە سنوور دەپەڕێتەوە و خۆ تەسلیمی کاربەدەستانی تورک دەکا. لە پێشدا شێخ ئەحمەد دەبەنە ئەستەمبوڵ و پاشان دەیبەنە ئەدەنە. هێندێکیش لە پیاوەکانی بە بیانوی ئەوە کە لە ڕاپەڕینی ئارارات دا بەشداریان کردوە و دوایە چوونە لای

شێخ ئەحمەد، دەخەنە بەندیخانەوە. «... بەم چەشنە سەربزێوی شێخ ئەحمەدی بارزان کە ببوە قوربانیی پیلانی دوو لایەنە، کۆتایی پێدێت. لە ئەنجامی پیلانی دوو قۆڵی حکوومەتەکانی تورک و عیراق و پیلانی بێدەنگیەکی کە مەبەستی ڕاستەقینەی ئەم بزووتنەوەیە دادەپۆشێ، ئاخرین شەخسیەتی دەسەڵاتداری کورد لە ناوچەی گرنگی بارزان لە بەین هەڵدەگیرێ.»(١٣)

لە ئاخری ساڵی ١٩٣٢ هێندێ لەو کەسانەی لە تورکیا لە گەڵ شێخ ئەحمەد گیرا بوون، ئازاد دەکرێن. شێخ محەممەد سەدیق وەمەلا مستەفاش لە گەڵ ئازاد کراوەکان دەبن. ئەوان دەگەڕێنەوە ناوچەی بارزان و نیزیکەی ٣٠٠ کەس لە دەوری خۆ کۆ دەکەنەوە و سەر هەڵدان بۆ ژیانێکی ئازاد و ئاسایشی دەست پێدەکرێتەوە. مەلیک فەیسەل لە بەغدا، داوا لە باڵیۆزی تورک دەکات کە بۆ دامرکاندنەوەی ئاگری ناوچەی بارزان یارمەتی عیراق بکا، بەلام ئەم هەوڵەی مەلک فەیسەلیش ئەنجامێکی نابێ. تا بەهاری ١٩٣٤ خەبات دژی هێزەکانی عیراق لە ناوچە درێژەی دەبێ. لە ساڵی ١٩٣٤ برایانی بارزانی تەسلیمی حکوومەتی عیراق دەبن . لە پێشدا دووریان دەخەنەوە بۆ ناسریە و پاشان دەیان گێڕنەوە بۆ سولەیمانی. لە گەڵ ئەوەش تا ساڵی ١٩٣٦ ناوچەی بارزان ئارام و هێدی نابێ. ساڵی ١٩٤٣ مەلا مستەفا بارزانی لە سولەیمانی ڕادەکا و لە ڕێگای کوردستانی ئێرانەوە خۆ دەگەیێنێتەوە ناوچەی بارزان و ئەم جار خەبات بۆ ئازادی بە شێوەیەکی تازە و بە پێوەندی لە گەڵ ڕێکخراوی سیاسی ئەو دەمی کوردستانی عیراق ( حیزبی هیوا) و بە ناوی ( کومیتەی ئازادی) بە سەرۆکایەتی بارزانی مستەفا دەست پێدەکرێتەوە.

. زۆربەی ڕاپەڕینەکانی کورد بە بێ لە بەر چاو گرتنی هەل و مەرجی بابەتی و ئامادەیی بار و دۆخی سیاسی وەمادی و لێکدانەوەی بابەتی دەست پێکراون و توشی شکان هاتوون. کورد لە جیاتی ئەوەی بار و دۆخی سیاسی خۆجێیی و جیهانی لێک بداتەوە و توانا و دەرەتانی هێزی خۆ ماڵی و دوژمن بە جوانی هەڵسەنگێنێ و بناخەی بۆچوون و ویستەکانی لە سەر واقعیەت دابڕێژێ، زیاتر

دەکەوێتە داوی دوژمن و بە دروشمی بریقەدار وقسەی زلەوە دەنووسێ و دەیەوێ بە سەر قۆناخە کانی ڕۆژدا باز بدات و لەو بەر بکەوێتە عەرز و تا جارێکی دیکەش ڕادەبێتەوە خوا کەریمە.! سەرەڕای ئەو هەموو شۆڕش و ڕاپەڕین و فیداکارییەی کە کورد کردوویەتی، نەیتوانیوە لە بواری کولتور و ڕۆشنبیری وبیر و بۆچوونی سیاسی ڕێنیسانیسێک پێک بێنێ و شۆڕشێکی فیکری و ڕۆشنبیری بەر پا بکات. نەیتوانیوە شێوەی دیموکراسی و دیالۆکی شارستانیی لە نێو خۆیدا برەو پێ بدات. نەیتوانیوە بۆ بەربەرەکانی دوژمن،ریزی هێزەکانی خۆی بکاتە یەک و لە نێو خۆیدا یەکێتی و تەبایی پێک بێنێت. زیاتر لە سەر ئەوە ساخ بۆتەوە( شۆڕش) بکا و دەست داتە تفەنگ و ڕوو بکاتە چیا. لە جیاتی ئەوەی شۆڕشەکەشی ئاراستەی دوژمنی نەتەوەکـــەی بکا و لە پێناو وەدەست هێنانی ئازادیدا خـــوێن بڕێژێ، بەرەنگاری خۆی بۆتەوە و خوێنی لاوانی خۆی ڕشتوە. لە نێو دەستـە و تاقم و حیزبەکاندا بۆتە شەڕ و کوشتـار و دوژمنیش پاڵی لێداوەتەوە. پێویست ناکات پەنجە بۆ ئەزموون و ڕووداوی داخداری بەرچاو و دیار ڕابکێشین. بە بۆچوونی من هۆی سەرەکی ئەم نەخۆشی و دەردە بێ دەرمانە، دەگەڕێتەوە بۆ ژیان و گوزەران و چەرمە سەرییـەی کـورد لە ژێر دەستی حکوومـەتانی زۆردار و دیکتـاتۆر و بێ کولتوردا بردوویەتە سەر، لە چوارچێوەی کولتور و ڕۆشنبیری و ڕەوشت و ئاکاری ئەو حکوومـەتانەدا ژیاوە و لە گەڵی ڕاهاتوە. کاتێکیش بۆ ڕزگاری لەو ژێر دەستی و کـۆیلەتییـە ڕاپەڕیوە، لە جیـاتی ئەوەی هاوکـات لە گـەڵ خـەبات و شـۆڕشی ڕزگاریخـوازی، خۆی لە چنگ کولتور ونەریت و ڕەوشت و شێوەی بەڕێوە بەریی سیستمی داگیرکەر و زۆردار دەرباز بکات، بە پێچەوانە لە نێو خۆیدا کە تۆزە دەسەڵاتێکی کەوتە دەست، هەر ئەم شێوە ئاکار و ڕەوشت و بە ڕێوە بەرییەی لە گەڵ خەڵکی خۆی بەکار دێنێ، کە دوژمن لە گەڵ نەتەوەی کوردی بەکار هێناوە.

## سەرچاوەکان:

١- پەیامی تێلگرامی تاریخی ١٦ی ژوئیەی ١٩٣١ی ستانهوپ پالمر کونسولی بەریتانیا لە تەورێز بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئینگلستان ١٥٢٧٩-٣٧١- بە نەقل لە کریس کۆچیرا، جنبش ملي کرد، ترجمه ابراهیم یونسی ١٣٧٣، ل ١٢٨-١٢٧

٢- پەیامی تێلگرامی ١٧ی ئەپریلی ١٩٣١ی بالیۆزی بەریتانیا لە تاران بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئینگلستان، ١٥٣٦٩، ٣٧١، هەمان سەر چاوە،ل ١٢٨

٣- پەیامی تێلگرامی ١٦ی ئەپریلی ١٩٣١، کونسولی بەریتانیا لە تەورێز بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئینگلستان، ١٥٣٦٩-٣٧١ سەرچاوەی پێشوو. ل ١٢٩

٤- وتو وێژێکی بلاو کەاوە لە ئێران. ١٠ ژوئیەی ١٩٣١، هەمان سەر چاوە، ل ١٣٠

٥- پەیامی تێلگرامی ١٦ی ژوئیەی ١٩٣١ی کونسولی بەریتانیا لە تەورێز هەمان سەر چاوە ، ل ١٣١

٦- حەسەن ئەرفەع، لە دەورانی پێنج پاشادا، هەمان سەر چاوە، ل ١٣١

٧- کەندال، کوردەکان ، وەرگێرانی برایمی یونسی، ١٣٧٠، ل ، ١١١

٨- رۆژنامەی میللیەت، ١٦ی سپتامبری ١٩٣٠

٩- کەندال، سەرچاوەی پێشوو، ل ، ١١٤- ١١٣

١٠- کاوە بیات. اسناد ملي ن ٣..١٢٢، ١٩٣٠

١١- کریس کوچیرا هەمان سەر چاوە ، ل ، ١٣٢-١٣١

١٢و ١٣ کریس کوچیرا، هەمان سەر چاوە. ل ، ١٨٤- ١٥١

# ڕاپەڕینی دەرسیم

لە نێو ڕاپەڕینەکانی کورد دا، کە زۆربەیان بێ بەرنامەی حیساب کراو و بێ لێکدانەوەی بارو دۆخ و هەڵسەنگاندنی هێز و توانای دوژمن و خۆماڵی و بە بێ لە بەرچاو گرتنی سیاسەتی ناوچەیی و جیهانی سەریان هەڵداوە و بە داخەوە بە ئامانجیش نە گەیشتوون، ڕاپەڕینی دەرسیم بە هێندێ فەرق و جیاوازی دێتە بەر چاو. بەو مانایە کە دەکرێ بڵێین دەستی دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان لە هاندانی ڕاپەڕیندا نیە. دەوڵەتە ئیستعمارییەکانی ڕۆژئاوا بەرژەوەندێکی خۆیانی تێدا نابینن و هیچ بەڵگەیەکیش بە دەستەوە نیە کە دەستیان دە هەڵگیرسان و یا سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی درسیمدا هەبووبێ. ئەوەی دەکرێ کە لێرەشداسیاسەتی دەوڵەتای ڕۆژئاوایی پێ مەحکوم بکرێ، هەر ئەوەندەیە کە پەردەیەکی مات و بێدەنگیان بە سەر ڕاپەڕینی دەرسیم و جنایەت و کوشتاری حکوومەتی تورکدا کێشاوە و باسیان نەکردوە. ئەوەش هەر درێژەی ئەم سیاسەتەیە کە دەزگای پروپاگاندەی دەوڵەتانی ڕۆژئاوا لە بارەی هەموو خەبات و شۆڕش و ڕاپەڕینێک گرتوویانەتە بەر کە لە چوار چێوەی بەرژەوەندی ئەواندا نە بووبێ و یا بۆسیاسەت و بەرژەوەندی ئەوان زیانی بووبێت.

«...دەرسیم لە ڕاستیدا هێلانە هەڵۆیەک بوو لە سەر چیا بەرزەکانی کوردستان کە کەمتر دستی حکوومەتی تورکی پێراگەیشتبوو. ناوچەی دەرسیم هەمیشە جۆرە دەسەڵاتێکی ناوچەیی هەبوە و لە بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیدا خودموختاربوە. خەڵکی دەرسیم نە چوونە نێو «سوپای حەمیدیە» و لە شەڕی نێوان تورک و رووسیا و شەڕی سەربەخۆیی تورکیاشدا بەشدار نە بوون. لە پارلمانی تورکیادا

پێنج نوێنەریان هەبوە و ویستوویانە هەر ئاوابێ قرە و هەرا زیانی خۆیان درێژە پێبدەن. دوای شکانی راپەڕینی ئارارات ئیتر حکوومەتی تورک بەرنامەی تواندنەوەی کورد بەڕێوە دەبا. بە گوێرەی ئەو بەرنامەیە کە وەزارەتی خۆجێیی نەخشەی دەکێشێ چوار ناوچە دەگرێتەوە.

«.... ناوچەی ژمارە (١) هەموو ئەو مەڵبەندانە دەگرێتەوە کە پێویستە حەشیمەتی تورک لە وێدا زیاد بکرێت. ئەم مادەیە بە ئاشکرا مەبەست کوردستانەوە.

ناوچەی ژمارە(٢) هەموو ئەو مەڵبەندانە دەگرێتەوە ئەو خەڵکەی لەوێدا نیشتە جێدەکرێ، کە لە کولتوری تورکدا بتوێنەوە. ( کولتوری قەومی تورک).

- ناوچەی ژمارە (٣) ئەو مەڵبەندانە دەگرێتەوە کە تورکەکان دەتوانن بە خۆرایی ( واتە بەلاش)بەڵام بە بێ یارمەتی کاربەدەستانی حکوومەت لە وێدا نیشتە جی بن.(شوێنەکانی پڕ پیت و بەرەکەتی ناوچەکانی کوردستان بە خۆرایی پێشکێشی تورکان دەکرێ،)

- ناوچەی ژمارە(٤)تەواوی ئەم ناوچە و مەڵبەندانە دەگرێتەوە کە دەیانەوێ چۆڵ بکرێن. ئەم ناوچانەش دەگرێتەوە کە لەبەر هۆی لەشساخی و هۆکاری تری ئەمنیەتی و نیزامی و سیاسی و کولتوری هاتوو چۆ بۆ ئەم ناوچانە قەدەغە دەکرێ.( ئەم بەندە شوێنە ڕژد و شاخاویەکانی کوردستان دەگرێتەوە. » (١)

دوای هەرەسی راپەڕینی ئارارات چەند سەت کوردێک ڕوو دەکەنە چیا و کەژەکانی ناوچەی دەرسیم بۆ ئەوەی خۆ لە کوشتار و یا دوور خستنەوە دەرباز بکەن. دەوڵەتی تورکیا ساڵی ١٩٣٤ ژەنراڵ کەنعان پاشا، فەرماندەی سوپای چوارەمی دیاربەکر دەنێرێتە شرناک و ماوەی پێنج ڕۆژ بێ پسانەوە چیاکان بۆمباران دەکات. چەند کەسیش بۆ چاو ترساندنی کوردان لە ( ئەلعەزیز) لە دار دەدا.

لە سەرەتای ساڵی ١٩٣٧ دەوڵەتی تورکیا حکوومەتی نیزامی دادەمەزرێنێ و فەرماندەکانی نیزامی دەکرێن بە حاکمی ویلایەتەکان. ئەوان بۆ عەمەلیاتی نیزامی و یا لەدار دانی خەڵک دەسەڵاتی تەواویان دەدرێتێ. جگە لە زمانی تورکی قیر

بوون بە زمانەکانی تر و کتێبی بێگانەش قەدەخە دەکرێن. سانسۆر و خنکاندنی دەنگوباس لە بارەی ناوچەی دەرسیمەوە ئەوەندە توندە کە کاتێ لە نێو تەواوی رۆژنامەکانی قوستەنتەنیە رۆژنامەی سۆن تێلگراف لە ٢٣ی مانگی مای ١٩٣٧ ئاماژەی بۆ دەکات، دەستبەجێ دادەخرێ. بۆیە هەتا ئیمرۆش کەس نازانێ ڕاپەڕینی دەرسیم بە ڕاستی لە چ کاتێکدا دەست پێکراوە.(٢)

بە گوێرەی وتەی دوکتور نوری دەرسیمی سەر هەڵدان لە سەرەتای ساڵی ١٩٣٦ کاتێ دەستپێدەکرێ کە ئەرتەشی تورکیا دەیەوێ لەناوچە گرنگەکانی دەرسیم پادگانی نیزامی دابمەزرێنێ. سەید رەزا کە ئەرکی سەرۆکایەتی تایفەکانی لە سەرشانە، لە بەرانبەر ئەم بڕیارەی حکوومەت دا دەیەوێ بەربەرەکانی بکات. لە گەڵ ژەنراڵ عەبدوڵا ئالپ دۆغان، سەرۆکی ژاندارمەری دامەزراو لە ئەلعەریز دەکەوێتە وتو وێژ. لە ڕەوەندی گفت وگۆدا، سەید رەزا لە مەبەستی شەڕ خوازانەی حکوومەت ئاگا دار دەبێ. دێتە سەر ئەو بڕیارە کە دوکتور نوری دەرسیمی بۆ ئاگادار کردنی بیروڕای گشتی جیهانی بۆ ئوروپا بنێرێ.

پاش ئەم دیدارە ژەنراڵ ئالپ دۆغان لە بەیاننامەیەکدا داوا لە عەشیرەتەکان دەکا کە ٢٠٠ هەزار تفەنگ بدەنەوە بە دەوڵەت. هەر لەوکاتەشدا دەزگای جاسوسی حکوومەتی تورک عەشیرەتەکان دژی یەکتر دەهارۆژێنێ. لە دوو شوێن خەڵک دەڕژێنە نێو پادەگانی تازە دروستکراو وژاندارمەکان چەک دەکەن. سەید رەزا داوا لە ژەنراڵ دۆغان دەکا کە بەیاننامەی چەکدانەوە هەڵوەشێنێتەوە ودەزگایێکی ئیداری لە ناوچە دابمەزرێنێ کە مافی میللی کورد دەستە بەر بکا. دژکردەوەی دەوڵەت فرە خێرایە چەند هەنگی ژاندارمەری بۆ دەرسیم دەنێرێ، ئەرتەش لە سەر سنوورەکان ناوچەی دەرسیم کۆ دەکاتەوە. فڕینی فرۆکەی نیزامی رۆژانە بە سەر دەرسیمدا خەڵک تورە و بێزار دەکا. لە سەرانسەری ناوچە یێک هەڵپرژانی پچوک لە گەڵ هێزەکانی دەوڵەتی روو دەدەن. سەبارەت بە کەش و هەوای زستان عەمەلیاتی نیزامی ڕادەگیرێ. بەڵام دەرسیم گەمارۆ دراوە.

هاتنی بەهار و توانەوەی بەفر، پەلامـاری لەشکری بە دواوەیە، لە ناوچەی مازگرد پێک هەڵپرژان دەستپێدەکرێتەوە. لە بەهاری ساڵی ١٩٣٧ کوڕێکی سەید رەزا بە ناوی( برایم) لە هوزات دەچێتە پێگە تورکەکان تا پەیامی باوکی سەبارەت بە ڕاگرتنی عەمەلیاتی نیزامی بە فەرماندەی لەشکر ڕابگەیێنێ. لە گەڕانەوەدا دەکەوێتە کەمینی ئەفسەرانی تورک وکوردەکانی ( کورگانی) کە پاڵیان وەتورکان دابوو، تەقەی لێدەکەن و دەکوژرێ. کوژرانی برایم دوژمنایەتی نێوان تورک و کوردەکانی دەرسیم توندتر دەکا. سەید رەزا ناوچەی ( کورگان) گەمارۆ دەدا و داوای بکوژانی کوڕەکەی دەکا. بەڵام پیاوکوژەکان لە لایەن حکومەتەوە پشتیان دەگیرێ. تورک هێزێکی گەورە لە ناوچە و دەور و بەر کۆ دەکەنەوە. ژمارەی هێزەکانی حکومەت دەگاتە حەوت سوپا. ناوەندی فەرماندەیی ئەو هێزە دیاربەکرە. بەڵام تیپەکانی سوپا لە ئورفە و سیرت و وان و ئەلعەریز بڵاو دەکرێنەوە. « ... وا دێتە بەر چاو ئەم هەنگاوەی حکومەت بەو مەبەستە بووبێت کە لە پەرەگرتنی ڕاپەڕین بۆ باشور پێشگری بگرێ. ببێتە لەمپەرێک لە بەرانبەر مانۆری کوردەکانی سوریا. پێشتر شێخ عبدالرحیمی برای شێخ سەعیدی پاڵو، لەم بارەوە هێندێ هەنگاوی کاریگەری نابوو. بەڵام کوردەکان کە ژمارەیان کەم بوو، لە بەرانبەر تورکاندا شکا بوون.» (٢)

سەید رەزا جارێکی دیکەش بە ئالپ دۆغان ڕادەگەیێنێ. ئەگەر بێتوو مافی میللی کورد ڕێزی لێ بگیرێ و قاتڵانی کوڕەکەی بدرێن بە دادگا، ئامادەیە تەواوی ئەفسەر و سەربازانی بە دیل گیراو ئازاد بکا و ئەوەی بە تاڵانیشیان گرتوە، بیدەنەوە بە دەوڵەت. بەڵام ژەنراڵ دۆغان داوای تەسلیم بوونی بێ قەید و شەرت دەکا لە کەڵ دانەوەی هەشتا هەزار تفەنگی ماوزەر. شەر دەست پێدەکرێتەوە.

## کوژرانی عەلی شێر و تەئسیری لە سەر ڕاپەڕین.

عەلی شێر لە باری نیزامی و نفوزی لە نێو خەڵکدا مێشکی ڕاپەڕین و نەخشەی نیزامی بوو. ناو براو لە تایفەی شێخ حسنان و لە گوندی عمرانی نیزیک

( كۆچكرى) هاتبوه دنيا وله مەدرەسەى ناونجى سيواس دەرسى خوێند بوو. له زەمانى سوڵتان عبدالحميد دا سەبارەت بە هۆندنەوەى شيعر ناو بانگ دەر دەكا و دەبێتە ميرزاى مستەفا بەگى سەرۆكى تايفەى كۆچكرى و پاش كوشتنى ئەو بە دەستى والى دەرسيم، بوو بە مامۆستاى كورەكانى. عەلى شێر لەم ڕێگايەوە نفوزێكى زۆر لە نێو عەشيرەتى كۆچكرى پەيدا دەكا و كار دەكاتە سەر يەككگرتنيان. پاش كشانەوەى هێزەكانى رووسيا، ساڵى ١٩١٧ لە كوردستانى توركيا، كاربەدەستانى تورك بۆ خۆ پاراستن لە هاروژانى خەڵكى دەرسيم وايان بە باشدەزانين كە لە ناوچەى ئاوەچك، لە كردەوەكانى عەلى شێر چاو بپۆشن. بەڵام عەلى شێر لە پێناو ناسيۆناليزمى كورد دا، تێكۆشانى خۆى درێژە پێدەدا. ساڵى ١٩٢٠ چوونى دەرسيم بۆ نێو( كۆمەڵەى نەتەوەيى بەرزى كوردستان) ڕا دەگەيێنێ و داوا لە ڕێبەرانى قوستەنتەنيە دەكات كە لە دەرسيم لقى كۆمەڵە بكەنەوە. ساڵى ١٩٢١ بە نووسينى نامە و تێلگراف بۆ دەوڵەت و داواى بە جێگەياندنى بڕيارەكانى پەيمانى سيڤر خەباتێكى توندى دەست پێدەكات. كۆنفرانسى جۆر بە جۆرى بە زمانى كوردى پێكدێنێ.

پاش چەند مانگ بە تاوانى بەشدارى لە ئاژاوەى كۆچكرى بە مەرگ مەحكوم دەكرێ. بەڵام دە توانى ڕابكا. ساڵى ١٩٣٧ عەلى شێر تەنيا بەڕێوە بردنى عەمەلياتى نيزامى پێ بەس نابێت. بۆ يەكێتى و كۆ كردنەوەى خەڵك لە دەورى سەيد ڕەزا، بابەتى زۆر و گرنگى نووسين و شێعرى نيشتمانى دەهۆنێتەوە و بڵاو دەكاتەوە.

له مانگى يونى ١٩٣٧ سەيد ڕەزا داوا لە عەلى شێر دەكات، بۆ( ڕاكێشانى دەوڵەتى فەرانسە و ئينگلستان) بۆ ناوبژى كەرى و پێشگرى لە خوێنڕێژى زياتر بچێتە ئێران و يا عيراق. بەڵام شەوى پێش وەڕێكەوتنى بە هاندانى ژەنراڵ ئالپ دۆغان لە ئەشكەوتى ئاگدات بە دەستى ( ڕابەر )ى برازاى سەيد ڕەزا دەكوژرێ، ناوبراو لە بنەوە لە گەڵ توركان ڕێككەوتبوو، بێلايەنى خۆى ڕاگەياند بوو. كوشرانى عەلى شێر زيان و خەسارەتێكى گەورە بوو بۆ بزووتنەوەى كورد. پاش

کوشرانی عەلی شێر ئاوەندی شەری توند دەکەوێتە ناوچەی تایفەی بەختیار. بەڵام هێرش و سەر کوتکردن زۆر توندە. تورک لێرەوارەکانی ناوچە ئاگر تێبەردەدەن. سەرۆکی تایفە بەختیاریش بە ناوی شاهین دەکوژرێ. لە دۆڵی(ئیکسور )
هەزاران ژن و منداڵ پەنا بۆ ئەشکەوتان دەبەن. تورک لە زاری ئەشکەوتەکاندا ئاگر دەکەنەوە و ژن و منداڵ هەموویان لە ئەشکەوتەکاندا دەخنکێن و لە بەین دەچن. درندەیی تورک دەگاتە رادەیەک خەڵکی ( کۆریچا) کە بێلایەن مابوونەوە و تەنانەت ( گورگانەکانیش) کە رەگەڵ دەوڵەت کەوتبوون، لە دەوری سەید رەزا کۆ دەبنەوە. بەڵام ئەو تایفەش کوشتار دەکرێن. تورک تەنانەت دیلەکانیش وەبەر دەسرێژی شەست تیر دەدەن. ژن و منداڵان لە کادێناندا ئاگر تێبەر دەدەن، فەرماندەکانی تورک شوێنی مانەوەی سەید رەزا هەڵدەگرن و لە حەوا و لە زەوی بۆمباران و تۆپبارانی دەکەن. سەید رەزا دەیەوێ خۆ بگەیێنێتە ( ئاوەچک) بەڵام تەقەلای ئەوێ شکانی ئاڵقەی گەمارۆ لە ( قزڵجە) گرانی بۆ تەواو دەبێ. هەزاران کەس لە هاورێیانی و خێزانی و یەک لە کورەکانی و سێ نەوەی دەکوژرێن.

لەم بار و دۆخەدا سەید رەزا لە کەش و هەوایەکی گومانلێکراودا دەگەوێتە بەر دەستی تورکان. وا قاوە کە گوێا والی ئەرزنجان لە هەوەڵی سێپتامبری ١٩٣٧رادەگەیێنی کە حکوومەتی تورکیا بریاری داوە ویستی خەڵکی دەرسیم بە جێبگەیێنێ و زیان و خەسارەتی خەڵکیشی ببژێرێ و ئاگر بەسیش رابگەیێنێ. سەید رەزا بروا بە قسەی تورکان دەکا و بۆ وتو وێژ لە گەڵ والی دەچێتە ئەرزنجان و لە پێنجەمی سپتامبری ١٩٣٧ دەگیرێ. لە ئەلعەزیزدەست دەکرێ بە لێکۆڵینەوەی دەوسیەی سەید رەزا. لە رەوەندی لێکۆڵینەوەدا تورک هەولیان دەدا پای سۆڤێت بخەنە ناو کێشەکەوە و سەبارەت بە بوونی ئەفسەرانی سۆڤێتی و یارمەتی سۆڤێت بە شۆرشگێرانی دەرسیم، سەید رەزا وەزمان بێنن. بە لام سەید رەزا پێ لە سەر ئەوە دادەگرێ کە بنەماڵەی ئەو هەر کیز گوێ لەمستی بێگانان نەبوە و سەدان ساڵ بە حوکمی هەستی نیشتمانپەروەرانە لە پێناو بەرژەوەندی بەرزی خەڵکدا شەری کردوە. بەڵام بەداخەوە بێ ئاکام بوە.

پاش چوار ڕۆژ دادگایی لە چواردەی مانگی نۆڤەمبر لە گەڵ دە کەسیتر لە سەرۆکانی ڕاپەڕین لە دار دەدرێ. سەید رەزا لە ژێر داری ئیعدام دا دەڵێ: «.. ئەمەنم ٧٥ ساڵە و دەچمە ریزی شەهیدانی کوردستانەوە. دەرسیم شکاوە. بەڵام کوردستان و کوردەکان دەمێننەوە. لاوانی کوردستان تۆڵەی ئێمە دەستێننەوە. لەعنەت لە خاینانی ستەمگەر...»(٤)

حکوومەتی تورک سانسۆرێکی ئەوەندە توند دەخاتە سەر ڕووداوەکانی تورکیا و ڕاپەرینی دەرسیم، تەنانەت دیپلۆماتەکانی بێگانەش ناتوانن بە تەواوی لە کارەساتی دەرسیم ئاگادار بن. تەنانەت لە بارەی ژیان و کەسایەتی سەید رەزاشەوە زانیاری تەواو نەهاتۆتە دەست. هیچ بەڵگە و نووسراوەیەکی باوەڕ پێکراوی خودی سەید رەزا و ڕێبەرانی ڕاپەرین نەکەوتوونە دەست ڕۆژنامە نووس و بڵاو نەکراونەوە.

تاقە بەڵگەیێکی کە بە هەڵکەوت لە ئارشیوی وەزارەتی دەرەوەی ئینگلیزدا وەدەست هاتوە، نامەیەکی سەید رەزایە کە ئەویش بە تەواوی ڕوون نیە بۆ کام دەوڵەت و بۆ کێ نووسراوە. نێوەرۆکی نامەکە نیشان دەدا کە سەید رەزا پیاوێکی تێگەیشتوو بوە و لێکدانەوەی لە سەر ڕووداوەکان سیاسیانە و ڕوون بوە. ئەم نامەیە لە ڕاستیدا وەک بەیاننامەی ڕاپەرینی دەرسیمە کە داوای یارمەتی لە دەوڵەتێک دەکا، کە نامەکەی بۆ نووسراوە و بەڵام ئەو دەوڵەتە و یا ئەو کەسە لە یارمەتیدان درێغی دەکات.

## دەقی نامەی سەید رەزا

« سالانی ساڵە دەوڵەتی تورکیا دەیەوێ نەتەوەی کورد بتوێنێتەوە. بۆ ئەو مەبەستە خەڵکی کورد سەر کوت دەکا، چاپەمەنی و بلاڤۆک و زمانی کوردی قەدەغە کردوە. خەڵکێکی بە زمانی دایکیان دەپەیڤن، ئازاریان دەدا. بە ڕاگواستنی زۆرەملی ویەردەوام، حەشیمەتی ناوچە بە پیت و بەرەکەتەکانی کوردستان بۆ سەرزەمینی بێ ئاو و ویشکارۆی ئەناتۆلی دەگوێزێتەوە و لەوێ دەستە دەستە لە بەین دەچن.

لەم دواییەدا دەوڵەتی تورکیا ویستوویەتی بێتە ناوچەی دەرسیم کە بە گوێرەی ڕێک کەوتن لە گەڵ دەوڵەت تا ئێستا لە ئازار و ئەزیەت بە دوور بوە. خەڵکی کورد لە بەرانبەر ئەم کردەوەیەدا، لە جیاتی فەوتان لە ڕێگای دوور و درێژی دوور خستنەوە، بۆ پارێزگاری خۆیان دەستیان بۆ چەک بردوە. هەر وەک لە ساڵی ۱۹۳۰ لە ئارارات و دۆڵی زیلان و بایزید یشدا وایان کرد.

ئێستا سێ مانگە شەڕێکی توند لە ناوچەی مندا هەڵگیرساوە. سەرەڕای ئا بەرانبەری لە ئامراز و کەلو پەلی شەڕ وبە کار هێنانی فڕۆکەی بۆمبا هاوێژ وبۆمبای سووتێنەر و گازی خنکێنەر لە لایە ن دەوڵەتەوە، من و هاو نیشتمانانم تەقەلای هێزەکانی تورکمان بێ ئاکام کردوە.

فڕۆکەکانی تورک، لە بەرانبەر بەربەرەکانی ئێمەدا، دێهات بۆمباران دەکەن، دەیانسووتێنن، ژن و مندا لانی بێ دیفاع دەکوژن. دەوڵەتی تورکیا تۆڵەی شکانی هێزەکانی خۆی بەمجۆرە لە خەڵکی کورد دەستێنێتەوە. زیندانەکان لە خەڵکی بێ ئازاری کورد پڕ کراون. خوێندەواران وەبەر دەستڕێژ دەدەن و یا لە داریان دەدەن و یا بۆ ناوچە دوورەکانی تورکیا دووریان دەخەنەوە.

سێ میلیۆن کوردی کە لە نیشتمانی خۆیاندا دەژین وجگە لە ژیانێکی هێمن و بە ئاشتی و ئاسایش و پارێزگاری ڕەگەز و زمان وکەلتور و داب ونەریتی خۆیان شتێکی ترناخوازن، ڕوودەکەنە جەنابی بەرزتان و داواتان لێدەکەن کە بۆ کۆتایی پێهێنان بەم بێدادی وستەمە، نفوزی ئەخلاقی وبەرزی دەوڵەتی خۆتان بۆ پشتیوانی لە نەتەوەی کورد بە کار بەرن.» ئیمزا : فەرماندەی گشتی دەرسیم سەید ڕەزا. »

لە نامەی ۳۱ی یولی ۱۹۳۷ی سەید ڕەزادا، جێگای نووسین« دەرسیمی کوردستان» دیاری کراوە. نامەکە بە زمانی فەرەنسی و بە ماشێن نووسراوە. نامەکە ڕووی لە ( وەزارەتی کار و باری دەرەوەیە) بێ ئەوەی ناوی وڵاتەکە بەرێت. ئەو نامەیە کە لە ئارشیوی وەزارەتی کار و باری دەرەوەی ئینگلستاندا هەیە، نووسخەی دووهەمە بە ئیمزای سەید ڕەزا. لە وانەیە سەید ڕەزا ئەم نامەیەی بۆ

چەند وەزارەتخانی دەوڵەتانی ئوروپایی ناردبێ. ئەو نامەیە بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئینگلستان نارداوە. تا ٢١ی سپتامبری ١٩٣٧ نە گەیشتوە. وەک لە یاد داشتی کارمەندێکی وەزارەتخانەی ئینگلیز دەر دەکەوێ، نامەکە لە نێو پاکەت دا نەبوە. مەعلومیش نیە کەنگێ گەیوەتە لەندەن. دەوڵەتی ئینگلستان نامەکەی بۆ دەوڵەتی تورکیا ناردۆتەوە و بە دەوڵەتی ناوبراویشی ڕاگەیاندوە کە وەڵامی نامەکەی نەداوەتەوە. وەزارەی دەرەوەی ئینگلستان، ٢٠٨٧٤ ٣٧١»(٥)

پاش لە داردانی سەید رەزا و هاورێیانی، چەندکەسیش لە سەرکردەکانی ڕاپەڕین بە حەبسی دوور و درێژ مەحکوم دەکرێن. بەڵام ڕاپەڕین هەر درێژەی هەیە. لە نیوەی ساڵی ١٩٣٨ دەوڵەتی تورکیا بەشی زۆری هێزی هەوایی و سێ سوپای لەشکر لە ناوچەی دەرسیم کۆ دەکاتەوە. خەڵکی دەرسیم تا ئاخری مانگی ئوکتۆبری ١٩٣٨ کە هەموو ئامرازێکی بەرگریان لێ تەواو دەبێ بەربەرەکانی دەکەن. هێرش و سەرکوتکردن لە ڕادەی ئاسایی تێدەپەڕێ. ئەرتەشی تورک لە ئەشکەوت و عەمبارانداا خەڵک دەسووتێنن. لێرەوارەکان کە ببوونە پەناگای خەڵکی بێ دیفاع و ڕاکردوو، گەمارۆ دەدەن و ئاگریان تێبەردەدەن و خەڵک دەسووتێنن. گەلێک لە ژن و کیژانی دەرسیم بۆ ئەوەی نەکەونە دەست جنایەتکارانی تورک خۆیان دەروباری (مۆنزور) داوێن و دەخنکێن. دەرسیم بە تەواوی وێران دەکرێتبە گۆڕەی هەڵسەنگاندنی حیزبی کۆمونیستی تورکیا لە ماوەی ١٣ ساڵ ڕاپەڕین و سەرکوتکردندا پتر لە یەک میلیۆن و نیو کورد کوژراوە و دوور خراونەوە.

ئاندرە فۆنتێن سیاسی و ڕۆژنامەنووسی بەناوبانگی فەرەنسی دەنووسێ:

«.... کوردەکان سێ جار ڕاپەڕین. سەرکوتکردنی ئەوان بە شێوەیەکی ئەوەندە توند و تیژ و دەڵرەقی بەرێوەچوو کە ئەم دێرانەی بە قەڵەمی( بینوا میشن)Benoist_Mechin یەکێ لەو کەسانەی کە بە ئەتاتورک هەڵا دەڵێ، نووسراوە، بە جوانی نیشانی دەدا، ناوبراو دەنووسێ «.ئەتاتورک لە پێشدا ٧ وپاشان ٨ و ئاخرەکەشی ٩ لەشکری ئامادە کرد و ناردنی بۆ کوردستان. فەرمانی پێدان بۆ ئەوەی جیاوازیخوازی سەر کوت بکەن و ناوچەکە سەرانسەر وێران

پیاوەکان ئەشکنجە کران و لە دار دران، دێهاتەکان سووتێنران، خەرمانەکان تالآن کران، ژنان سووکایەتیان پێکرا و بە دەڵڕەشی کوژران. ئامانجی حکوومەتی ئانکارا نابود کردنی رەگەزی کورد بوو تا جارێکی دیکە گرووپێکی قەومی دیاریکراو لە کۆماری تازەدا بوونی نەبێت...»(٦)

دوای سەر کوتکردنی راپەڕینی دەرسیم، ئیتر لە باکوری کوردستان راپەڕین و سەربزێویی گرنگ کۆتاییان پێدێت. کوشتار و دوور خستنەوەی بە کۆمەڵ و نیزامیگەری مەلبەندی کوردستان و ئەشکنجە و ئازاری بەردەوامی، کار دەکەنە سەر روحیەی خەڵک و ئیتر بۆ گەیشتن بە ئازادی رێگای راپەڕین و سەر بزێویی بێ بەرنامە و بێ لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنی هێز و بار و دۆخی جیهانی و خۆ جێیی بە پەسند نازانرێت. حکوومەتی تورکیاش رەوشت و شێوەی فاشیزمی هیتلەری لە سیاسەتی خۆجێیی و بەڕێوەبردنی وڵاتدا دەگرێتە پێش. بە ناوی ئەمنیەت و پاراستنی وڵات قانوونی قەدەغە کردنی تێکۆشانی ( خەرابکارانەی وەک کۆمونیزم و ئانارشیزم) و مانگرتنی کرێکاران و یەکێتیەکانی سنفی دێنێتە کایەوە. لە کوردستان دێوەزمەی رەشی میلیتاریستی پشوو لە خەڵک دەبڕێ.

هەواڵدەری رۆژنامەی« سۆن پۆستا »ی تورک کە چۆتە ناوچەی دەرسیم لە راپۆرتێکدا دەنووسێ:«... چوومە تونجەلی. ( دەرسیمی پێشوو) چۆل و هۆل کەسی تێدا نەبوو. تەنیا کەسانێکی لەوێ دەبینران، پۆلیس و مەئموری باج و سەرانە ئەستاندن بوون. ویستم لە گەڵ خەڵک پێوەندی بگرم و لە شێوەی ژیان و روحیاتیان ئاگادار بم. بەڵام بەداخەوە هیچ شتێکی سەر دەمی پێش راپەڕین نەما بوو. ئیتر پیشەسازی و کولتور و سەودا و بازرگانی لە ناوچەدا نابینرێت. خەڵکێکی بێکارم دەبینی کە هەموو ژیانیان لە دەور و بەری چەند سەر بزن بەڕێوە دەچێ. هیچ چەشنە شارستانیەک نەگەیوەتە ناوچە. قوتابخانە نیە، دوکتور نیە، خەڵک نازانن دەرمان چیە. ئەگەر باسی حکوومەتیان دەگەڵ بکەی، ئەوان بە پۆلیس و مەئموری باج و مالیاتی تێدەگەن. ئێمە هیچ نادەین بە خەڵکی دەرسیم، تەنیا لێیان دەستێنین. ئێمە هەقمان نیە ئاوا لە گەڵ ئەوان بجزووینەوە...» (٧)

دوای ڕاپەڕینی دەرسیم کەڕێبەرانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە باکوری کوردستان کوژراون و یا لە دار دراون، ئیتر لە هیچ یەک لە بەشەکانی کوردستان بزووتنەوەی چەکداریی لە ئارادا نیە و دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان لە گەڵ ڕاپەڕین و بزووتنەوەی جیدی کورد بەرەو ڕوو نین. بەڵام ئەم ئارامی و هێمنایە تیە کاتیە لە ڕوانگەی حکوومەتانی داگیر کەری کوردستانەوە، وەک پزیسکی ژێر خۆڵە مێش دێتە بەر چاو و لە دڵە ڕاوکەیاندا ڕادەگرێ. پەیمانی شومی سەعدائاباد (١٩٣٧) ئەنجامی دڵە ڕاوکە و نە بوونی دڵنیایی ئەو حکوومەتانەیە لە ئاست ڕووداوەکانی خۆ جێی و دەرەوەی سنوورەکانی خۆیان. هەر چەندە مەبەستی سەرەکی ئەو پەیمانە گەمارۆدانی سنوورەکانی سۆڤێتی پێشوو بوە، بەڵام وەک لە مادەی حەوتەمی پەیمانەکەدا دەردەکەوێ، پێشگری و سەر کوتکردنی هەموو چەشنە ڕێکخراوە و بزووتنەوەیەکی نێو خۆیی کە مەترسی بۆ سەر ئەو حکوومەتانە هەبێ، ئامانجی بنە ڕەتی ئەم دەوڵەتانە بوە کە ڕاستەو خۆ کورد دەگرێتەوە و دژی بزووتنەوەی کورد هاتۆتە کایەوە.

# ڕاپەڕینی نوێی بارزان ساڵی ١٩٤٣

وەک لە لاپەڕەکانی پێشوودا باسکرا حکوومەتی عیراق ساڵی ١٩٣٦بارزانیاکان دوور دەخاتەوە بۆ ناسریە و پاشان لە ساڵی ١٩٣٩ دا دەیانهێنێتەوە سولەیمانی و لە وێ دەست بە سەر دەبن. مەلا مستەفا نا توانێ کە هەتا هەتایە مل بۆ دەسەلاتی دیکتـــاتۆری ڕێژیمی بەغـــدا ڕابکێـــشێ بە تایبـــەت کـــە بەشـــێکی نیشتمانەکەشی(کوردستانی ئێران) ئازاد بوە و حیزبی نەتەوەیی کورد (کۆمەڵەی ژ ک )ی لێ دامەزراوە ولقی لە کوردستانی عیراقیش دامەزراندوە. ئیتر لە سولەیمانی ڕادەکا و لە ڕێگای کوردستانی ئێرانەوە خۆ دەگەئێنێتەوە بارزان.

مەلا مستەفا لە ڕۆژهەلاتی کوردستان لە پێشدا دەچێتە گوندی کولیج و میوانی کاک مامەندی قادری دەبێ. کاک مامەند زۆری ڕێز لێدەگرێ و یارمەتی دەدا .لەوێ دەنێرن بە دوای مامەند مەسیح دا کە پێشتر لە گەڵ کۆمەڵێکی زۆر لە بارزانیان و عەشیرەتی دیکە ڕوویان کردبوە کوردستانی ئێران و لە ناوچەکانی سندوس و شنۆ دەژیان. مامەند مەسیح ئەو دەم لە گوندی ئاخچەزێوە لە نیزیک نەغەدە دەژیا . وسووی تاژیان پیاوی کاک مامەند دەچێتە گوندی ئاخچە زێوە و مامەند لە گەڵ خۆی دەباتە کولیجی ماڵی کاک مامەندی قادری کە مەلا مستەفاش لە وێ دەبێت. لە وێوە مەلا مستەفا لە گەڵ مامەند مەسیح و وسوی تاژیان کە بۆشارەزایی ڕێگا لە گەڵ خۆی دەبەن، دەکەوێتە ڕێ و دەگاتەوە ناوچەی بارزان. لە بارەی گەڕانەوەی بارزانی ئەمر بۆ بارزان و دەستپێکی شەڕ و وتو وێژ و نامە گۆڕینەوەی لە گەڵ حکوومەتی عیراق و کار بەدەستانی ئینگلیزی دانیشتووی عیراق گەلێ بابەت نووسراون و بیروڕای جیاواز دەر براون و هاتوونە سەر کاغەز. هەر چەند بە لای

منەوە تا ئێستا توێژینەوەیەکی قوڵی زانستی و بابەتی لە سەر خەبات و تێکۆشان و ئامانجی نەتەوەیی ئەو کەڵە پیاوە و ئەو سەردارە مەزن و گوڵنەدەرەی کورد نەکراوە و منیش لە توانامدا نیە لێرەدا هیچی زیاتر بخەمە سەر نووسراوەکانی پێشوو. مەبەستی سەرەکی نووسینەکەی من ڕەنگە هەر ئەوە بێ کە بەڵکوو بە گوێرەی توانا بکارم باسی ئەوە بکەم کە چۆن بزووتنەوەی کورد لە هەموو بەشەکانی کوردستان کەم یا زۆر کەوتوونەتە نێو گەمەی حکوومەتانی داگیر کەری کوردستان و دەوڵەتانی ئیستعماری. خەبات و تێکۆشان و فیداکاری کۆمەلانی خەڵکی کورد بۆتە فیدای بەرژەوەند و قازانجی زلهێزەکانی جیهان و ڕێبەرانی بزووتنەوەی کوردیش قەت دەرسیان لەو کارەسات و ڕووداوانە وەر نەگرتوە.

پاش گەڕانەوەی بۆ بارزان مەلا مستەفا ڕادەگەیێنێ کە بۆ شەڕ و ئاژاوە نەگەڕاوەتە وڵاتی خۆی، بەڵکوو دەیەوێ لە زێد و نیشتمانی خۆیدا بە هێمنی و بە ئازادی بژی و هێندێ داخوازی کۆمەلایەتی و ئابوری و کولتووریش بۆ باشکردنی بارو دۆخی ژیانی کوردستان پێشنیار دەکا کە مافێکی سەرەتایی هەموو ئینسان و نەتەوەیەکن و هیچ زیانیش بە دام و دەزگای حکوومەتی عیراق و دەسەلاتی ئەو لە کوردستان ناگەیەنن.

بەلام حکوومەتی بەغدا لە جیاتی قبوڵکردنی داخوازە ڕەواکانی بارزانی، لە ئوکتۆبری ١٩٤٣ هێزێکی گەورەی ژاندارم و ئەرتەش بە فڕۆکە و تۆپخانەوە دەنێرێتە سەر بارزانی کە ڕەنگە ئەو دەم هەر دوو سەد چەکدارێکیشی بە دەورەوە بوو بێت. هەر چەندە لە هەوەڵین هەنگاودا هێزەکانی عیراق زەبرێکی باشیان وێدەکەوێ، بەلام بۆ ئەوەی شەڕ و کێشە لە گەڵ حکوومەتی عیراق پەرە نەستێنێ، بارزانی لە نامەیەکدا داوا لە باڵیۆزی بەریتانیا لە بەغدا دەکات کە نفوزی خۆی بەکار بێنێ بۆ ئەوەی شەڕ و لەشکر کێشی بەر دەوام نەبێ و حکوومەتی عیراق داخوازیەکانی قبوڵ بکات. کار بەدەستانی بەریتانیا بۆ ئانجامدانی ویستی مەلا مستەفا و پێشگری حکوومەتی بەغدا لە درێژە پێدانی شەڕ، نەک هەر هیچ هەنگاو نانێن، بەڵکوو بە بیانووی جۆر بەجۆر خۆ دەکەنە لایەنێکی شەڕ و ڕاستەو خۆ بە

ناردنی فرۆکە و بۆمبارانی ناوچەی بارزان پشتیوانی لە حکوومەتی عیراق دەکەن، لە ئەنجامی ئەم پیلان و پشتگری بەریتانیا لە حکوومەتی عیراق، مەلا مستەفا ناچار دەبێ ناوچەی بارزان بەجێ بێڵێ و ڕوو بکاتە بەشێکی دیکەی نیشتمانی خۆی لە ڕۆژ هەڵاتی کوردستان کە لە لایەن ڕێبەرایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستان و کۆمەڵانی خەڵکەوە بە گەرمی پێشوازی لێدەکرێ.

لێرەدا بۆ لە ژێر پێنانی مافی ڕەوای گەلی کورد و سەر کوتکردنی ڕاپەڕینی بارزان بیانووی سەیر و دوور لە واقعیەت دێنە گۆڕێ. وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا بە کۆرنوالیس بالیۆزی خۆی لە بەغدا ڕادەگەیێنێ کە بە بارزانی بڵێ:

«... هەنگاوەکانی ئەو کەم کەم دەبنە هۆی دژواری و تێکدانی تێکۆشانی جەنگیی دەوڵەتی ئالا حەزرەتی پاشای ئینگلستان...»(٨)

کۆرنوالیس نامەیەکی توند بۆ بارزانی دەنووسێ و دەڵێ :«.... بەم کارانە تێکۆشانی شەڕی ئینگلستان دەخەیە مەترسیەوە وداوای لێدەکا کە تەسلیم بێ.» نە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا و نە کۆرنوالیسی بالیۆزی ئینگلیز ڕوونی ناکەنەوە مەلا مستەفا کە لەو پەڕی سەرووی عیراق و لە کوردستانێکی شاخاوی و چیا وکەژ و دوور لە ناوچە و مەڵبەندەکانی شەڕ، بە ٢٠٠-٤٠٠ چەکدارەوە و بە ویستی مافێکی ڕەوای سەرەتایی ژیان، بۆ چی « تێکۆشانی جەنگیی دەوڵەتی بەریتانیا دەخاتە مەترسیەوە و چ زیانێک بە دام و دەزگای دەوڵەتی ئینگلیستان دەگەیێنێ..؟!

لە وەش سەیرتر وەدەنگهاتنی دەوڵەتی ئەمریکایە کە«..بار و دۆخی سەرووی عیراق » نیگەرانی کردوە. سەرۆکی ئیدارەی ڕۆژهەڵاتی نیزیکی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە وتو وێژێکدا لە گەڵ دیپلۆماتێکی ئینگلیزی لە واشنگتۆن باسی نا ئارامی باکوری عیراق دەکات کە رووسەکان دەستیان تێدایە و لەوە دەترسێ کە دەست تێوەردانی نیزامی بەریتانیا لە سەرووی عیراق « دەرەتانی چارە سەرکردنی مەسەلە وەستاوەکانی ڕۆژ هەڵاتی نیزیک» بخاتە مەترسیەوە.

ئارچیباڵد ڕۆز ڤیلت یەکێ لە مەئموورە ناسراوەکانی سیا لە نامەیەکدا کە لە

بەغداوە بۆ خێزانی ناردوە، دەنووسێ:«.... دوای شەڕ ڕۆژ هەڵاتی ناوەراست بۆتە خەبەر سازترین ناوچەی جیهان . چونکە هەمیشە لەوانەیە ئاڵوگۆڕ و ژانە سەر لەم ناوچەیە ڕوو بدات. بەیاننامەیەکی کە دوێنێ لە ڕۆژنامەکانی عیراقدا بڵاو کراوەتەوە، بە ئاشکرا باسی سەرهەڵدانی شەڕ دەکا، شەڕێک کە لەوانەیە لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا کەس لێی ئاگادار نەبێ. شەڕی نێوان ئەرتەشی عیراق و مەلا مستەفا بارزانیە، کوردێکی تەبیعەت ئاگرین و کەللە ڕەق جێگای خۆی لەو چیایانە قایم کردوە کە لە ڕوانگەی ستراتیژییەوە باشترین هەڵکەوتیان هەیە. هەڵوێستی ئەم چیایانە بۆ پەلاماری کوتو پڕ و خافڵگیرانە ئیدەئاڵە. ئێمە سەرمان سوڕماوە کە داخوا زانایانی دار و دەستەی مەلامستەفا خەریکی ئەوەش دەبن کە لە ڕازی بۆمبی ئاتۆمیش سەر دەر بکەن، یان نا؟!» (٩)

بەمجۆرە دەبینین بزووتنەوەی بارزانیش لە سۆنگەی پیلان وکەین و بەینی سیاسەتی ئینگلیز وعیراق و ئەمریکادا توشی هەرەس و تێشکان دەبێ و ئیتر تا ساڵی ١٩٦١بزووتنەوەی چەکداری لە خوارووی کوردستان جێگای خۆی دەدا بە خەبات و تێکۆشانی سیاسی وهێمنانە. خەباتی چەکداری دەوەستێ، بەڵام تێکۆشانی سیاسی کوردەکان درێژەی هەیە.

## سەرچاوەکان


١- کۆڤاری هاوار، دیمشق، ١٩٣٤، ژمارە ٨

٢و٣-، کریس کوچیرا هەمان سەر چاوە، ل ، ١٥٥ -١٥٩

٤- د، نوری دەرسیم. بە نەقڵ لە کوچرا ، ل ، ١٦٢

٥- کریس کۆچیرا هەمان سەر چاوە، ل ، ١٥٧-١٥٦

٦-ئاندرە فۆنتی، نظم نوین جهانی، وەرگێرانی عەبدولرەزا هوشەنە مەهدەوی، تاران ١٣٧١، ل، ١٩٢

٧- کەندال کوردەکان، سەر چاوەی پێشوو، ل ، ١٢٤

٨- نامەی ١٩٤٣/١٢/١٣وەزارەتی دەرەوەی ئینگلستان بۆ کورنوالیس، بە نەقڵ لە کوچیرا هەمان سەر چاوە،ل، ١٧٤

٩- ئارچیبالد رۆزڤلت، شوق اموختن، ترجمە صهبا سعیدی، ١٣٧١، ل، ٢٥٣.

# بزووتنەوەی نیشتمانی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان ١٩٤٢-١٩٤٦

دوای شکانی ڕاپەڕینی سمکۆی شکاک و هاتنە سەر کاری ڕەزاخانی میر پەنج وەک پاشایەکی ملهوڕ و دیکتاتور، ئیتر بزووتنەوەی سیاسی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە تەواوی سەرکوت دەکرێ. هەر لە ساڵی ١٩٢٦حکوومەتی ڕەزاشا بۆ پێشگری لە ڕاپەڕین وبزووتنەوەی سیاسی لە کوردستانی ئێران پەیمانی«ئەمنیەت و دۆستایەتی» لە گەڵ حکوومەتی مستەفا کەمال دەبەستێ. پەیمانی ١٩٢٦ی نێوان ئێران و تورکیا بۆ ماوەی پێنج ساڵ دەبەسترێ وساڵی ١٩٣٢ جارێکی دیکەش نوێ دەکرێتەوە تا ساڵی ١٩٢٧ کە پەیمانی شومی سەعدابادی بە ئەندامی زیاترەوە لێدێتە بەرهەم. بە گوێرەی ئەو پەیمانە کە بە ناوی« ئەمنیەت و دۆستایەتی» ناسراوە:«..ئەم دوودەوڵەتە دژی یەکتر هیچ پەلامارێک نادەن. ناچنە نێو هیچ پەیمانێکی نیزامی وئابووری و سیاسی کە دژ بە یەکێک لەم دوو دەوڵەتە ببەسترێ.وڵاتانی هاو پەیمان ڕێگا نادەن خاکی ئەوان ببێتە مەکۆ و پێگەی ئاژاوە و بزووتنەوەی دوژمنکاری دژی یەک لەم دوو وڵاتە پێک بێت. ئەم دوو دەوڵەتە دژی چالاکی و جم و جوڵی تایفە و عەشیرەتەکانی سەر سنوور( کە ڕاست کوردەکان دەگرێتەوە ح)هەنگاوی پێویست داوێژن.»(١)

بە دوای ئەو پەیمانەدا حکوومەتی ڕەزاشا بە پێڕەوی لە سیاسەت و ڕەفتاری مستەفا کەمال زمان و ئەدەب وجل و بەرگی کورد یاساغ دەکا و هەموو شوێنەوارێکی نەتەوەیی کورد کوێر دەکاتەوە. مەلا خەلیلی گۆڕئۆمری یەکێ لە زانا پایە بەرزەکانی ناوچەی مەنگوڕان ساڵی ٩٢٩١ دژی فەرمانی ڕەزاشاڕادەپەڕێ ولە گەڵ عەشیرەتی مەنگور شەڕێکی توند دژی حکوومەتی پەهلەوی دەست پێدەکا و

ئاخرەکەی دەشکێ و بزووتنەوە سەر کوت دەکرێ.

حکوومەتی رەزاشا دوای پەیمانی سەعداباد کە مادە٧ی راستەوخۆ بۆ بەرەنگاری و سەرکوتکردنی بزووتنەوەی کورددانراوە، لە سەرانسەری کوردستان دەست دەکا بە گرتنی کەسانی ناسراو ونێو بە دەرەوەی کورد و بە ناوی قاچاخچی وبیانوی جیاواز دەیانخاتە بەندیخانە و یا دووریان دەخاتەوە.(٢)

شەڕی دووەمی دنیاگر ئەگەر بۆ ولات و میللەتانی ئوروپا کوشتار و وێرانیی لە رادە بەدەری بە دواوە بوو، بۆ گەلێک ولات ونەتەوەکانی ئاسیاو ئەفریقای ژێر دەستی کۆلۆنیالیزم و رێژیمە دیکتاتۆرەکان، شنە بایەکی ئازادی بوو کە تەم ومژی بندەستی و کۆیلەتی لە سەر روکاری ئەوان دەرەواند. رۆژهەلاتی کوردستانیش لە فێنکایەتی ئەم شنەبایە بێبەش نەبوو. بەهاتنی ئۆردووی هاو پەیمانان بۆ ئێران و تێکچوونی شیرازەی حکوومەتی رەشی رەزاشا، کورد دەستی هاتەوە بەر خۆ و هێندێ لە روناکبیر و نیشتمانپەروەرانی کورد لە مەهاباد بە تەر دەستی کەوتنە خۆ ولە سپتامبری ١٩٤٢ کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد( ژ. ک )یان دامەزراند.

کۆمەڵەی ژ.ک چ لە بارەی شێوەی رێکخستن وکاری تەشکیلاتی و چ لە بواری ئامانج و ستراتیژیەوە لە گەڵ هەموو رێکخراوە کوردییەکانی پێش خۆی فەرقی هەبوو. لە ماوەیەکی کورتدا لە لایەن کۆمەلانی خەڵکەوە بە گەرمی پێشوازی لێدەکرێ و تەنانەت لە کوردستانی عیراقیش لقی خۆی دادەمەزرێنێ. فەرق و جیاوازی هەرە گرنگی کۆمەڵەی ژ . ک لە گەڵ رێکخراوە کوردییەکانی پێش خۆی لانی کەم لە دوای شەڕی یەکەمی دنیا گرەوە، لە ئامانج و پرۆگرامدا لەوەدا خۆ دەنوێنێ کە بە راشکاوی یەکگرتنەوەی کوردستانی لەتو پەتکراو دەکاتە ئامانجی خۆی. ئەمەش لە یەکەمین ژمارەی گۆڤاری نیشتمان کەلاوێژی ١٩٤٣بلاو کەرەوەی بیری کۆمەڵەی ژ . ک دا بە جوانی روونکراوەتەوە.گۆڤاری نیشتمان لە ژێر سەر دێڕی« ئامانجی ئێمە »دا دەنووسێ :

« ئەی برای کوردی خۆشەویست ! کۆمەڵەی ژ . ک بە پێچەوانەی هەموو بەر هەڵست و قۆرت و چەڵەمەیەک، وەکو دوژمنایەتی خۆ بەخۆ، دوو بەرەکی، خۆ

خۆری، پوڵ پەرستی و بێگانە دۆستی کە لە ڕێگای پێشکەوتن وسەر کەوتنی کورد دا هەیە، بە هەموو هێز و توانای خۆی تێ ئەکۆشێت تا زنجیر و کەڵەمەی دیلی و ژێر دەستی لە ئەستۆی نەتەوەی کورد دامالێ و لەم کوردستانە لەت و کوتەی ئێستا کوردستانێکی گەورە و ڕێک و پێک بێنێتە بەرهەم کە هەموو کوردێک بە سەر بەستی تێدا بژیت .»(٣)

فەرقێکی دیکەی کۆمەڵەی ژ . ک لە گەڵ ڕێکخراوەکانی پێش خۆی دیاریکردنی ڕێباز و شێوەی خەبات و تێکۆشانە. زۆربەی بزووتنەوەکانی کوردی پێش کۆمەڵەی ژ . ک و تەنانەت دوای ڕووخانی کۆماری کوردستانیش بە بێ لەبەر چاو گرتنی بار و دۆخی خۆجێیی و نێو نەتەوەیی و بە بێ لێکدانەوەی هێز و توانای خۆماڵی و دوژمن و هێندێ جاریش بە هاندانی دوژمنی کورد ڕێگای چیایان گرتوتە بەر و چەک و قوڵە تفەنگیان کردۆتە ڕێبازی سەرەکی خەبات و لە قوربانیکردنی لاوانی کورد و وێرانی کوردستان بە دەر، دەستکەوتێکی بەرچاویان وەدەست نە هێناوە. کۆمەڵەی ژ . ک بۆ گەیشتن بە ئازادی بۆ چوونێکی دیکەی هەبوە و ڕێگایەکی دیکەی نیشانداوە: «... زۆر کەس وائێک ئەدەنەوە کە ئەبێ نەتەوەی کورد بە زۆر و نیرووی چەک لە دیلی ڕزگار بکرێت. بەڵام ئەوانە هەموو بە هەڵە چوون و ڕێگای ڕاستیان لێ ونبوە، چونکو چەک و تفاقی شەڕ کە لە چەنگ کورد دایە لە بەرانبەر چەک و تفاقی شەڕی ئەمانەی بوونە بەر هەڵستی سەر بەستی ئێمە کار ناکات. ئەبێ کورد بزانێت ئیمڕۆ تفەنگ لە چاو گوللە ڕژێن و تۆپ وتانک و فڕۆکە و... و تۆقتۆقەیەک زیاتر نیە. تەنیا ڕێگایەکی ئەبێ کورد بەرەو سەر بەستی پێیا بڕوا شەقامی شارستانیتیە، ئەم ڕێگا ڕاست و ڕەوان ئەچێتە ناو مێرگی ئازادی و سەر بەستی »(٤)

ئەوبۆچوونەی کۆمەڵەی ژ.ک، لێکدانەوەیەکی قوڵی شارستانیەت و نیشاندانی ڕێگایەکی ئەوەندە ڕاست و پان و بەرینە، تەنانەت پاش پتر لە پەنجا ساڵیش بی خەبات و تێکۆشانی ئیمڕۆی کورد، بۆ گەیشتن بە ئازادی نرخ و بایەخی خۆی هەیە.کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد پاش سێ ساڵ تێکۆشان لە مانگی ئوکتۆبری ١٩٤٥

جێگای خۆی دەدا بە حیزبی دێموکراتی کوردستان.

ئەم جێگا گۆڕینە و هۆی نەمانی کۆمەڵەی ژ . ک تا ئێستاش لە ژێر تەم و مژ و تاریکیدا ماوەتەوە و نووسین و دەربڕینی بیر و ڕای جیاوازیش تا ئێستا نەیانتوانیوە ئەم تەم ومژە لە سەر ئەم ڕووداوە بڕەوێنن. بە بۆچوونی من جگە لە سیاسەتی شۆڤێنیستی جەعفەر باغرۆف سەرکۆماری ئەو دەمی ئازەربایجانی سۆڤێتی کە بۆ ئازەربایجانی ئێران نەخشەی تایبەتی کێشابوو، سیاسەتی گشتی دەوڵەتی سۆڤێت سەبارەت بە مەسەلەی کوردتەنسیری نالەباری ڕاستەو خۆی هەبوە لە گۆڕینی کۆمەڵەی ژ. ک بە حیزبی دێموکراتی کوردستان.(٥)

«... لە دوازدەی سیپتامبر، سەروان نماز عەلییۆف فەرماندەی پادگانی سۆڤێت لە میاندواو، سەرۆکانی عەشایری کورد و قازی محەممەد و سەیفی قازی بە ڕواڵەت بۆ چاو پێکەوتنی کونسولی سۆڤێت لە تەورێز داوەت کرد. کاتێ گەیشتنە تەورێز بەو کوردانەی کە لەم ڕووداوە سەریان سوڕ مابوو ، گوترا بچنە نێزگەی ڕێگای ئاسن و بە پەلە لە قەتاریان ئاخنین و بردیاننە باکۆ. لە باکۆ سێ ڕۆژ لە دەرەوەی شار لە ویلایەکیان دانان و بە گەڕانی نێو شار و دیتنی بەرنامەکانی تیاتر و ئۆپێرا ڕایان بوارد. ڕۆژی چوارەم بردیاننە گن باغریۆف سەر کۆماری ئازەربایجانی سۆڤیتی. باغریۆف لە بارەی ستەمی حکوومەتی ڕەزاشا سەبارەت بەکوردان باسێکی درێژی کرد وگوتی: دەوڵەتی سۆڤێت حیزبی تازە دامەزراوی دێموکرات کە ئامانجی دابینکردنی ئازادییە بۆ ستەم لێکراوەکان یارمەتی دەدا. داوای لە وانیش کرد کە بچنە ناو ئەو ئەو حیزبەوە. ( مەبەستی فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان بوە. ک.ح) ناو براوحیزبی توده وکۆمەڵەی مەحکوم کرد. حیزبی تودەی بە دەستەیەکی ئاژاوەچی و بێ خاسیەت ناو برد. کۆمەڵەشی بە حیزبێک دانا کە ڕیشە وسەناز بوونی لە عیراقەوەیە و بە پشتیوانی و لە ژێر چاوەدێری دەزگای زانیاری بەریتانیادا پێکهاتوە و جگە لە ئامرازی دەستی ئیمپریالیزمی بەریتانیا شتێکی دیکە نیە. بە کوردەکانیشیان گوت کە لە بارەی ئەم سەفەرەوە هیچ شتێ باس نەکەن.

# دامەزرانی حیزبی دێموکراتی کوردستان

بەرهەمی سەفەری سەرۆکانی کورد بۆ ئازەربایجانی سۆڤیێت زوو دەرکەوت. قازی محەممەد کەمێک پاش گەڕانەوە کۆبوونەوەیەکی لە کەیخودا و گەورە پیاوانی کورد پێکهێنا و دامەزرانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ڕاگەیاند. داوای لە بەشدارانی کۆبوونەوە کرد کە بێنە ناو ئەم حیزبە. دامەزرانی حیزبی تازە بۆ بەهۆی هەڵوەشانی کۆمەڵە وهاتنی ئەندامانی ئەو بۆ نێو حیزبی دێموکرات...»(٦)

لە ڕاپۆرتێکدا کە کونسولی سۆڤیێتی لە ورمێ لە ١٩٤٥دا بۆ وەزارەتی دەرەوەی یەکێتی سۆڤیێتی ناردوە، دەردەکەوێ کە کاربەدەستانی سۆڤیێتی لە کوردستان پێش سەفەری سەرۆکانی کورد بۆ باکۆ، بۆ گۆڕین و یا تە هێشتنی کۆمەڵەی ژ.ک دەست بە کار بوون و بە چاو پێکەوتنی پیاوە ناسراوەکانی کورد زەمینەیان بۆ نەمانی کۆمەڵەی ژ.ک ئامادە کردوە. هەربۆیەش هیچ بەڵگەیەک بە دەستەوەنیەە نیە کە هیچ.یەک لە ئەندامانی کۆمەڵەی ژ.ک. و یا سەرۆکانی کورد کە لە سەفەری. باکۆ لە گەڵ قازی محەممەد بوون، ڕەخنەیان لە تێکدانی کۆمەڵەی ژ.ک. گرتبێ و یا دژی دامەزرانی حیزبی دێموکرات دەنگی هەبوو بێ.

هاشم ئۆڤ کونسولی سۆڤیێت لە ورمێ لە ڕاپۆرتی خۆیدا دەنووسێ:

«..... بە پێی دەستوری مۆسکۆ لە مانگی ئاب پێوەندیمان لە گەڵ کۆمەڵەی ژ . ک گۆڕیوە. لە چاو پێکەوتنێکدا لە گەڵ ناسراوەکانی کورد ئێمە بە شێوەیەکی پارێزەرانە( احتیاط) تێمانگەیاندن کە ئێمە پێمانوایە بیر و باوەڕی « سەر بە خۆیی کوردستان«کاتی خۆی نیە و واقعیش نیە. لە بەر ئەوە زیاتر لە لایەن دوژمنانی کوردەوە پشتیوانی دەکرێت و هەر ئەوانیش کەمتر لە هەموو لایەک بیر

**له ئازادی و سەربەخۆیی ڕاستە قینەی گەلی کورد دەکەنەوە. بە مەبەستی باشتر کردنی ژیانی گەلی کورد ئێمە بە پێشکەوتوخوازەکانی کۆمەڵەی ژ . ک پێشنیار دەکەین بۆ مافی یەکسانیی کورد لە چوار چێوەی یاسای ئێراندا لە سەر بنچینەی دیموکراتیانەی وڵات هەوڵ بدەن...»(٧)**

**پێداگرتنی باغرۆف لە سەر گۆڕینی ناوی کۆمەڵەی ژ . ک و دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە سەر وێنەی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان و گۆڕینی بەرنامە و ئامانجی کۆمەڵە، هەروەک ئاماژەی بۆکرا ،دەبێ هەربگەڕێتەوە بۆ سیاسەتی ناڕوونی سۆڤیێت لە سەر مەسەلەی کورد. پێداچوونەوەی بەڵگەکان ڕوونی دەکەنەوە کە بیر و بۆچوونی سۆڤیێت سەبارەت بە مەسەلەی کورد تا ڕادەیەکی زۆر دوور لە واقعیەت و لێکدانەوەی زانستی بوە. کاربەدەستانی سۆڤیێت بزووتنەوەی کوردیان بە ئامرازی سیاسەتی ئینگلیز زانیوە. «... مەسەلەی کوردەکان ئەو دەم گەلێک سەرنجی ئێمەی ڕاکێشا بوو. بە تایبەت لە ڕوانگەی بەشی دەرەوەی « گ . پ. ئو» ( ئیدارەی گشتی سیاسی وڵات) (Gossoudarstvennoye Politeskoye Oupravleenie) سەیری مەسەلەی کوردمان دەکرد و ئەگەر سەقامگرتویی کوردەکانمان لە ناوچەیەک کە کەوتۆتە نێوان چوار وڵاتی تورکیاو ئێران و عێراق و ڕووسیا لێکدەدایەوە، مەسەلەکە سەرنجڕاکێشتر دەبوو. چونکە ناوچەی نیشتە جێی کورد لە عێراقەوە تا قەفقازی داگرتوە. بۆیە لە کاتی ساز بوونی شەڕ لە نێوان ئینگلستان و سۆڤیێت، هەڵکەوتی کوردەکان دەیتوانی لە نێوان دوو دەوڵەتی شەڕکەردا دەورێکی گرنگی هەبێ و ئێمە دەمانتوانی بە پشتیوانی کوردەکان خاکی عیراق پەلامار بدەین کە بە گوێرەی زانیاری « گ.پ. ئو» پێگەی هەوایی ئینگلیزەکان لە وێ ساز کرابوو.**

**لە سەر ئەم خەیاڵ و بۆ چوونە دەوڵەتی سۆڤیێت لە سەرەتای ساڵی ١٩٢٧ کەوتە بیری ئەوە کە لە ناوچەیەکی بچوکی کورد نشینی خاکی خۆی « کۆمارێکی سەر بە خۆی کورد» ساز بکا تا لەو ڕێگایەوە بە ڕاکێشانی کوردەکانی نیشتە جێی وڵاتانی دراوسێ بۆ لای خۆ و هاندانی هەستی ئەوانەی کە ساڵانی ساڵە داخوازی »**

کوردستانی سەر بە خۆ» بوون، بتوانێ تەواوی مەڵبەندی کورد نشینی سێ وڵاتی ئێران و عیراق و تورکیا لە خاکی خۆی زیاد بکا. بەڵام وەزیری دەرەوەی سۆڤێت بەو دەلیلە کە ئەم مەسەلەیە بۆ وڵاتانی ئێران و تورکیا ناخۆش دەبێ، لە گەڵ ئەم نەخشەیە موافەقەتی نەکرد و بە ئیجباری بەرنامەیەکی دیکەی بەمجۆرەی خوارەوە پێشنیار کرد: «... بۆ ئەوەی بتوانین جێ پێیەکی قایم لە باری تەبلیغاتیەوە لە نێو کوردان پەیدا بکەین، پێویستە لە پێشدا بە وردی روحیەی سەرۆکەکانی کورد موتالا بکەین و بە کەلک وەر گرتن لە خاڵی لاوازی ئەوان تێبکۆشین رایەڵکەی جاسوسی بەر بڵاو لە سەرانسەری ناوچەکەدا پێک بێنین. پاش بەجێگەیاندنی وردی ئەم کارە سەرەتاییە بتوانین پەیمانێکی نهێنی لە گەڵ کوردەکان ببەستین و بە گوێرەی ئەو پەیمانە لە یارمەتیەکانی ئەوان دژی دوژمن کەلک وەر گرین...» (٨)

دەبێ هەر لەسەر ئەم بۆچوون و سیاسەتە چەوتە بوو بێ وەک باسکرا، دوای هاتنی ئەرتەشی رووس بۆ مەڵبەندی کوردستان، لە ساڵی ١٩٤٢ هێندێ لە دەرەبەگ و سەرۆک عەشیرەتی کوردیان بۆ باکۆ داوەت کرد و هەر یەکەی بە دیاری وکادۆیەکی بێ نرخ ناردیاننەوە.

هەر چۆنێک بێ حیزبی دیموکرات لە گەڵ دامەزرانی خۆی هێندێ دیاردەی وێکنەچوو و دژ بە یەکتر(ضد ونقیض) لە گەڵ خۆی دێنێتە نێو کۆمەڵگای ئەو رۆژەی کوردستان و هەر لەو کاتەشدا هێندێ هەنگاوی بەرزی ئازایانە ی نەتەوەیی و نیشتمانی هەڵدێنێ کە لە مێژووی رابردووی خەباتی نەتەوەی کوردا بێ وێنە بوە.

حیزبی دیموکراتی کوردستان گۆڕانێکی قوڵ بە سەر ئامانج و بەرنامەی کۆمەڵەی ژ . ک دادێنێ. لە جیاتی درێژە پێدانی بەرنامەی کۆمەڵە کە« پێکهێنانی کوردستانێکی گەورە و یەکگرتوە» خودموختاری دەکاتە بەرنامەی تێکۆشانی خۆی: « لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی هیچ دوژمنایەتی و ناکۆکی نیە و.... تەنیا ئەیەوێ لە رێگەی ئاشتیەوە بۆ دامەزراندن وپەرە پێدانی فەرهەنگ و تەندروستی و کشت و کاڵی گەلی کورد... تێبکۆشێت و بۆ ئەمەش داوای مافی خودموختاری نەتەوایەتی ئەکات.. » (٩)

## خود موختاری، فیدرالی یا سەر بەخۆیی

حیزبی دێموکرات لەو کاتەدا کە خۆدموختاری دەکاتە بەرنامەی تێکۆشانی خۆی، هەر لەو کاتەشدا هەنگاوی بەکردەوەی ئەو تۆ هەڵدێنێ کە لە گەڵ داب و سیستمی خود موختاری نایەنەوە و تەنانەت لە فیدرالیش تێدەپەڕن. چونکە خۆدموختاری و فیدرال پێویستە لە سەر بناغەی ڕێککەوتنی نێوانی حکوومەتی ناوەندی و هێز و خەڵکی خۆدموختار خواز و فیدراڵی خواز دابمەزرێ. کاتێ مەسەلەی ئازەربایجان لە پارلمانی ئێراندا دێتە باسکردن، دوکتور مصدق سەبارەت بو ڕووداوەکانی ئازەربایجان لە وتاری خۆیدا دەڵێ: «.... دەوڵەتی خۆدموختار دەبێ بەگوێرەی پرسی گشتی دابمەزرێت. قانونی ئەساسی ئێمە ئیمڕۆ ئیجازەی پێکهاتنی دەوڵەتێکی ئاوا نادات. لەوانەیە ئێمە ڕێفراندۆم بکەین. ئەگەر میللەت دەنگی بۆدا، با وڵاتی ئێمەش ئێران وەک دەوڵەتەکانی یەککگرتووی ئەمریکای باکور و سویس ببێتە دەوڵەتی فیدراڵی. ناکرێ بڵێین لە وڵاتێکدا بەشێک فیدراڵ یا خود موختار بیت و بەشێکیش دەوڵەتی ناوەندی. قانونی ئەساسی قەراردادێکی کۆمەلایەتیە. (Cotrat collectif) ئەم کۆنترات کۆلێکتیفە تا لە لایەن کۆمەلانی خەڵکەوە باش نەکرێ و یا هەڵنەوەشێتەوە، بەڕێوە دەچێ. من هەرگیز دژی ئەوە نیم کە وڵاتی ئێران ببێتە دەوڵەتێکی فیدراڵ. لەوانەیە دەوڵەتی فیدراڵ باشتر بێ کە هەر ئەیالەتە یەک یاچەند دەسەڵاتی ناوچەیی هەبێ. ئەم ئەیالەتانەش لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی ڕێک بکەون، دەوڵەتی ناوەندیش پێوەندییە نێونەتەوایەتیەکان بەڕێوە بەرێ. بەلام هەر گۆڕانێکی لە قانونی ئەساسیدا پێک بێ، پێوویستە لە ڕێگای ڕێفراندۆمیکی گشتی ئەنجام بدرێ...» (١٠)

وەک دەزانین حیزبی دێموکرات بە پشتیوانیی کۆمەلانی خەڵک لە مانگی دیسامبری ١٩٤٥ ئالای دەوڵەتی ئێران لە سەر بانی ئیدارەکانی حکوومەتی دێنێتە خوار و ئالای کوردستان کە پێچەوانەی ئالای ئێرانە لە جێگای ئەوبەرز دەکاتەوە. ناوچەی ژێر دەسەلاتی بزووتنەوەی کورد لە دەسەلاتی حکوومەتی ناوەندی تاران پاک دەکاتەوە. لە ڕۆژی ٢٢ی جەنیفەری ١٩٤٦( دووی ڕێبەندانی ١٣٤٥ بە بەشداری بیست هەزار کەس لە کوردی هەموو بەشەکانی کوردستانی لەت و کوتکراو ، کۆماری کوردستانی ڕادەگەیێنێ و قازی محەممەدی سەرۆکی حیزبی دێموکرات بە سەر کۆمار دیاری دەکات و بە گوێرەی ڕێ و ڕەسمی ولاتانی جیهان قازی محەممەد سوێندی سەرکۆماری دەخوات و دەڵێ : « من بە خودا و بە کەلامی عەظیمی خودا و بە نیشتمان و بە شەرافەتی میللی کورد و بە ئالای موقەدەسی کوردستان سوێند دەخۆم کە تا ئاخرین هەناسەی ژیانم و ڕژاندنی ئاخر تنۆکی خوێنم بە گیان و بە ماڵ لە ڕێی ڕاگرتنی سەربەخۆیی و بەرز کردنەوەی ئالای کوردستان تێبکۆشم.» (١١)

ڕۆژنامەی کوردستان ڕۆژی دووی ڕێبەندان بە:«..ڕۆژی جێژنی سەربەخۆیی و ئیستیقلالی کوردستان ودرەوشینی ئەستێرەی خۆشبەختی کوردان..» دەناسێنێ.(١٢)

حکوومەتی میللی کوردستان لە سەرۆک وەزیر و هەیئەتی وەزیران پێک دێت و ئەرتەشی میللی کوردستان( هێزی بەرگری) دادەمەزرێ، ناو و دەرەجە و لیباسی ئەفسەرانی ئەرتەشی ئێران دێتە گۆڕین و بۆ هێزی بەرگری کوردستان ناو و دەرەجە و لیباسی تایبەت بە کۆماری کوردستان دیاری دەکرێن. مەلا مستەفا بارزانی کە دوای خەباتێکی سەخت و شەڕێکی دژوار ڕووی کردبوە ڕۆژ هەلاتی کوردستان و بە خۆ و هێز و لایەنگرانیەوە ببوە پێشمەرگەو هێزی سەرەکی پاراستنی کۆماری کوردستان، لە لایەن سەر کۆمارەوە بە فەرماندەی گشتی هێزی چەکداری کوردستان دیاری دەکرێ. بارزانی نەمر بەم بۆنەوە لە وتارێکی کورت دا، شانازی بەم ئەرکە پیرۆزە دەکا و دەڵێ :«..... ئەمرۆ لە کاتێکا پیرۆز بابیتان

لێدەکەم کە لە پێتەختی دەوڵەتی کوردستانم و ئاڵای پاکی ئازادی لە سەر نیشتمان و میللەتەکەمان ئەلەرێتەوە. بۆ من شانازیەکی گەورەیە کە وەک پێشمەرگەیەک لە شۆڕشی کوردستاندا بەشدارم. شانازی گەورەتر ئەوەیە کە بۆ پارێزگاری نیشتمانم بە فەرماندەی هێزی پێشمەرگە هەڵبژێردراوم .. » (١٣)

کۆماری کوردستان زمانی کوردی لە ئیدارە و قوتابخانان کە تا ئەو دەم لە دەورانی حکوومەتی رەزشادا یاساخ و باسی سەر بوو، دەکاتە رەسمی. کتێب و رۆژنامە ی چاپەمەنی کوردی دەست بە تێکۆشان دەکەن. قانون و ڕێ و شوێنی تایبەت بە بار و دۆخی کوردستان پەسند دەکرێن. پەیمانی دۆستی و هاوکاری لە گەڵ حکوومەتی میللی ئازەربایجان دەبەسترێ. کوردستانی ئێران دەکاتە ماڵ و نیشتمانی هەموو کوردێک لە هەر چوار پارچەی کوردستان و بە قەولی ئارچیباڵد رۆزڤێلت:«.. خەونی ناسیۆنالیستەکانی کورد بە بوونی کوردستانێکی سەربەخۆ لە دیسامبری١٩٤٥تادیسامبری١٩٤٦لەچوارچێوەی دەوڵەتێکی بچوک لە کوردستانی ئێران وەدیهات. چۆنیەتی دامەزران و پێکهاتنی کۆماری کورد، تەمەنی کورت و پڕ لە رووداوی ئەو، هەر وەها تێکچوونی کوت و پڕ و لەناکاوی، یەکێ لە بەسەر هاتە هەرە روونکەرەوەکانی رۆژ هەلاتی نێوە ڕاستی سەر دەمی ئێمەیە.» (١٤)

بەڵێ لە کاتێکالە کۆمەڵگایەکی دواکەوتووی دەرەبەگی و عەشایریدا، گەلی کورد لەم بەشەی کوردستان لە هەل و دەرفەتی پێشهاتوو دەیەوێ کەلک وەر بگرێ و بە شێوەیەکی هێمنانە و دیموکراتیانە دام و دەزگای نەتەوەیی خۆی دابمەزرێنێ و ژیانێکی ئازاد و دوور لە ژێردەستی بۆ گەلی کورد دابین بکا، چارەنووسی کۆماری کوردستان و مافی دیاریکردنی چارەنووسی گەلی کورد بە دەستی خۆی لەم بەشەی کوردستاندا دەکەوێتە نێو گەمەی دەوڵەتانی رووس و ئەمریکا وئینگلیز لە لایەک و ئێران و رووس و ئازەربایجان لە لایەکی دیکەوە. ئاکامی ئەو گەمە پێنج قۆڵیەش دەبێتە هۆی لە بەینچوونی کۆماری کوردستان و لە دار دانی سەر کۆمار و هاورێیانی و گەڕانەوەی دەسەلاتی ڕەشی حکوومەتی دیکتاتۆر و شۆڤێنی ئێران و پێشێلکردنی ئازادی و مافی ئینسانیی و نەتەوەیی گەلی کورد لە ڕۆژهەلاتی کوردستاندا.

# هێندێ لایەنی هۆکاری تێکچوونی کۆماری کوردستان

سەبارەت بە پێکهاتن و لە بەینچونی کۆماری کوردستان لە مەهاباد زۆر شت نووسراوە. گەلێک لە نووسەر و سیاسی بێگانە و خۆماڵی بیر و ڕای جیاوازیان لەمبارەوە دەر بڕیوە. بەڵام ئەگەر بە وردی لەو نووسین و بۆچوونانە ورد بینەوە، هیچیان بە تەواوی نە چوونە بنج و بناوانی بە سەر هاتی کۆماری کوردستان و بابەتێکی تەواو پوخت و پاککراویان نە داوەتە دەست خوێنەرانی کورد. هۆی هەرە گرنگی ئەم ناتەواویەش ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ دەستپێڕا نەگەیشتنی بەڵگە و نووسراوە و دوکۆمێنتی کۆمار و ڕازی پێوەندییەکانی کۆمار لە گەڵ زلهێزەکانی دەسەڵاتداری ئەو ڕۆژەی ئێران کە بریتی بوون لە ئەمریکا و رووس و ئینگلیز. نووسراوە ودۆکۆمێنتی ئارشیوی کۆمار لە گەڵ هاتنەوەی ئەرتەشی ئێران هەمووی سووتێنراون و نە کەوتۆنەتە دەستی خەڵک. ئەو بەڵگە و دۆکۆمێنتانەش کە لەم پێوەندییەدا کەوتوونەتە ئەرشیوی وەزارەتخانەکانی ئەمریکا و ئینگلیز و روس، تا ئێستاش بەشی زۆریان لە نهێنیدا ڕاگیراون و بڵاو نەکراونەوە. لەم دواییانەدا هێندێ بەڵگە سەبارەت بە کۆمەڵەی ژ.ک و کۆماری کوردستان لە ئەرشیوی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیاو روسیا هاتوونە دەر، بەڵام هێشتا هۆیەکانی سەرەکی ڕوخانی کۆماری کوردستان بەو بەڵگانەش بە تەواوی ڕوون ناکرێنەوە.

زۆربەی نووسەرانی بێگانە و خۆماڵی خەتا و تاوانی تێکچوونی کۆماری کوردستان بە گشتی دەخەنە سەرئەستۆی سیاسەتی سۆڤیێتی پێشوو، ئاوڕێکی پاکیش لە مەڕ بزووتنەوەی کورد بە سیاسەت و هەڵوێستی ئەمریکا و ئینگلیز دادەکەن و یا هەر باسیان ناکەن کە ڕاستەو خۆ دەستیان لە تێکدانی کۆماری

کوردستاندا هەبوە. یا لە شیکردنەوەی بابەتیی بار و دۆخی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتوری ئەوسای کۆمەڵگای کوردستان خۆ دەبوێرن. هێندێ لە نووسەرانیش لە سەر ئەو باوەڕەن کە سیاسەتی یەکێتی سۆڤیێتی ئەوسا لە ئازەربایجان و کوردستان جەعفەرباغرئۆف سەر کۆماری ئازەربایجانی سۆڤیێتی نوێنەرایەتی کردوە. ئەویش بە بیر و باوەڕی شۆڤێنیستی ویستوویەتی ئەگەر بۆی بکرێ ئازەربایجانی ئێران تێکەڵ بە ئازەربایجانی سۆڤیێتی بکاتەوە.

هێندێکی ترلە شارەزایانی سیاسی ئەو دەمی ئێران لایان وایە کە سیاسەتی وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیێت لە گەڵ هەڵوێستی ڕێبەرانی کۆماری ئازەربایجانی سۆڤیێتی لە بارەی مەسەلەی ئازەربایجانەوە یەکی نەگرتۆتەوە.«.... دوای ڕووداوی ئازەربایجان کاتێکی ئیرەجی ئەسکەندەری لە باڵیۆزخانەی سۆڤیێت لە تاران لە گەڵ عەلی ئۆف ڕەخنە لە سیاسەتی سۆڤیێت دەگرێ، ناو براو لە وەڵامی ئەسکەندەری دا دەڵێ : مەسەلەی ئازەربایجانی لە گۆڕیدا نیە. مەسەلەی تەواوی ئێران بۆ ئێمە لە گۆڕێدایە. بەمحاڵە دەتوانێ زەمیینە بۆ هەنگاوە شۆڕشگێڕەکانی دیکە ئامادە بکات. وادەر دەکەوێ کە لە نێوان باڵیۆزخانەی سۆڤیێت لە تاران و کاربەدەستانی ئازەربایجانی سۆڤیێتی سەبارەت بە و مەسەلەیە ناتەبایی بیروڕا هەبوە.....» (١٥)

ئەم سیاسەتە چەوت وچەپەڵەی کە نەک هەر بزووتنەوەی ئازەربایجانی تەفر و تونا کرد، بەڵکوو بوو بە هۆی لە بەینبردنی بزووتنەوەی نیشتمانی کوردستان و سیاسەتی سۆڤیێتیشی لە ئێران داتووشی شکست و ڕیسوایی کردلە بنەماوە دەگەڕێتەوە بۆ چەوتی سیاسەتی سۆڤیێت سەبارەت بە مەسەلەی کورد وتەنانەت دژایەتیشی لە گەڵ سەر بەخۆیی کوردستان، بە بیانووی بێتامی نەفامانە و ئەم سیاسەتەش سەری بە وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیێتەوە بەندبوە وچەوتی وناتەبایی ئەم سیاسەتە لە وێوە سەرچاوەی گرتوە. سەیرێکی نامەی مۆلۆتۆف بۆ نوێنەرانی باڵیۆزخانەی سۆڤیێت لە ئێران، سیاسەتی وەزارەتی دەرەوەی یەکێتی سۆڤیێتیمان سەبارەت بە بزووتنەوەی نیشتمانی کورد لە ئێران بۆ ڕوون دەبێتەوە:

«....... هەڵەی نوێنەرەکانمان دەرخەری ئەوەیە کە ئەوان هێشتا لە پێوەندییەکانی کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی لە ئێران تێناگەن. ئەوان لە خۆیان ڕوون نەکردۆتەوە کە خەباتی کوردەکانی ئێران بۆ خود موختاری و سەر بەخۆیی بە پێی ناوەرۆکی کۆمەڵایەتییەکەی، دیفاعێکی کۆنە پەرستانەیە لە فیئۆدال-عەشیرەی جیاوازیخوازی کورد، دژ بە سیاسەتی سەنترالیزم لە ئێران. کوردەکان بە چەند گرووپێک دابەشبوون کە زۆر جار عەشیرەتەکان لە نێو خۆیاندا دوژمنایەتیان هەیە و یەکێتی نەتەوەییان نیە. جیاوازیخوازی کوردان لە ئێران هەمیشە لە ڕۆژ هەڵاتی ناوەڕاستدا بۆتە بیانوێک بۆ سیاسەتی ئینگلیز و تورکەکان. هەر چەند خەباتی نەپساوەی کوردەکان بۆ جیا بوونەوە لە ئێران لە ڕابردووشدا هەر هەبوە.. بەڵام لە لایەن بەکرێگیراوانی ئینگلیز و تورکیاوە بۆ وەر گرتنی هێندێک پشکی ئابوری و سیاسی جۆراوجۆر لە ئێران بەڕێوە چوە. سەرۆکەکانی کورد کە خەڵکی ئاسایی کورد گوێ بۆ فەرمانەکانیان شل دەکەن، زۆربەیان سەر سپاردەی دەوڵەتە جۆراو جۆرەکانی ئیمپریالیستین و بگرە لە ناویشیاندا ڕاسپاردەی دەوڵەتە فاشیستەکان کەم نین.

فیئۆدال – سیرواژەکانی کورد دەسەڵاتی زەویداریی و دەسەڵاتی عەشیرەتیان لێک گرێداوە. سەر کردەکانی کورد بە گوێرەی بەرژەوەندیی خۆیان، بەهاسانی ئەربابەکانی خۆیان دەگۆڕن. لە بەر ئەوە نابێ ئاکاری سەرۆکەکانی کورد کە وا ئێستا لە گەڵ نوێنەراتی ئێمە خەریکی خۆش و بێشن، جێی بڕوا بێت. چونکە ئەوان کاتێ لە خەباتی خۆیان کەلک وەر دەگرن، کە پاڵ وەهێزەکانی ئەرتەشی سوور بدەن. ئەو کارە لەوانەیە کار بەدەستەکانمان توشی هەڵە بکات کە لە ڕووی بێ ئەزموونی و خۆش باوەڕی پێیانوایە کە هەموو، یان بەشێک لە سەرۆکەکانی کورد بە ڕاستی لایەنگری سۆڤیێتن. ئەو بڕوایە ئەگەر نە گۆڕدرێ، یان تێنەخوێندرێتەوە ڕەنگە لە کردەوەدا ئاکامێکی زۆر زیانباری بۆ ئێمە هەبێ. کوشتار وبریندار کردنی سەربازەکانی ئەرتەشی سوور لە لایەن کوردانەوە، درێژە دان بە تالان بە پێچەوانەی ئاکاری بڕیار دراوی فەرماندەرێتی ئێمەوە سەبارەت بە

ئاودیو کردنی مەڕ و ماڵات بۆ تورکیا و هتد.... لە لایەن کوردانەوە، دەبێ کار بەدەستانمان لە باوەڕی چاو بەستوانە لە ئاست کورد و ڕێبەرەکانیانەوە دوورە پەرێز بن.

بۆ پێشگری لەتێوە چوونی هەڵەی نوێنەرەکانمان‌دەبێ بە لێبڕاوی لە هێڵی نادروستی خۆش و بێش لە گەڵ کوردان دووری بکرێ و لە پێناو پتەو کردن و پەرە پێدانی پێوەندییەکانمان لەگەڵ دانیشتوانی خۆجێیی لە ڕادەی یەکەمدا ئازەرییەکان هەنگاو بنرێت. هەر وەک ئاشکرایە ئازەربایجانییەکان زۆربەی خەڵکی ئازەربایجان پێک دێنن و پێوەندییەکی زۆر نیزیکیان لە باری ئەتنۆگرافی و مێژوویەوە لە گەڵ ئازەربایجانی سۆڤیێتیەوە هەیە.. هەمیشە بەشی زۆری هێزی بزووتنەوەی دێموکراتیک لە ئێران پێک دێنن. کار بەدەستەکانمان لە ئازەربایجانی ئێراندا نابێ بڕوایان بە سەرۆکە کۆنە پەرست و خۆ فرۆشەکانی کورد هەبێ. بەڵکوو دەبێ حیساب بۆ ماکەی پێشکەوتوو لە نێو دانیشتوانی ئازەربایجاندا بکەنەوە. ئەوە بەو مانایە نیە کە ئێمە لە تەواوی پێوەندییەکانمان لە گەڵ کوردان وکەلک وەر گرتن لەو پێوەندییانە بۆ بەرژەوەندی خۆمان چاو بپۆشین. بەڵکوو دەبێ لە کارە سیاسیەکانمان لە باکوری ئێراندا لە سەر ئازەربایجانیەکان حیساب بکەین. بە تایبەت لە نێو ئەواندا دەتوانرێ کەسانی باوەڕ پێکراو و لایەنگری ئێمە لە جیاتی کوردان بدۆزینەوە. لە پێناو ئەم مەبەستەدا، دەبێ بە لێبڕاوی لە پشتیوانی کردنی کوردان دوورە پەرێزی بکرێ و هیچ جەشنە کۆسپێک لە ئاست دەسەڵاتدارانی ئێرانی سەبارەت بە ڕاگرتنی هێمنایەتی پێکنە هێنرێ. بە پێچەوانەوە دەبێ لە ئازەربایجاندا بۆ لە ناو بردنی تاڵان و ڕاو ڕووت لە لایەن کوردانەوە هاوکاریان لە گەڵ بکرێ، یا ناوچەیێکی هێمن بۆ دانیشتوانی خۆ جێیی لە دەست درێژی و پەلاماری کوردان پێک بهێنرێ. دەبێ دان بەوەدا بنێین کە پشتیوانی کردن و یارمەتی بە کوردان لە پێناو هەوڵ و تێکۆشانیان بۆ وەدیهێنانی خود موختاری ودامەزرانی کوردستانێکی ئازاد دروست نیە. چونکە لە هەل و مەرجی ئێستای ئێراندا ئەوە داخوازێکی بێ بناغە و دواکەوتوانەیە. بە کورتی

پێویسته له ئازەربایجاندا گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی له کار و باری نوێنەرەکانمان، ئەویش له ڕێگای پەرە پێدانی پێگەکانمان له نێو خودی دانیشتوانی ئازەربایجاندا پێک بێت.

پێویسته زۆربەی کاربەدەستانی باڵیۆزخانه و کونسولگەرییەکان و فەرمانبەرانی نیزامی و فەرماندەرانی یەکانەکانی ئەرتەشیمان له ئێران له نێوەرۆکی ئەم نامەیه ئاگادار بکرێن و دوای تێگەیشتن دەبێ نامەکه بۆ کۆمیسارییای گەلیی له کار و باری دەرەوەدا بنێرنەوە. کۆمیسەری گەلی کار و باری دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەتی، و.م. مۆلۆتۆف ژمارە ١٤٢-م ٣١ ئاوگوستی ١٩٤٢،» (١٦)

وەک دەبینین ئاوەکه له سەرچاوەوە لێڵ و قوڕاوە و جەعفەرباغرئۆف سەرەڕای شۆڤێنیستی وبەرچاوتەنگیی خۆی، لەئاست مەسەلەی کورد و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، پیرەوی له سیاسەتی ناوەندی کردوە.

بەگوێرەی شیکردنەوە ولێکدانەوەی ڕووداوەکان وبارو دۆخی سیاسی و کۆمەلایەتی ئەو زەمان و هەڵسەنگاندنی بەڵگە و نووسراوەکان ڕەنگە مرۆڤ بتوانێ له پاڵ ئەم بەڵگانەدا چەند هۆی دیکەش بۆ تێکچوونی کۆماری کوردستان دەستنیشان بکات.

یەکەم - بار ودۆخی خۆجێیی کوردستان :

ئەلف- کوردستانی ساڵەکانی ١٩٤٢-١٩٤٦ بریتی بوو له کۆمەڵگایەکی دوا کەوتوو که پێوەندییەکانی دەرەبەگی له دێهاتی کوردستاندا باو بوو. سەرۆک عەشیرەت و دەرەبەگ و خاوەن مڵکی گەورە بە تەواوی بە سەر گیان و ماڵی خەڵکدا زاڵ بوون، له بواری ئابووریشەوە له وەزعێکی شپرزەدا دەژیا. بەرهەمی گرنگی ناوچەکانی کوردستانی ئێران توتنه. توتن له عەمبارەکانی دەوڵەتیدا کۆ ببۆوە و دەوڵەت نەیدەکڕی. له ڕاستیدا جۆرە ئابلوقەیەکی ئابووری خستبوە سەر کوردستان . نه خوێندەواری دانیشتوانی کوردستان خۆی له ٪٩٠ خەلک دەدا. کوردستانی ئێران بە پێچەوانه بەشەکانی تری کوردستان له باکور و باشور بە

قۆناخی بزووتنەوەی شۆڕشگێری ڕاپەڕین و سەرهەلداندا تێنەپەڕیبوو.

ب - حیزبی دێموکرات کە ڕێبەرایەتی کۆماری کوردستانی لە ئەستۆ بوو، بە پێچەوانەی کۆمەڵەی ژ.ک لە نێو کۆمەلانی خەڵک و لە سەر هەستی قوڵی نەتەوایەتی ڕیشەی دانەکوتا بوو. حیزبی دێموکرات وەک ڕووداوێکی کوتو پڕ دوای سەفەری هێندێ لە سەرۆک عەشیرەت و دەرەبەگی کورد بە سەرۆکایەتی قازی محەممەد بۆ باکۆ، لە سەر پێشنیار و تەنانەت فشاری جەعفەر باقر ئۆف سەر کۆماری ئازەربایجانی سۆڤیێت هاتبوە کایەوە. ڕێبەران و ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی لە سەرۆک عەشیرەت و دەرەبەگ و خاوەن مڵکان پێکهاتبوو. لە هەوەڵین کۆنگرەی حیزبی دێموکراتی کوردستاندا کە لە ٢٥ی ئوکتۆبری ١٩٤٥ بەسترا، ئەم کەسانەی خوارەوە بە نوێنەرایەتی حیزب و خەڵک بەشداریان کردوە:

١- ماکۆ و ئارارات : ئاغای عومەرخانی جەلالی، ئاغای شێخ حەسەن، ئاغای شێخ کی، ئاغای حەسەناغای دری، ئاغای عبدولاغای ملان، ئاغای فەخری.

٢- سۆما و برادۆست ودەشت و مەرگەوەر : ئاغای عومەرخانی شەریفی، ئاغای تاهیرخانی سمکۆ، ئاغای عەباساغاێ فنک، ئاغای قۆیتاساغای مەمەدی، ئاغای حاجی وەتمان، ئاغای شێرۆ، ئاغای عەبدی، ئاغای حەسەن تێلۆ، ئاغای عەزۆ، ئاغای حەسەن هەنارە، جەنابی ئاغای سەید عبدولا ئەفەندی.

٣- شنۆ:ئاغای موساخانی زەرزا،ئاغای قەرەنیاغای زەرزا،ئاغای میرزاسەعید،ئاغای قازی خضری،ئاغای کاک هەمزە.

٤- سندوس: ئاغای ئەحمەدی کاخدری، ئاغای قاسماغای پیرۆتی، ئاغای محەمەد ئەميناغای پیرۆتی.

٥- لاجان: ئاغای عبدولاغای قادری، ئاغای کاک مامەندی قادری، ئاغای کاک حوسێنی محەممەدی، ئاغای پیرۆتاغای ئەمیر عەشایری، ئاغای محەمەد ئەميناغای پیرۆتی،.

٦- پیران: ئاغای محەمەدئەميناغا، ئاغای قەرەنیاغا.

٧- میاندواو: ئاغای محەممەد حوسێنخانی سەیفی قازی.

٨- بۆكان: ئاغای عبدالرحمانی شەرەفکەندی، ئاغای رەشیدی عەلیزادە

٩- مەنگوڕ: ئاغای برایماغای ئەدهەم، ئاغای مام حەسە، ئاغای کاک سولەیمان، ئاغای کاک هەمزە، ئاغای میناغا.» (١٧)

زۆربەی ئەم نوێنەرانەی هەوەڵین کۆنگرەی حیزبی دێموکرات و دەرەبەگەکانی ئەندامی کۆمەڵەی ژ. ک دوای پێکهاتنی کۆماری کوردستان پشتیان دە حکوومەتی میللی کوردستان کرد و تەنانەت ڕێگای خەیانەتیشیان گرتە بەر.

**ج - پێکهاتی(تەرکیبی) ڕێبەرایەتی و هێندێ ناتەبایی نێو سەرکردایەتی کۆماری کوردستان:**

«.... ئەوانەی لە ڕێبەرایەتی حیزبی دێموکراتی کوردستاندا بوون بە گشتی نە تاقیکردنەوەی تێکۆشانی سیاسیان هەبوونە تاقیکردنەوەی ڕێکخستنی تەشکیلاتی و نە فێری هەڵسوڕاندنی کار و باری دەوڵەتی ببوون. بەمجۆرە جوڵانەوە لە یەکێک لەپاشکەوتووترین ناوچەکانی ئێران، واتە کوردستان پەیدا ببوو کە لەگەڵ دەوڵەتی مەرکەزی بەربەرەکانی دەکرد.... بۆیە جوڵانەوەی ساڵەکانی ١٣٢٤-٤٥ هەر لە سەرەتاوە ئیمکانی سەر کەوتنی کەمبوو. کە وابوو یەکێک لە هۆیەکانی هەرە گرنگی تێکچوونی کۆماری کوردستان و سەر نەکەوتنی (ئەگەر نەگوترێ هۆی هەرە گرنگ،) کزی نێو خۆی جوڵانەوە و لاوازی نێو خۆی حیزبی دێموکراتی کوردستان بوو کە لە زەعفی نێو خۆی کۆماری کوردستانیشدا بەدی دەکرد..... پەرە ئەستاندنی زۆر خێرای جوڵانەوە و پێکهاتنی زۆر خێرای کۆماری کوردستان تەرکیبی نا لەباری لە بەڕێوەبەرایەتی حیزب و کۆماری کوردستاندا پێکهێنابوو. زۆربەی زۆری بەڕێوە بەران بۆ یەکەم جار بوو کاری سیاسی و تەشکیلاتیان دەکرد. تاقیکردنەوەیان نەبوو. هەر بە گشتی تاقیکردنەوەی سیاسی و تێکۆشانی حیزبی کە کوردستانی ئێران بێجگە لە سێ ساڵ تێکۆشانی کۆمەڵەی ژ.ک رابردووی نەبوو. ناچار بە ڕێوە بەرانی ئەوتۆ هاتبوونە سەر کار کە پایەی تێگەیشتن و تاقیکردنەوەی سیاسی و حیزبی یادەوڵەتیان لە ڕادەی ئەو مەسئولیەتەدا نە بوو کە کەوتبوە سەر شانیان...» (١٨)

## د - کورتی تەمەن و بەر تەنگی پانتای خاکی بەر دەستی کۆمار :

وەک دەزانین تەمەنی دەسەڵاتی کۆماری کوردستان تەنیا ١١ مانگ بوو. سەقامگرتوویی و دامەزراندنی دام و دەزگای دەوڵەتی مۆدێرن، ئەویش لە کۆمەڵگایەکی دواکەوتو ولە بار و دۆخێکی ئاڵۆزی وەک ئەو سای کوردستان لە ماوەیەکی واکورت دا رەنگە زۆر هاسان نەبێ. هەر چەندە لەو ماوە کورتەشدا کۆماری کۆردستان لە بواری بوژاندنەوەی زمان وکولتور و گیروگرفتی کۆمەلایەتی و ئابووری هەنگاوی بەکەلکی هاویشتوون، بەلام ١١مانگ بۆ راپەراندنی هەموو کار و بارێکی پێویست زۆر کەم و بێ دەرەتانە.

بەرتەنگی پانتایی خاکی ژێردەسەلاتی کۆماری کوردستان لە بواری نیزامی و ئابوورییەوە، زیانێکی زۆری بە سەپاندنی کۆماردا لە سەرانسەری کوردستاندا. دەکرێ بڵێین تەنیا سێ یەکی خاکی کوردستانی ئێران لە ژێر دەسەلاتی کۆمار دابوو کە ژمارەی دانیشتوانی بە حاڵ دەگەیشتە یەک میلیۆن کەس. بە تایبەت بەشی دەوڵەمەندی خاکی کوردستان و ناوچەی نەوتی کرماشان لە ژێر دەسەلاتی لەشکری ئینگلیز دابوو کە دام و دەزگای حکوومەتی ناوەندی تاران لەو مەڵبەندە دەستی لێ نەدرا بوو. هەموو بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی ونازادیخوازی سەر کوت دەکرا. ئەو مەڵبەندانە ببوونە مەکۆی لەشکری ئێران و سەرۆک عەشیرەتە کوردەکانی دژ بە کۆماری کوردستان.

## هـ- ناتەبایی کاراکتەر وچۆنیەتی دەزگای رێبەرایەتی کۆماری کوردستان :

وەک دەزانین هەوەڵین کۆنگرەی حیزب لە سەرۆک عەشیرەت و دەرەبەگ و خاوەن مڵکان پێکهاتبوو. بەلام هیچ یەک لە بەشداربوانی کۆنگرە، وەک نوێنەرانی حیزب و خەڵک، لە دام و دەزگای راپەراندنی کۆماری کوردستان، واتە حکوومەتی میللی کۆردستاندا بەشدار نەبوون. تەواوی وەزیر و کاربەدەستانی حکوومەتی میللی، بێجگە لە دووئاغاکانی ئیلخانیزادە، هەموویان سابلاخی بوون کار وباری حکوومەتیان گرتبوە دەست. بێگومان ئەمە نەیدەتوانی هەستی نوێنەرانی هەوەڵین کۆنگرەی حیزب و خەڵکی دیکەی ناوچەکانیش بریندار نەکات.

لایەکی دیکەی ناتەبایی لە کارەکانی دەزگای حکوومەتیدا خۆی دەنواند. ئەگەر سەرۆک عەشیرەت و دەرەبەگ و خاوەن ملک لە دام و دەزگای حکوومەتی دوور خرابوونەوە، لە کاتی ئامادە بوونی هێزی بەرگری و ناردنی بۆ جەبهەی بەرەنگاری هەموو چەک و قۆرخانە و پارە و کەل و پەلی پێویستی جەبهە دەدرا بەو دەرەبەگ و خاوەن ملکانە کە لە حکوومەت دا هیچیان بە دەست نەبوو. ئەوانیش تەنیا خزم و کەس و کار و نۆکەر و دەست و پێوەندی خۆیان دەبردە جەبهە و هەر کاتێکیش ویستبایان جەبهەیان بە جێ دەهێشت و دەگەڕانەوە. هەر وەک دەرکەوت زۆر لەو دەرەبەگانە بە بێ ئیجازەی حکوومەتی میللی جەبهەی سەقزیان بەجێهێشت و نەک هەر ئەوە بەڵکوو هێندێکیان دوای پێوەندیی گرتن لە گەڵ حکوومەتی تاران دژی کۆماری کوردستانی جەبهەشیان گرت. هەر وەک پێشەوا لە وتارێکی خۆیدا، ١٣٢٥/٥/٤ ئاماژە بۆ کردەوەی ناحەزی ئەو ئاغایانە دەکات. ( ١٩)

**دووەم - پێوە لکان، یا پێوە لکاندنی بزووتنەوەی کوردستان بە ئازەربایجانەوە:**

پێکهاتنی حیزبی دێموکراتی کوردستان لە ژێر فشاری جەعفەر باغر ئۆف لە گوێن فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان و لادان لە بەرنامە و ئامانجی کۆمەڵەی ژ.ک، بار و دۆخێکی وەهای پێکهێنا بوو کە بزووتنەوەی کوردستان ببەسترێتەوە بە ئازەربایجان. هەر چەندە بزووتنەوەی کوردستان بە پێچەوانەی بەرنامەی نووسراوی خودموختاری حیزبی دێموکرات و بە پێچەوانەی ویست و بۆچوونی ڕێبەرانی فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجانیش بە کردەوە ئەم بەند و داوەی پساند و لە دووی ڕێبەندانی ١٩٤٦دا، کۆماری سەر بەخۆی کوردستانی ڕاگەیاند، ئاڵای دەوڵەتی کوردی هەڵکرد ودەوڵەت و ئەرتەشی میللی و دام و دەزگای دەسەڵاتی نەتەوەیی خۆی دامەزراند، لە بواری سیاسەتی نێو نەتەوەیی و لە ڕوانگەی سیاسەت و بیر ورای دەرەوە بەسترابۆوە بە ئازەربایجان. لە بڵاو کردنەوەی ئاژانسی هەندەراندا ناوی کوردستان بە دەگمەن باسدەکرا و زیاتر هەر مەسەلەی ئازەربایجان لە گۆڕێدا بوو. تەنانەت لە وتو وێژ لە گەڵ حکوومەتی تارانیشدا ئازەربایجان خۆی بە دەراستی کوردستان دەزانی.

له وتو وێژی دەستەی نوێنەرایەتی فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان لە گەڵ دەوڵەتی قوام السلطنە هەر چەند حەمە حوسێنخانی وەزیری بەرگری کۆماری کوردستانیش بەشدار بوو، بەڵام وتو وێژەکان هەر بە ناوی ئازەربایجانەوە بەڕێوە دەچوون. لە ڕاگەیاندنی دەوڵەتی قوام دا، سەبارەت بە ئازەربایجان، یەک وشە باسی بزووتنەوەی کوردستان و مەسەلەی کوردی تێدا نیە. لە پێشنیاری دەستەی نوێنەرایەتی ئازەربایجانیشدا بۆ دەوڵەتی ناوەندی ئە گەر وشەی کوردستان هاتبێ، بە (کوردستانی ئازەربایجان) ناو براوە. لە مادە ٢ی ئەم پێشنیارەدا گوتراوە:« ئازەربایجان ئوستانەکانی ٣ و ٤ وولاتی خەمسە دەگرێتەوە» دیارە بە گوێرەی دابەشبوونی جوغرافیایی حکوومەتی ئێران ئوستانی ٤ کە ناوەندەکەی ورمێیە، ئەم بەشەی کوردستانی دەگرتەوە کە لە ژێر دەسەڵاتی کۆماری کوردستاندا بوو. لە مادەی ١٠دا گوتراوە : «... لە ئیدارە دەوڵەتیەکانی ئازەربایجان و هەیئەتە میللیەکان، نووسراوە بە زمانی ئازەربایجان و لە (کوردستانی ئازەربایجان) بە زمانی کوردی دەبن...» لە مادەی ١١دا گوتراوە:«..خوێندن لە قوتابخانە سەرەتاییەکانی ئازەربایجان بە زمانی ئازەربایجانی و لە ( کوردستانی ئازەربایجان» بە زمانی کوردی دەبن.»

لە مادەی ١٢دا گوتراوە:«... مادەکانی ئەم قەرارداده ( کوردستانی ئازەربایجانیش) دەگرێتەوە. لە مادەی ١٤دا گوتراوە:«..بە گوێرەی مادەی ١٥ی ئەم موافەقەتنامەیە ئەو کەمایەتیانەی لە ئازەربایجان دادەنیشن وەک : کوردەکان، ئەرمەنیەکا، ئاسۆریەکان، لە قوتابخانەی سەرەتایی تا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بە زمانی دایکیان دەخوێنن...» (٢٠)

ئەمە پێشنیاری فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان بوو کە بە خێرا خۆی ناوی ( کوردستانی ئازەربایجانی) بەسەر زماندا هاتوە، ئەگینا لە دەقی ڕێککەوتنامەیەکا کە لەلایەن هەیئەتی دەوڵەت وئەنجومەنی ئەیالەتی ئازەربایجان (واتە حکوومەتی میللی ئازەربایجان)دا پەسند کراوە و لە لایەن مظفر فیروز یاریدەری سیاسی سەرەک وەزیر و پێشەوەری سەرۆکی فیرقەی دێموکراتی

ئازەربایجــانەوە لە تاریخی ٢٣ی خــردادی ١٣٢٥ واژۆ کــراوە، یەک وشـــەی کوردستانی تێدا نەهاتوە و تەنیا لە مادەی ١٣دا گوتراوە:« دەوڵەت موافەقەت دەکا کە کوردەکانی دانیشتووی ئازەربایجان لەمزایای ئەم موافەقەتنامەیە کەلک وەر بگرن و بە گوێرەی مادەی ٣ی ڕاگەیاندنی دەوڵەت تا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بە زمانی خۆیان دەرس بخوێنن.»

وەک دەبینین تەنیامەسەلەی ئازەربایجان لە گۆڕێدایە و حکوومەتی تارانیش دەگەڵ بزووتنەوەی ئازەربایجان وتو وێژ دەکا. هیچ وتو وێژێکی ڕەسمی و ئاشکرا لە گەڵ حیزبی دیموکرات و حکوومەتی میللی کوردستان نەکراوە. دیدار و وتو وێژی نوێنەرانی کۆماری کوردستان و شەخسی پێشەوا قازی محەممەدیش لە گەڵ ئەفسەرانی ئێران لە سەقز، بێجگە لە هاتنە خواری پایە و پرستیژی بزووتنەوەی کورد و کۆماری کوردستان هیچ بەهرە وبەرهەمێکی نەبووە.

ساوە ساوی هێزی بەرگری کوردستانیش بۆ ئازاد کردنی ناوچەکانی تر، دەکرێ بە یەکێترلە هۆیەکانی تێکچوونی کۆماری کوردستان دابنرێن. لەکاتێکا دوژمن لاوازە وبە ڕاستی دەرەتانی ئازادکردنی بەشێکی زۆری دیکەی کوردستان هاتبوە پێش، ڕێبەرانی کۆماری کوردستان نەک هەر لەو دەرفەتە کەلک وەر ناگرن، بەڵکوو ڕێگاش بۆ نەرتەشی لاوازی ئێران دەکەنەوە کە بەرەو بانە و سەردەشت دە جمو جۆڵ دابن.

سێیەم - **گەمەی دەوڵەتانی ئینگلیز و ئەمریکا و سۆڤێت بە چارە نووسی کورد**:

ئەم دیاردە نا لەبارە و ئەم بەسترانەوەی مەسەلەی کوردستان بە ئازەربایجانەوە، لە هەڵوێست و سیاسەتی دەوڵەتانی ئینگلیز و ئەمریکاشدا ڕەنگیان داوەتەوە، بەتایبەت کە بزووتنەوەی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان لە ڕوانگەی ئەوانەوە بە دەستکردی سۆڤیەت و بە ڕێژیمێکی کۆمونیستی دەناسرا. هەر چەندە پێشەوا قازی محەممەد بەرلەڕاگەیاندنی کۆماری کوردستان هەوڵی داوە لە گەڵ نوێنەرانی بەریتانیا و ئەمریکا پێوەندی بگرێ. بۆ ئەم مەبەستەش «.. عبدالرحمانی زەبیحی و عەلی ریحانی ناردۆتە تەورێز و لە گەڵ کونسولی بەریتانیا وتو وێژیان کردوە. لە

ڕوانگەی نوێنەرانی قازی محەممەدەوە وەڵامی کۆنسولی بەریتانیا ناڕوون وجێگای هیوا و هومێد نەبوە...»(٢١)

پێشەوا قازی محەممەد لە دیدار لە گەڵ ئەتاشەی نیزامی باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە تاران کاتی سەر دانی لە مەهاباد ڕایگەیاند:«.. کوردەکانی ئێران بە واتای واقیعی وشەی دێموکرات دەیانەوێ لە ژێر چاوەدێری ڕژێمێکی فیدراڵ دا بەڕێوە بچن هەر وەک لە وڵاتە یەککگرتوەکانی ئەمریکادا هەیە. ئەگەر حکوومەتی ئەمریکا ناتوانێ لە ئاواتی خەڵکی کورد پشتیوانی بکا، لانی کەم دوژمنایەتیمان نەکات...» (٢٢)

دەوڵەتانی ئینگلیز و ئەمریکا دەیانزانی بزووتنەوەی کوردستانی ئێران، بزووتنەوەیەکی ڕەسەنی نەتەوایەتیە ولە جەوهەر و ناوەرۆکدا لە ڕێبازی فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان دوورە. نوێنەرانی دەوڵەتانی ڕۆژئاوا و زۆر لە نووسەرانی بێگانەش ئەم ڕاستیەیان دەربڕیوە.«..... کوردستان پێشینەی سەد ساڵ خەباتی بۆ ئازادی نەتەوەیی هەیە. ئەوە تەنیا لە ئێراندا نیە، بەڵکوو لە عیراق و تورکیاش هەیە. کوردەکانی دابەشکراو لەم ٣ وڵاتە لە گەڵ یەکیتی نەتەوەیی نێوان خۆیان هۆگریان هەیە و دەیانەوێ کوردستانێکی یەککگرتوویان هەبێ. ئێستا ئەگەر هەر وڵاتێک لە سەر زەمینی خۆی ئازادی بدا بە کوردان، ئەوان کوردەکانی دیکە بانگ دەکەن کە وەرن لە گەڵ ئێمە بن. ئەمە سروشتیە. لە کوردستان حیزبی دێموکرات ڕابردوێکی درێژی هەیە. ئەم جەرەیانە لە سەر دەمی مەشروتەشدا هەبوە. پاشان ڕێبەرانی بە نفوزی وەک قازی محەممەد و نیزیکانی پەیدا بوون...» (٢٣)

بەڵام ئەوان بەرژەوەندی ئابووری و مەزنیخوازی خۆیان لە ئێراندا لە شکانی سیاسەتی یەکیتی سۆڤیەتی ولە پاراستنی ڕژێمی دیکتاتۆر و گوێ لەمستی پاشایەتی ئێران و لە سەر کوتکردن و لە بەینچوونی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد دا دەبینی.

پێشەوا قازی محەممەد داوای کردبوو کە نوێنەرانی دەوڵەتە مەزنەکانی ڕۆژئاوا، بە تایبەت ئەمریکا و ئینگلیز بێنە کوردستان و لە نیزیکەوە لە گەڵ بار و

دۆخی کوردستان شارەزا بن. بەڵام وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە تێلگرافێکدا بۆ سەر کونسولی ئەمریکا لە تەورێز، لەگەڵ چوونی نوێنەری ئەمریکا بۆ کوردستان موافەقەت ناکا.

ه- تێلگرافی قائم مقامی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا بۆ بەڕێز سەرکونسولی ئەمریکا لە تەورێز:

دەقی: ١٤- گەڕانەوە بۆ تێلگرافی ژمارە ١٢٧ تاریخی ٢٧ی ئەپریل، پێم وایە چوونی ئێوە بارۆسۆ بۆ مەهاباد لە هەلومەرجی ئێستادا وەک میوانی قازی محەمەد کارێکی تەواو نەبێ، چونکە قازی محەمەد هێشتا پێشەوای بزووتنەوەیەکی سەربەخۆ خوازانەیە دژی حکومەتی ناوەندی ئێران. جگە لەوە چاوپێکەوتنێکی ناوا لەوانەیە لە سەرانسەری ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست بە تایبەت لە عێراق، وەک نیشانەی هاوبیری ئەمریکا لە گەڵ ویستی ڕووسەکانی سەبارەت بە پێکهێنانی کوردستانی سەربەخۆ لێک بدرێتەوە وتەفسیر بکرێت. واشنگتون-٢٩ی ئەپریل ١٩٤٦، ناردراو بۆ تەورێز (کونسولگەری ئەمریکا) تکراری بۆ تاران (باڵیۆزخانەی ئەمریکا) ئاچسن.(٢٤)

هێندێ لە نووسەرانی کورد، بە پێڕەوی لە نووسین و بۆچوونی نووسەرانی ڕۆژئاوا، لە لێکدانەوەی ڕووداوەکانی کوردستانی ئێران و تێکچوونی کۆماری کوردستان ١٩٤٢-١٩٤٦دا، هەر گەمەی سۆڤیێت دەبینن و دڵیان نایە باسی گەمەی زلهێزەکانی ئینگلیز و ئەمریکا بکەن کە دەوری سەرەکیان هەبوە لە تێکدانی کۆماری کوردستان و ڕاستەوخۆ یارمەتیان بە ئەرتەشی دژی گەلیی شای ئێران کرد بۆ سەرکوتکردنی بزووتنەوەی نیشتمانی کوردستان.

ئەوەی پێوەندی بە گەمەی یەکێتی سۆڤیێتی پێشووە هەبێ، گومانی تێدا نیە سیاسەتی سۆڤیێت لە کوردستان و ئازەربایجان تووشی هەڵە وشکانێکی سەرشۆڕانە بوو. سەبارەت بە پێوەندی لە گەڵ کوردستان، ئەوەی ڕاستی بێ ئەو بەڵێن و وادەی یارمەتیەی بە کوردستان درا بوو، بە جێی نەگەیاند و هیچ چەک و کەرستە و یارمەتیەکی مادی ئەوتۆ نەدرا بە کوردستان کە بتوانێ لە ڕۆژی خۆیدا

بەرگری لە پەلاماری ئەرتەشی ئێران بکا و بزووتنەوەی پێ بپارێزێ. لە بواری سیاسیەوە سەبارەت بە مەسەلەی کوردستان و ئازەربایجان نەوتی شیمالیان پێ گرنگتر بوو لە ئازادی نەتەوەیەکی ژێر دەستی وەک کورد کە قەوام السلطنە بەڵێنی دانی نەوتی شیمالی پێدابوون. «... قوام لە سەفەری خۆیدا بۆ موسکۆ بەڕێوە بەرانی یەکێتی سۆڤێتی قانیع کرد کە گیر و گرفتی ئازەربایجان بە مەسەلەیەکی نێو خۆی ئێران دادەنێن و دەخالەتی تێدا نەکەن. زۆر سەیر بوو کە قەوام ئەو داوایەی لە ئەمریکا و ئینگلیس نە دەکرد. بۆ نموونە« جۆرج ئالن» باڵیۆزی ئەمریکا لە گەڵ ڕەزمارا بۆ بەڕێوە بردنی شەڕی دژی بارزانیەکان هاتبوە کوردستان. باڵیۆز خانەی ئەمریکا لە گەڵ زۆر کەس لە سەرۆک عەشیرەتەکان پێوەندی نیزیکی دامەزراند بوو...» (٢٥)

لە بواری نیزامیەوە، سەبارەت بە بار و دۆخی پێکهاتووی دوای شەڕی دنیاگر و شبرزەیی نێو خۆی سۆڤێت، نەک هەر نەیتوانی لە بەرانبەر هەڕەشەی دەوڵەتانی ئینگلیز و ئەمریکادا بەرگری لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان و ئازەربایجان بکا، بەڵکوو ڕێگای نەدا کە کۆماری کوردستان خۆشی لە کاتی خۆیدا پەلاماری ئەرتەشی ئێران بدا و بەشێکی زیاتر لە کوردستان لە ژێر دەسەڵاتی ئەرتەشی ئێران ئازاد بکا. کاتێکی هێزی بەرگری کوردستان دوای تێک شکانی شەڕی مامەشا لە جەبهەی سەقز، خۆی بۆ پەلاماری ئەرتەشی ئێران و ئازادی سەقز ئامادە دەکرد، ڕۆژی ٢١ی یولی ١٩٤٦ هاشمۆف کونسولی سۆڤێت لە ورمێ خۆ دەگەیێنێتە پێشەوا و پێی ڕادەگەیێنێ کە هێزی کوردستان نابێ لەشکری ئێران پەلامار بدا، چونکە گویا شەڕی نێو نەتەوەیی لێ ساز دەبێ. یەکێتی سۆڤێتی پێی باش نیە و ناشتوانێ هیچ یارمەتیەکی نیزامی بە کۆماری کوردستان بکا. پاش ئەم پێراگەیاندنیە کە پێشەوا لە وەڵامی نامەی حەمە ڕەشیدخاندا ئاماژە بۆ بار و دۆخی نێو نەتەوەیی دەکا و دەنووسێ: ...« ئەمە مەجبوورین لە ڕێگای ئاشتیەوە تا مومکین بێ ناتوانین بە ڕێی دیکەدا بڕۆین...» (٢٦)

دوکتور عبدالرحمن قاسملو لەم بارەوە بۆچوونێکی دیکەی هەیە و دەنووسێ:

:«....پاش تێکچوونی کۆماری کوردستان ئەو بیر و باوەڕە لە مێژووی حیزبی ئێمەدا بە هێز بوو کە هۆی ئەسڵی تێک شکانی ئەم کۆمارە سیاسەتی چەوتی یەکیەتی سۆڤیەتی بەرانبەری ڕەزعی ئێران بوو. گویا یەکیەتی سۆڤیەتی خەڵکی کوردستانی هاندا بۆ ئەوە کە کۆماری کوردستان دابمەزرێنێ. لە پاشان بە تاقی تەنیای بە جێهێشت و ڕێژیمی کۆنە پەرستی ئێران توانی بە هاسانی لە نێوی بەرێ. ئەنجامی ئەو لێکدانەوەیە زۆر ڕوونە، ئەوە خۆ ئاسودە کردن و خۆ ماندوو نەکردنە. تاوانبار کردنی خەڵکی دیکە هەموو وەختێک لە ڕەخنە لە خۆ گرتن خۆشترە. بێجگە لەوە ئەگەر لێکدانەوەمان بەو شێوەیە بێ، ئیعترافمان کردوە کە کۆماری کوردستان دەستکردی بێگانە بوە و ئەوەش ڕاستەو ڕەوان ئەو بیر و ڕایەیە کە دوژمن لە سەرەتای پێکهاتنی ئەم کۆمارەوە تا ئێستا بڵاوی دەکاتەوە. بیر و ڕایێکە لە گەڵ واقعیەت ڕێک ناکەوێ و هەوڵی ئەوەیە کە ڕاستە قینەی مێژوو بگۆڕێ. هێزی ئەسڵی جولانەوەی ساڵەکانی ١٣٢٤:٢٥ گەلی کورد بوە و هۆی ئەسڵی پێکهاتنی کۆماری کوردستانیش دیسان هەر ئەوە بوە کە گەلی کورد ویستوویەتی بە مافی ڕەوای خۆی بگا و چارە نووسی خۆی بە دەستەوە بگرێ. ئەو دەم دیارە هۆی ئەسڵی تێکچوونی کۆماری کوردستانیش هەر دەگەڕێتەوە سەر خودی کۆمەڵی کوردەواری. واتە هۆی ئەساسی تێکچوونی کۆماری کوردستان کزی نێو جولانەوە، کزی نێو خۆی حیزب و لە پێش هەمواندا زەعفی بە ڕێوە بەری حیزبی دێموکراتی کوردستان بوە. ئەو کزی و لاوازیە لە هەموو بارەکانی ژیان و تێکۆشانی حیزب و کۆماری کوردستاندا خۆی دەنواند...» (٢٧)

لە پێکهاتن و تێکچوونی هەر دیاردە و ڕووداوێکدا هۆیەکانی خۆجێیی و دەرەکی دەور دەبینن و کاری خۆیان دەکەن. کارکردی هیچ کامیشیان لە سەر ڕووداوەکان ڕەها و موتڵەق نیە. تەئسیری هەر یەک لەم هۆیانە دەتوانێ بە گوێرەی بار و دۆخی کات و زەمان کار بکاتە سەر ڕووداوەکان و دەوری گرنگتر یاری بکات. ئەگەر لە پەرە گرتنی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە کوردستانی ئێران و لە پێکهاتنی کۆماری کوردستان، هەستی نەتەوایەتی وناواتی گەلی کورد بۆ

وەدەستهێنانی ماف و دەسەڵاتی نەتەوەیی و ڕزگاریی لە زوڵم و زۆرداری دەورانی دیکتاتۆری پاشایەتی ڕەزاخان هۆی سەرەکی بوون، بە بۆچوونی من لە تێکچوونی کۆماری کوردستان وگەڕانەوەی ئەرتەش و دەسەڵاتی حکوومەتی تاران دا، بار و دۆخی نێو نەتەوەیی و دژایەتی دەوڵەتانی ئینگلیز و ئەمریکا لە گەڵ بزووتنەوەی ئازەربایجان و کوردستان، سیاسەتی چەوت و بێ قەول و قەراری ویارمەتی نەکردنی دەوڵەتی شورەوی بە کۆماری کوردستان، دەبنە هۆی سەرەکی و هۆیەکانی خۆجێیی توانای بەربەرەکانی و خۆ ڕاگریان نامێنێ.

«..... بەڵگەو دوکۆمێنتەکان ئەم بۆچوونە پشت ئەستور دەکەن کە دوای کۆتایی شەڕی دووەمی دنیاگر، دوو هۆکار و دوو عنصری سەرەکی و دیاریکەر لە مەڕ مەسەلەی ئێران وقەیرانی نەچوونە دەری سۆڤیت لە ئێران دەوریان هەبوە، ئەوانەش دەوڵەتانی ئەمریکا و سۆڤیت بوون. ئەوەشی لێ زیاد دەکەین کە هیچ یەک لە عنصرەکانی خۆجێیی، واتە شا و سەرەک وەزیر وئەرتەش وکاربەدەستانی سیاسی وڵات لە چوونە دەری ئەرتەشی سۆڤیت و مەسەلەی ئازەربایجاندا دەورێکی گرنگیان نەبوە» (٢٨)

دەوڵەتانی ئینگلیز و ئەمریکا بە گوێرەی بۆچوون و بەرژەوەندی خۆیان لە چەند لایێکەوە دژایەتی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردیان دەکرد و بۆ لە بەینبردنی ڕێگای جۆر بە جۆریان بە کار دەهێنا.

یەکەم : بێجگە لەوەی کە لەپێشدا باسکرا، بزووتنەوەی کورد و پێکهاتنی کۆماری کوردستانیان لە ناوچەیەکی گرنگی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بە زیانی شەریکە نەوتیەکانی ئینگلیز و ئەمریکا دەزانی. ترسی ئەوەیان هەبوو کە سەقامگرتوویی کۆماری کوردستان کار بکاتە سەر وەزعی کوردستانی عیراقیش کە نەوتی کەرکوکی تێدا هەڵکەوتبوو. ئەم ترسە بۆ ئەوان تورکیاشی دەگرتەوە کە بەشی زۆری خەڵکی کورد لەوێدا دەژیا. بەو ئیعتیبارە کە بزووتنەوەشیان سەر بە سۆڤیت دەزانی، ئەم مەترسیە بۆ ئەوان زیاتر دەبوو. بە تایبەت ئینگلیزەکان بڵاویان دەکردەوە کە کوردەکان دەیانەوێ بە یارمەتی هێزەکانی سۆڤیت کە لە

باکوری کوردستان نیشته جێن، ناوچەی موسل بگرن. کارداری باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە مۆسکۆ سەبارەت بە بڵاو بوونەوەی دەنگو باسێکی ئەوتۆ لە تێلگرافێکدا بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دەنووسێ :

تلگرام ١٧٤٦-٣ . ٢٤٥١ . ٨٦١ - تێلگرافی کنان کارداری باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە شورەوی بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا. مۆسکۆ - ١٧ی مارس-١٩٤٦.. نهێنی فەوری:

«... ٨٤٣- هەست دەکەم کە کاتی لەباری ئەوە هاتبێ کە ئاڵۆزی تێکۆشانی ئێستای شورەوی لە ئێران وەک لە مۆسکۆ دەبینرێ، وەبیر بهێنرێتەوە. بەر لە هەموو شت لام وایە ئەنجامەکە وای لێهاتوە کە شورەوی دەبێ تێکۆشانێکی خێرا لە داهاتوودا بە کار بێنێ کە دەوڵەتێک لە ئێراندا بێنێتە سەر کار کە زۆربەی ویستەکانی ئەوان ئەنجام بدات. بە تایبەت سەبارەت بەپاراستنی دائیمی لەشکری رووسیا لە ئێران و دانی ئیمتیازی نەوت بە وان. ئەم تێکۆشانە بە هۆی ئێرانیەکانی سەر بەوانەوە پێک دێت بە بێ بەرپرسیی راستەو خۆی شورەویەکان. هێزی چەکداری شورەوی لە ئێران ئەم نەخشەیە بە هەرەشە وترساندن و ئەگەر پێویستیش بکا بە دەخالەتی چەکدارانە بە رێوە دەبات........

من بە دژواری دەزانم دەوڵەتی شورەوی بتوانێ نەخشەی پەلامار دانی تورکیا لەم قۆناخەدا پیادە بکا. ئەوەی دەتوانم بیری لێ بکەمەوە هیچ تێکۆشانێک یا بیانوو گرتنێک لەم بارەوە بەکارنایە. دیارە ئەوە بەو مانایە نیە کە لە بەین بردنی هێزی تورکیا و وەدەستهێنانی پێگەکان لە لەنگەرگاکان و پێکهێنانی رێژیمێکی« دۆستانە»لە ئانکارا ئامانجی سیاسەتی شورەوی نیە. هەر وەها بەومانایەش نیە کە کوردە چەکدارەکانی بە هۆی رووسیاوە، لە تورکیا ئاژاوە و کێشە ساز ناکەن کە ئەو کارە لە دوایەدا ببێتە بیانوو بۆ دەست تێوەردانی شورەوی. بەڵام لێرە بەڵگەی ئاوا بە دەستەوە نین کە نیشانی بدەن ئاڵو گۆڕی ئێستای شورەوی لە ناوچەی باکوری ئێران ڕووی لە پەلاماردانی تورکیا بێ لە لایەن شورەوییەوە. لێرە دیتنێک دێتە بەر چاو کە دەریدەخات کوردەکانی ئیلهام وەرگرتوو لە شورەوی و

چەکدار بە چەکی شورەوی تێدەکۆشن بە پشتیوانی هێزەکانی شورەوی مەڵبەندی موسڵ بگرنە ژێر دەست و ئەم هێزە ئامادەیە کە لە کاتی پێویست دا و لە سەر داوای کوردەکان بە ئاشکرا دەست بە کار بێت. دەبێ بڵێین کە لێرەدا تەبلیغاتێکی هەراو بۆ پێکهێنانی تەنگ و چەڵەمە بۆ ئینگلیزەکان لە گۆڕێدایە. لەوانەیە لە بەشی موسڵ ئەم تێکۆشانە ژانە سەر بۆ ئینگلیزەکان ساز بکات کە لەبواری روحییەوە ئامادە بوونیان گرنگە. بەڵام ئێمە لێرەدا لامان وانیە دەوڵەتی شورەوی بخوازێ بیگەیێنێتە خەباتی ئاشکرا لە گەڵ لەندەن...... بەم پێیە بۆ من روونە کە لە بارەی ئامادەیی شورەوی و هەر هەنگاوێکی ئەوان لەم ناوچەیەدا، رووسەکان ناچارن رەنگێکی ناوچەیی پێبدەن، یانی نەیگەیێننە بار و دۆخێک کە دەوڵەتی رووس یا ئینگلیز وایان لێ بێت کە پرستیژی نەتەوەی رێگای پاشە کشەیان نەدات....» - لە ژێر ژمارە ٨٢٤ بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا- ٦٧ تکراری تاران، باڵیۆز خانەی ئەمریکا و ١٤٠ لەندەن، باڵیۆزخانەی ئەمریکا. کتان

دووەم : لەوە دەترسان کە سەر کەوتنی بزووتنەوەی کوردستان و ئازەربایجان کار بکاتە سەر پەرە گرتنی رەوەندی دیموکراسی لە ئێران و بە هێزبوونی هێزە ئازادیخوازەکانی سەرانسەری ئێران. بە تایبەت کە بەرەیەکی یەکگرتولە پێنج حیزبی ئازادیخوازی ئێران پێکهاتبوو. نوێنەرانی حیزبی تودە لە دەوڵەتی قەوام دا بەشدار کرا بوون. ئینگلیز و ئەمریکا بۆ لەبەینبردنی ئەم جەرەیانە لە دوو لاوە کەوتبوونە کار. دەوڵەتی ئەمریکا قەوامی هاندا لە رێگای دیپلۆماسییەوە بۆ بێلایەنکردنی یەکێتی سۆڤیتی لە مەسەلەی کوردستان و ئازەربایجان بە دانی بەڵێنی نەوتی شیمال بە رووسەکان بکەوێتە کار. قەوام السلطنە ی ناسراو بە رێوی کۆنە کار بە راستی دەوری خۆی بە جوانی یاریکرد.«..... قەوام بە دەستوری ئەمریکاییەکان بۆ ئەوەی حیزبی تودەی ئێران و سۆڤیتیەکان فریو بدا، حیزبی دیموکراتی ئێرانی دامەزراند و کەوڵێکی دیموکراتیکی ساختەی کردە بەر ونۆکەر و بەکرێگیراوانی ئەمریکای تێدا کۆ کردەوە. قوام چوە موسکۆ وقەراردادێکی ساختەی لە گەڵ سۆڤیت بەست کە دیار بوو پارلمانی دوایی پەسندی ناکات و

قەوامیش نامێنێ... دیارە قەوام سۆڤیێتی فریو دا و حیزبی تودەشی فریو دا.
ڕاستی ئەوەیە قەوام لە لایەن ئەمریکاییەکانەوە کرابوو بە مەئمور کە کەمێک لەگەڵ سۆڤیێتیەکان ڕێک بکەوێ. ئەوانیش زۆر بە هاسانی کڵاویان چوە سەر و فریویان خوارد...» (٢٩) ڕۆژی ١٦ی دیسامبری ١٩٤٥ کۆنفرانسی وەزیرانی دەرەوەی ئینگلیز و سۆڤیێت و ئەمریکا لە مۆسکۆ بەسترا.لەم کۆنفرانسەدا مەسەلەی ئێران و ئازەربایجان و چوونە دەری هێزەکانی سۆڤیێت لە ئێران هاتە گۆڕێ. بەڵام سۆڤیێتیەکان بە بیانووی پاراستنی ئەمنیەتی کانگا نەوتیەکانی باکۆ، دیاریکردنی کاتی چوونە دەریان لە ئێران خستە پشتێ گوێ.

وتو وێژی دەوڵەتی ئێرانیش لە گەڵ سۆڤیێتیەکان لە بارەی مەسەلەی ئازەربایجان و چوونە دەری ئەرتەشی سۆڤیێت بە ئاکام نەگەیشت. ڕۆژی شەشی ڕێبەندانی ١٣٢٤ قەوام السلطنە بوو بەسەرەک وەزیر. قەوام تیلگرافێکی بۆ ستالین نارد و داوای کرد کە خۆی بچێتە موسکۆ، و ڕاستەوخۆ لە گەڵ سەرۆکانی سۆڤیێت وتو وێژ بکات. ٢٩ی ڕێبەندانی ١٣٢٤ قەوام سەفەری خۆی بۆ موسکۆ دەست پێکرد و ١٩ ڕۆژان لەوێ مایەوە. چەند جار لە گەڵ ستالین و مۆلۆتۆف وەزیری دەرەوەی سۆڤیێت وتو وێژی کرد. بەڵام لە سەر هیچ شتێک ڕێک نەکەوتن. ڕووسەکان لە سەر وەرگرتنی ئیمتیازی نەوتی شیمال پێیان دادەگرت. مەسەلەی ئازەربایجانیشیان بە مەسەلەیەکی نێو خۆی ئێران دەزانی کە پێویستە لە نێوان دەوڵەتی ئێران وخەڵکی ئازەربایجاندا چارە سەر بکرێ. لە بارەی چوونە دەری هێزەکانی سۆڤیێت لە ئێران، مۆلۆتۆف بە ڵێنی دا کە لە دووەمی مانگی مارس چوونە دەری هێزی سۆڤیێت لە ئێران دەست پێدەکا.

لە یادداشتێکدا کە دەستەی نوێنەرایەتی ئێران دابووی بە وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیێت گوترا بوو: «... سەبارەت بە دانی ئیمتیازی نەوت بە گوێرەی قانونی پەسند کراوی پارلمان، دانی ئیمتیازی نەوت قەدەغە کراوە. لە بارەی ئازەربایجانەوە، ئوستانی ئازەربایجان بەشێکی جیانەکراوەی خاکی ئێرانە، ئەوانەی لە وێ دژی سەربەخۆیی و تەواویەتی خاکی ئێران هەنگاویان هاویشتوە،

دەبێ واز لەو کارە بێنن. ئۆردووی سوریش بە گوێرەی پەیمانی نێوان ئێران و ئینگلیز و سۆڤێت، پێویستە لە خاکی ئێران وەدەر بکەوێ. سۆڤێتیەکان لە وەڵامی یاد داشتی دەستەی نوێنەرایەتی ئێران دا، لە بارەی نەوتی شیمالەوە، دانانی شەریکەیەکی تێکەڵی سۆڤێت - ئێران-یان پێشنیار کرد. سەبارەت بە ئازەربایجان بیر و رای پێشووی خۆیان دوو پات کرابۆوە. لە بارەی چوونە دریان لە خاکی ئێران گوتبوویان: چونکە لە پاش شۆرشی ئوکتۆبرەوە پێوەندییەکانی نێوان ئێران و سۆڤێت بناخەیەکی پتەوی دۆستانەی نەبوە، سەبارەت بە نیگەرانیی لە بار ودۆخی ئێران، جارێ چوونە دەری تەواوی ئەرتەشی سوور لە ئێران ئیمکانی نیە...» (٣٠)

وەک دەبینین لە تەواوی ئەم وتو وێژانەدا، باس هەر باسی ئازەربایجانە و ناوی کوردستان و بزووتنەوەکەی لە کولەکەی تەریشدا دیار نیە .

پاش گەڕانەوەی قەوام السلطنە لە مۆسکۆ، رۆژی شەشەمی مانگی مارسی ١٩٤٦، ژۆرژ کنان، کارداری باڵیۆزی ئەمریکا لە مۆسکۆ یاد داشتێکی توندی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکای دا بە وەزارەتی دەرەوەی سۆڤێت. لە یاد داشتەکەدا گوترا بوو: «..بڕیاری دەوڵەتی سۆڤێت لە مەڕ راگرتنی ئۆردووی سور لە ئێران پاش دووەمی مانگی مارس وەزعێکی ئەوتۆی پێکهێناوە کە دەوڵەتی ئەمریکا وەک ئەندامی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان و ئیمزاکەری بەیاننامەی تاران ناتوانێ لە بەرانبەر ئەوەدا بێلایەن بمێنێ. لە کۆتایی یاد داشتەکەدا داوا کرا بوو کە هێزەکانی سۆڤێتی لە ئێران پێویستە خێرا بچنە دەرێ. دەوڵەتی ئینگلستانیش یاد داشتێکی بەم نێوەرۆکە دابوو بە دەوڵەتی سۆڤێت و مانەوەی هێزەکانی سۆڤێت لە ئێران بە پێچەوانەی پەیمانی سێ قۆڵی و بەیاننامەی تاران زانیبوو، و داوای کردبوو کە ئەرتەشی سوور بە خێرایی لە ئێران بچێتە دەر...» (٣١)

دەوڵەتی سۆڤێت وەڵامی یاد داشتەکانی ئینگلیز و ئەمریکا ناداتەوە. رۆژنامەکانی سۆڤێتی ئەم هەنگاوەی ئەمریکا بە دەست خستنە ناو کارو باری ئێران دادەنێن. پاش گەڕانەوە لە مۆسکۆ قەوام السلطنە بڕیار دەدا کە سەبارەت

به نەچوونە دەری ئۆردووی سور لە ئێران، سکالا بەرێتە بەر کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتوەکان. رووسەکان لەم بڕیارە ئاگادار دەبن. لە رێگای کارداری باڵیۆزخانەوە لە تاران بە قوام رادەگەیێنن کە ئەم کارەی دەوڵەتی ئێران بە کارێکی غەیرە دۆستانە دادەنرێ و ئاکامێکی ناڵەباری بۆ ئێران بە دواوە دەبێ.

وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاش لە گەڵ ناردنی یاد داشت بۆ دەوڵەتی سۆڤیەت، بە قەوام رادەگەیێنێ کە :« ئەگەر دەوڵەتی ئێران لە شورای ئەمنیەت شکایەت لە سۆڤیەت نەکات، دەوڵەتی ئەمریکا خۆی ئەو مەسەلەیە لە شورای ئەمنیەت دێنێتە گۆڕێ و دەوڵەتی ئێرانیش نابێ هیچ هیوایەکی بە یارمەتی ئەمریکا هەبێ...» (٣٢)

ئاخرەکەی سەرەک وەزیری ئێران بڕیاری دا کە سکالا بەرێتە بەر شورای ئەمنیەتی کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتوەکان. حوسێنی عەلا باڵیۆزی ئێران لە واشنکتۆن، هەشتی مانگی مارسی ١٩٤٦ شکایەتی دەوڵەتی ئێرانی بەم جۆرە:

«..... یەکێتی کۆمارەکانی سۆڤیەتی سۆسیالیستی بە پێچەوانەی پەیمانی سێ قۆڵی ٢٩ی ژانویەی ١٩٤٢، پاش تەواو بوونی دووەمی مارسی ١٩٤٦ هێزەکانی خۆی لە ئێراندا ڕاگرتوە. بێجگە لە وە یەکێتی سۆڤیەتی لە رێگای دەست و پێوەندییەکانی خۆی و کار بەدەستانی رەسمی هێزە چەکدارەکانییەوە دەست لە کار و باری ناو خۆی ئێران وەردەدا. »تەسلیمی سکرتێری گشتی کۆمەڵی نەتەوەیەکگرتوەکان کرد.

سێ رۆژ دوای شکایەتی دەوڵەتی ئێران، واتە رۆژی ٢١ی مارسی ١٩٤٦، ترومەن سەرکۆماری وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا پەیامێکی نهێنی بۆ ستالین دەنێرێ. لەو پەیامەدا کە بە دابی سیاسی باری ئولتیماتۆمی هەبوو، بە ستالین گوترا بوو : «..کە ئەگەر هێزەکانی یەکێتی سۆڤیەتی لە ماوەی حەوتوێکدا دەست بە چوونە دەر لە خاکی ئێران نەکەن و کاری چوونە دەریش لە ئێران لە شەش حەوتوو زیاتر درێژە بکێشێ، گەلە کەشتی ئەمریکا دێنەوە کەنداوی فارس و هێزەکانی ئەمریکاش جارێکی تر دێنەوە ئێران. بەشێک لە دەقی ئەو پەیامە کە لە نێو بەڵگەکانی دەوڵەتیدا پارێزراوە ئاوایە.

(If you don,t go, we will come in )(٣٣)

ترومەن سەر کۆماری ئەمریکا پاش شەش ساڵ لە ٢٤ی ئەپریلی ١٩٥٢ لە وتو وێژێکی چاپەمەنیدا خەبەری ناردنی پەیامی نهێنی خۆی بۆ ستالین ئاشکرا کرد و گوتی: «من لە ساڵی ١٩٤٦دا ناچار بووم ئولتیماتۆم بدەم بە سەرەک وەزیرانی یەکیەتی سۆڤیەتی و داوای لێبکەم کە بڕیارەکانی پەیمانی سێ قۆڵی لە بەر چاو بگرێت.

ترومەن لە نووسراوەیەکدا کە ١٣ی ئاوگوستی ١٩٥٧ لە نیویورک تایمزدا بڵاوی کردەوە، دەنووسێ:«....لە ئەزموونێکی لە گەڵ رووسەکانم هەبوو، فێری ئەوە ببووم کە رووسەکان لە هەر شوێنێکی ئێمە هەڵوێستێکی روونمان لە سەر نەگرتبێ، ئەوان دەبێ لەوێ ئامادە بن. بۆ نموونە،کەمێک دوای تەواو بوونی شەڕی دووەمی دنیا گر، ستالین و مولۆتۆف، بێشەرمانە لە مەڕ چوونە دەریان لە ئێران خۆیان بوارد و لە سەر ڕاگرتنی ئەرتەشیان لە ئازەربایجان پێیان دادەگرت. تەقەلای ڕەسمی و دیپلۆماتی و تێکۆشانی کۆمەڵی نەتەوە کانیش بۆ چوونە دەری ڕووسەکان لە ئێران بێفایدە بوو. تا وای لێهات من هەنگاوم ناو فەرمانم دا بە فەرماندەکانی ئەرتەشی ئەمریکا کە هێزەکانی زەمینی و دەریایی و هەوایی ئامادە بکەن. ستالین لەو فەرمانە ئاگادار کرد. ئەو دەم ستالین هەر ئەو کارەی کرد کە من چاوەڕوانی بووم. ئەو ئەرتەشییەکیتی سۆڤیتی لە ئێران بردە دەرێ...» (٣٤)

دەوڵەتانی ئەمریکا و ئینگلیز بێجگە لەوە کە قەوام السلطنەیان وەک سەرەک وەزیری ئێران بۆ هێنانە کۆڕی مەسەلەی چوونە دەری ئەرتەشی سۆڤێت لە کۆمەڵی نەتەوە یەککگرتوەکان هاندەدا، حەمە ڕەزاشاشیان پاڵ پێوە دەنا کە دەست بخاتە ناو کاروباری دەوڵەت و فێری سەرە ڕۆیی و ملهوڕیان دەکرد.

«... محەمەد ڕەزا بۆ چوونە دەری هێزەکانی سۆڤیت لە ئێران بە دایمی لە گەڵ نوێنەرانی ئینگلیز و ئەمریکا لە پێوەندی دابوو، دیار بوو ئەمریکاییەکان پێشنیاریان پێکرد بوو کە دەوڵەتی ئێران نوێنەرێک بۆ کۆڕی نەتەوەی یەککگرتوەکان بنێرێ و مەسەلەی نە چوونە دەری ئەرتەشی رووس لە شۆرای ئەمنیەت بێنێتە گۆڕێ. محەممەد ڕەزا پێشوازی لەم پێشنیارە کرد و حوسێنی عەلای نارد کە چەند

جار ببوه وەزیری دەربار و جارێکیش ببوه سەرەک وەزیر. ئەمریکا کە نەخشی سەرەکی هەبوو دەوڵەت و ڕێکخراوەکانی سەر بە خۆی هاندەدا کە پشتی هەڵویستی ئێران بگرن. ڕۆژێک محەممەد ڕەزا بە منی گوت: بە خۆشیەوە ئەم سەر کۆمارەی ئەمریکا( ترومەن) زۆر بە توندی لە گەڵ رووسان قسەی کردوه و وتەدچێ ئەگەر رووس پێ رووبی نەکەن، هێزەکانیان لە ئێران بەرنە دەرێ. هەر چۆنێک بێ کار گەیشتە ئەم جێگایە کە نوێنەری ئەمریکا لە کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتوەکان ئولتیماتوم بدا بە سۆڤیت کە ئەگەر لە تاریخێکی دیاریکراودا هێزەکانیان لە ئێران نەبەنە دەر، کار دەگاتە شەڕی سێیەمی دنیا گر، لەو شەڕەشدا سەر کەوتوو ئەمریکایە کە لە شەڕی دووەمدا زۆر هەستی بە هیلاکی نەکردوه، لە کاتێکا یەکێتی سۆڤیتی پتر لە هەموان لەم شەڕەدا هیلاک بوه. نەتیجەی فشاری ئەمریکا ئەوە بوو کە رووسەکان لە خاکە لێوەی ۱۳۲۵ هەشت لەشکری خۆیان لە ئێران بردە دەر و حکوومەتی دەستنێژیان لە ئازەربایجان بە جێهێشت...»(۳۵)

ڕۆژی ۲٤ی مانگی مارس کە شورای ئەمنیەتی کۆڕی نەتەوە یەکگرتوەکان دەبوایە کۆ بێتەوە و لە شکایەتی ئێران بکۆڵێتەوە، ڕادیوی مۆسکۆ خەبەری چوونە دەری هێزەکانی سۆڤیتی لە ئێران بڵاو کردەوە، بە دوای ئەودا دەوڵەتی سۆڤیت بە دەوڵەتی ئێرانی ڕاگەیاند کە ئەرتەشی سوور تا شەشەمی مانگی مای بە تەواوی ئێران بە جێدەڵێ.

هاوکات لە گەڵ ڕاگەیاندنی دەوڵەتی سۆڤیت، پێنجەمی ئەپریلی ۱۹٤٦ خەبەری ئیمزا کردنی ڕێککەوتنامەی نێوان باڵیۆزی سۆڤیت لە تاران و سەرەک وەزیری ئێران بڵاو کرایەوە. دەقی بەیاننامەی هاو بەشی ئێران و سۆڤیت بەم جۆرەی خوارەوە بوو:

«...وتو وێژێکی کە لە لایەن سەرەک وەزیری ئێرانەوە لە مۆسکۆ لە گەڵ سەرۆکانی دەوڵەتی یەکێتی کۆمارەکانی سۆڤیتی دەستپێکرا بوو، پاش هاتنی باڵیۆزی سۆڤیت لە تاران درێژەی پێدرا. لە ۱٥ی فروردینی ۱۳۲۵، ڕێکەوتی

چوارەمی ئەپریلی ١٩٤٦ بەئاکام گەیشت و لە سەر ئەو مەسەلانە ڕێک کەوتن :

١- هێزەکانی ئۆردووی سوور لە ٢٤ی مارسەوە تا ماوەی یەک مانگ و نیو تەواوی خاکی ئێران چۆل دەکەن.

٢- قەراردادی پێکهاتنی شەریکەیەکی تێکەلاوی نەوتی ئێران و سۆڤیێت و هەل و مەرجی وەکار کەوتنی ئەو لە ٢٤ی مارسەوە تا ماوەی حەوت مانگ، بۆ پەسند کردنی پێشنیار دەکرێ بەپارلمانی یازدەهەم

٣- سەبارەت بە ئازەربایجان چونکە مەسەلەیەکی خۆ جێییە، تەرتیبێکی هێمنانە بۆ ئیجرای ئیسلاحات بە گوێرەی قانونەکانی مەوجود و بە گیانی خێرخوازی سەبارەت بە خەلکی ئازەربایجان لە نێوان دەولەت و خەلکی ئازەربایجاندا بەڕێوە دەچێ. سەرەک وەزیری دەولەتی شاهەنشاهی ئێران احمد قەوام. بالیۆزی دەولەتی یەکێتی کۆمارەمانی سۆڤیێتی سۆسیالیستی سادچیکۆف»(٣٦)

قەوام السلطنە بە زیری و فێل و تەردەستی و بە چاو لێداگرتنی دەولەتانی ئینگلیز و ئەمریکا توانی خۆ بکاتە جێگای بڕوای سۆڤیێتیەکان و بە بەشدار کردنی ٣ ئەندامی حیزبی تودەی ئێران لە دەولەت دا، حیزبی تودەش فریو بدا و فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان بە رەسمی بناسی و لە گەلی بکەوێتە گفتگۆ. لە ئەنجامی وتو وێژی نێوان دولەتی ناوەندی و فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان لە مانگی یونی ١٩٤٦ ڕێککەوتنامەیەکی ١٥ مادەیی لە نێوان پێشەوەری سەرۆکی فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان و موزەفەر فەیروز یاریدە دەری سیاسی سەرەک وەزیری ئێراندا واژۆ دەکرێ کە بە هیچ جۆر باسی کوردستان و بزووتنەوەی کوردی تێدا نیە. ( بڕوانە کەریمی حسامی ، پێداچوونەوە، ١٩٩٦)

تا ئێرە بە کورتی نەخشی دەولەتی ئەمریکا بۆ لە بەینردنی بزووتنەوەی کوردستان و ئازەربایجان باسکرا، رەنگە تا رادەیەک ئەوەشمان بۆ روون بوو بێتەوە کە مەسەلەی کورد و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان چۆن کراوەتە پاشکۆی ئازەربایجان و بە ئاگری ئەوەوە سوتاوە. بەلام دەولەتی ئینگلیز.؟

ئینگلیزەکان هەر چەندە لە شورای ئەمنیەت و لە سیاسەتی جیهانیدا بە تەواوی لە گەڵ ئەمریکا هاو دەنگ بوون، بەلام بۆ لە بەینبردنی بزووتنەوەی ئازەربایجان و کوردستان ئەوان پیلان و نەخشی تایبەتی خۆیان هەبوو. بەشداری نوێنەرانی حیزبی تودەی ئێران لە دەوڵەتی قەوام و پێکهێنانی حیزبی دیموکراتی قەوام و راکێشانی بڕوای سۆڤێت بە قەوام و ناسینی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان ( کە هەمووش هەر فێڵ و فریودان بوو) ئینگلیزەکانی والێکرد کە بە هۆی بەکرێگیراو و پیاوەکانی خۆیانەوە، بکەونە کار و ( نهضت جنوب) ساز بکەن. بزووتنەوەی جنوب کە ساختە و دەستکردی ئینگلیز و هەمەرەزاشا و ستادی ئەرتەشی ئێران بوو، راستەو خۆ بۆ لێدانی بزووتنەوەی کوردستان و ئازەربایجان ساز کرابوو.«..... لە نێوەراستی مانگی خەرمانای ١٣٢٥ جمو جۆڵێکی ئاژاوەچیانە لە لایەن عەشایری قەشقایی، بەختیاری، بویر ئەحمەدی و حیات داودی لە باشور و خوارووی رۆژئاوای ئێران دەستپێکرا. لە نێوان عەشایر و هێزەکانی ئێران پێک هەڵپڕژان ساز بوو. رۆژی ٢٩ی خەرمانان ناسرخانی سەرۆکی عیلی قەشقایی بە تێلگراف بە سەرەک وەزیری راگەیاند: کە خەڵکی باشور وعەشایر بۆ وەدەستهێنانی مافی رەوای خۆیان راپەریون. مەسەلەکە وای لێهاتوە کە ناتوانین پێشی بگرین. ئەگەر تا رۆژی دوو شەمۆ، هەوەڵی رەزبەری ١٣٢٥ تەکلیفی لێبڕاو دیاری نەکرێ، هەر کارەساتێکی روو بدا، لە بەرانبەر ویژدان و مێژوو دا ئێمە سەر کۆنە ناکرێین. ناسرخان پاش تازە کردنەوەی ئیرادەت بە سەرەک وەزیر ئەم داخوازانەی خوارەوەشی داوا کردبوو:

١- وەدەرنانی وەزیرانی حیزبی تودە لە کابینە و گۆرینی سەرۆکانی ناسالح
٢- ئەسپاردنی کارەکانی لەشکری و کشوەری ئیدارەکانی فارس بە خەڵک
٣- پێکهێنانی ئەنجومەنی ئەیالەتی و ویلایەتی مەڵبەندی فارس
٤- زیاد کردنی نوێنەرانی پارلمان بە پێی حەشیمەتی خەڵک
٥- دانانی پارەیەکی تەواو بۆ ئاوەدانی و کولتور و لەشساخی
٦- چاو خشاندنەوە بەو قانوونە زیانبارانەدا کە ناکۆکن لە گەڵ قانونی ئەساسی

٧- لکاندنی ڕێگای ئاسنی ناوەندی بە شیراز و بو شهر وقیرتاوی جادەکان.

دەوڵەت بۆ پێڕاگەیشتنی کارەکان سەر لەشکر زاهیدی ناردە شیراز. قەوام داوای لە ناسرخان کرد بۆ گفتگۆ بێتە تاران. ناسرخان لە وەڵامی قەوام دا لە گەڵ پێدا گرتن لە سەر ئیرادەت و بڕوا بە قەوام ڕایگەیاند: لە بەر ئەوەی چوار مانگە ویستی خەڵک پشت گوێ خراوە، منیان مەجبور کردوە کە بێمە شیراز. تکا دەکەم تا کار خەراپ نە بوە، سەرنجی ویستی خەڵک بدرێ. خەڵک دەڵێن لە وڵاتێکدا نابێ فەرق و جیاوازی هەبێ و بە دوو چاو سەیری میللەت بکرێ.

ڕۆژی ٣ ی ڕەزبەری ١٣٢٥ سەرەک وەزیر هەیئەتێکی بۆ گفتگۆ لە گەڵ ناسرخان ناردە شیراز. هەیئەتی ناو براو داخوازی ناسرخانی قەشقایی کە بریتی بوو لە - ئەنجومەنی ئەیالەتی و ویلایەتی، بەشدار کردنی دوو وەزیری مشاور لە ئوستانی فارس لە کابینەدا، گۆڕانی فەرماندەی لەشکر و سەرۆکی ژاندارمەری، بە سەرۆک وەزیر ڕاگەیاند. قوام لە گەڵ هێندێ لە داخوازەکان موافەقەتی کرد. بەڵام عەشایردەستیان بە شەڕ کرد. لە ئانجامدا لە ئەرتەش و خەلک هێندێ کەس کوژران. هێندێ لە دێهات تاڵان کران. ڕۆژی ١٦ ی ڕەزبەر سەر لەشکر زاهیدی هاتەوە تاران و پاش دیدار لە گەل شا و سەرەک وەزیر داخوازی عەشایری تەسلیمی دەوڵەت کرد. قەوام السلطنه سەرەڕای دژایەتی زۆربەی وەزیران، دیسان سەر لەشکر زاهیدی بە دەسەڵاتی تەواوەوە ناردەوە شیراز. زاهیدی بە ناسینی (نهظت ملی فارس) و ڕاپەڕینی ڕەوای عەشایر لە بەیاننامەیەکدا موافەقەتی سەرەک وەزیری لە گەڵ داخوازەکانی خەڵکی فارس ڕاگەیاند...» (٣٧)

ئەو هەرایەی ئینگلیزەکان بە هاودەستی شا و هاو دەنگی نهێنی قەوام السلطنه، بە هێزی عەشایری قەشقایی وبەختیاریەوە لە خوارووی ئێران سازیان کردبوو، بیانووی دا دەست قەوام کە لە مەسەلەی ئازەربایجاندا وەک هەڕەشە بە کاری بێنێ: «...قەوام السلطنه بۆ ترساندنی فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان، بە دەستی خانەکانی قەشقایی نهضتی فارس-ی ساز کرد. بە فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجانی ڕاگەیاند کە ئەگەر بخوازن لە ئازەربایجان دەوڵەتی سەربەخۆ

ئەرتەشی میللی پێک بێنن، خانەکانی قەشقایی -یش ئەم داخوازە دەکەن و دەبێتە هۆی لە بەر یەک بڵاو بوونی وڵات. » (٣٨)

بەمجۆرە قەوامی کۆنە کار و فێڵە زان بە فریو دانی سۆڤێت و حیزبی تودەی ئێران و ساز کردنی ئاژاوە لە مەڵبەندی فارس بە پیلانی ئینگلیز، ڕۆژی ١٤ی ڕەزبەری ١٣٢٥ فەرمانی هەڵبژاردنی دەورەی پازدەهەمی مەجلیسی شورای ملی بڵاو کردەوە. ئەوەش سەرەتای پەلامار دانی ئازەربایجان و سەرکوتکردنی بزووتنەوەی کوردستان و ئازەربایجان بوو.

پەلاماردانی ئازەربایجان و کوردستان بەبیانووی دابینکردنی ڕەوەندی هەڵبژاردنی پارلمان. لە ڕاستیدا بە پشتیوانی ڕاستەو خۆی دەوڵەتانی ئینگلیز و ئەمریکا بوو. بە خۆڕایی نەبوو کاتی ناردنی ئەرتەشی ئێران بۆ ئازەربایجان، جۆرج ئالن باڵیۆزی ئەمریکالەتاران لە وتو وێژێکدا لە گەڵ هەواڵدەری ئینگلیزی ڕایگەیاند: «... بڕیاری دەوڵەتی ئێران بۆ ناردنی هێز بۆ تەواوی ناوچەکانی ئێران بۆ دابینکردنی هێمنایەتی بۆ هەڵبژاردن بە ڕای من بڕیارێکی ئاسایی و بە جێیە..» (٣٩)

قەوام پاش ئەوەی لە پشتیوانی تەواوی دەوڵەتانی ئەمریکا و ئینگلیز دڵنیا دەبێ، ڕۆژی هەوەڵی سەرماوەزی ١٣٢٥ بەیاننامەیەک سەبارەت بە پەلە کردن لە هەڵبژاردن و پاراستنی هێمنایەتی و ئازادی هەڵبژاردن بڵاو دەکاتەوە. بەڵام هەر لەو ڕۆژەشدا، واتە ٢٣ی نوامبری ١٩٤٦ هێزی ئەرتەشی ئێران بە فەرماندەیی سەرهەنگ هاشمی دەگاتە زەنگان و دەست دەکات بە گرتن و کوشتنی ئەندامانی فیرقەی دیموکرات و لایەنگرەکانیان و تالانکردنی ماڵەکانیان.

شایانی باسە کە بە گوێرەی قەراردادی ١٥ مادەیی نێوان فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان و موزەفەر فەیروزی یاریدەری سیاسی سەرەک وەزیری ئێران، حکومەتی میللی ئازەربایجان، ببوو بە ئەنجومەنی ئەیالەتی ئازەربایجان و دوکتور سەلامولای جاویدیش کرا بوو بە ئوستانداری ئازەربایجان. هەر بە دوای ئەم قەرارداد و ڕێک کەوتنە دایە قازی محەممەد کە دەبینێ فیرقەی دیموکرات لە گەڵ

حکومەتی تاران ڕێک کەوتوە و لەو ڕێککەوتننامەشدا باسی حیزبی دیموکرات و بزووتنەوەی کوردستان لە گۆڕێدا نیە، دەچێتە تاران و لە گەڵ قەوامی سەرەک وەزیر وتو وێژ دەکات.«.... لەم وتو وێژەدا کە لە گەڵ سەرەک وەزیر ئەنجام درا، قازی محەممەد داوای پێکهێنانی ئوستانێکی کوردستان دەکا کە لە سنوورەکانی سۆڤیێتەوە تا نوختەیەکی نێوان سنە و کرماشان بگرێتەوە. خۆشی ببێتە ئەستانداری ئەم ئوستانە. وەک دەڵێن قەوام لە گەڵ ئەم پێشنیارە موافەقەتی کردوە بەو مەرجە کە دوکتور جاویدی ئەستانداری ئازەربایجانیش موافەقەت بکا...»(٤٠)

پاش بەیاننامەی سەرەک وەزیر سەبارەت بە ناردنی هێز بۆ ئازەربایجان بۆ پاراستنی هێمنایەتی و ئازادی هەڵبژاردن، ئەنجومەنی ئەیالەتی ئازەربایجان لە تێلگرافێکدا بۆ سەرەک وەزیر دەنووسن : «..... بە گوێرەی ڕێک کەوتنامەی ٢٣ی خردادی ١٣٢٥( یونی ١٩٤٦) لەشکری ئازەربایجان بەشێک لە ئەرتەشی ئێرانە. هێزی ژاندارمەری ئازەربایجانیش بە گوێرەی پەیمانی ناوە براو پێکهاتوە، کە وابوو ناردنی هێز بۆ ئازەربایجان هیچ بە پێویست نازانرێ. جگە لەوە لە کام ولاتی مەشروتە لە هەڵبژاردندا هێز بۆ شارستانەکان دەنێرن. ناردنی هێز بۆ ئازەربایجان بە مانای ڕاگەیاندنی شەڕە دژی بزووتنەوەی ئازەربایجان. لە بەر ئەوەی هاتنی هێزی دەوڵەتی هێمنایەتی ئازەربایجان تێکدەدا، ئێمە ناردنی هێز بە باش نازانین. ئەگەر بەراستی جەنابی ئەشرەف نیەتی باشتان هەیە، دەتوانن چەند پشکنێر بنێرن تا بە گوێرەی مادەی ٣٧ی نیزامنامەی هەڵبژاردن ئەرکی خۆیان بە جێبگەیێنن.»(٤١)

دیارە قەوام بە گوێرەی نەخشەیەکی کە کێشا بووی، گوێی نەدا بەو تێلگرافە و ئەرتەشی ئێرانی نەک بۆ پاراستنی هێمنایەتی هەڵبژاردن، بەڵکوو بۆ سەر کوتکردنی بزووتنەوەی ئازەربایجان و کوردستان و کوشتاری ئازادیخوازانی کورد و ئازەری بەرەو ئازەربایجان خستە ڕێ و بە بێ بەربەرەکانی دەسەلاتی حکومەتی تارانیان بە سەر ئازەربایجان و کوردستاندا سەپاندەوە.

دوای شکانی بزووتنەوەکانی کوردستان و ئازەربایجان و تا ئێستاش ئەم پرسیارە مێشکی خەڵکی بە خۆوە خەریک کردوە و وەڵامەکەشی هەر وا لە تەم و مژی بێ بەڵگەیی و ناتەواویدا ماوەتەوە کە: راستە ئەرتەشی سۆڤیێت کوردستان و ئازەربایجانی بە جێهێشت و نەیتوانی لە بەرانبەر فشاری ئەمریکادا خۆ رابگرێ، سەرۆکەکانی فیرقەی دیموکرات ئازەربایجانیش بێ تەقە و بەربەرەکانی رایان کرد و خۆیان گەیاندە ئازەربایجانی سۆڤیێتی و ٢٥ هەزار کوژراوی فیداکار و زەحمەتکێشیان لە دوای خۆیان بەجێهێشت. ڕاستە ڕێبەرانی کۆماری کوردستان سەبارەت بە سوێندی وەفاداریان بە نیشتمان و بە نەتەوەیان وڵات و گەلیان بە جێ نەهێشت و لە ڕێگای ئامانج و ئاواتی ئازادی و رزگاری کوردستان بە سەر بەرزی چوونە سەر دار و بوون بە جێگای شانازی نەتەوەی کورد، بەڵام ئەم داخ و ئەو بیر و بۆچوونەش لە مێشک و هزری خەڵک ناچێتە دەر کە بۆ چی کوردستان لە بەرانبەر ئەرتەشی ئەو دەمی ئێراندا کە بە ڕاستی لەشکرێکی چەپرەک و بێ توانا و بە قەولی فارسان (یک ارتش پوشالی) بوو، بەربەرەکانی نەکرد؟ پێشەوای نەمر قازی محەممەد لە هەوەڵی ژوئینی ١٩٤٦ لە وتو وێژێکدا لە گەل هەواڵدەری فەرانسە دەڵێ: «...ئەگەر فەرمان بدەم ٢ تا ٤ رۆژ بەسە تا ٤٠ هەزار شەڕ کەری کە لە بەر دەستم دان( بێجگە لە ئەفرادی زەخیرە) بگەنە کرماشان، واتە گرنگترین شاری کورد نشین و ناوەندی دامەزراوەکانی نەوت. بەڵام من بۆ پێشگری لە خوێنرێژی نێوان برایان لە هیچ تێکۆشانێک دریخی ناکەم، کوردەکان لەم کارەدا قەت دەست پێشخەر نابن...» (٤٢)

لە مێژوودابریا و خۆزیا دەرد دەرمان ناکەن و رەنگە لە نووسینیشدا باو نەبێ، بەڵام خۆزیا پێشەوا وەک رەمزی بزووتنەوەی نەتەوایەتی حەماسەی بەربەرەکانی خوڵقاند بایە و تەسلیمی دوژمن نەبوو بایە. مێژوو جۆرێکی تر قەزاوەتی دەکرد.

بەربەرەکانی هێزی لێقەوماو و بێ دەرەتانی بارزانیەکان بە سەرۆکایەتی بارزانی نەمر دوای تێکچوونی کۆماری کوردستان، نیشانیدا کە ئەگەر کۆماری کوردستان بەربەرەکانی کردبایە، ئەرتەشی پوشاڵی ئێران نەیدەتوانی هەروا بە هاسانی بە

سەر چارەنووسی خەڵک و کوردستاندا زاڵ بێت. بیرو ڕای جیاواز لە سەر ئەم مەسەلەیە هاتوونە دەربڕین و نووسراون. ئێمە هێندێ لەو بیر ورایانە لێرەداباس دەکەین هەر چەند لەوانەش نیە کە سوکنایی بە هەست و تێفکرینی خەڵک بێنن و بە تەواویش ڕوونی بکەنەوە کە بزووتنەوەی کوردستان و ئازەربایجان بۆ چی وا بێ بەرگری و دەستکردنەوە پاشەکشەیان کرد وبۆ چی یەکێتی سۆڤیەتی پشتی لەو بزووتنەوە بیشتمانیانە کرد و بە قەزاو قەدەری ئاسپاردن.؟

«..... شەڕ کە تەواو بوو ئەمریکا و ئینگلیز زەختێکی زۆریان خستە سەر سۆڤیەت کە ئەرتەشی خۆی لە ئازەربایجان بەرێتە دەر. شووروی بە تایبەت پاش مەسەلەی بومی ئاتومی، ناچار بوو بە ئاشکرا پاشە کشە بکات تا مەترسیی بۆمبای ئاتومی لە سەر خۆی لابەرێت. چرچێل لە فۆلتن ئەو وتارە مێژوویەی بەرەڵا کرد و گوتی : «..فاشیزممان لە بەین برد. ئێستا دەبێ هێزەکانمان بۆ سەر کوتکردنی سۆڤیەت کۆ بکەینەوە». ئەم وتارە ڕاگەیاندنێکی شەڕی سارد بوو. ترومەن - یش بە رەسمی بە بومی ئاتومی هەرەشەی لەسۆڤیەت کرد. بەم چەشنە سۆڤیەت لە یونان و لە ئێران مەجبور بوو بکشێتەوە و لە یارمەتی بزووتنەوەکانی ئەم ناوچانە دەست هەڵگرێ...... ئەگەر فیرقە بەربەرەکانی کردبایە، ئەنجامەکە وەحشەتناکتر دەبوو. ئەمریکا زۆر ملهوڕی کرد. جەبهەی جیهانی دژی سۆڤیەت پێکهاتبوو. سۆڤیەت لە باری ئابوورییەوە لە خەرابترین بار و دۆخ دابوو. نەیدەتوانی یارمەتی بکا. لە هەل و مەرجێکی ئاوادا بە بێ یارمەتی سۆڤیەت لە بەرانبەر فشاری ئەمریکادا بەبەرەکانی نەدەکرا. ڕاست وەک یونانی لێدەهات. لە یونان پاش یارمەتی بڕینی سۆڤیەت، کۆمونیستەکان بەربەرەکانیان کرد. دەوڵەتانی ڕۆژئاوا دیتیان کار ناچێتە پێش، هێزی نیزامیان دابەزاند. ئەرتەشی ئینگلیز هاتە یونان و هەموو شتێکی سەر کوت کرد. لە ئێرانیش هەر وای لێدەهات. ئەمریکا و ئینگلیز ئەوەندەیان هێز دەدا بە شا کە هەموو شت لە بەین بەرێت. لە کوردستان بناخەی جەماوەری وخەڵکیی لە ئازەربایجان پتەوتر بوو. ناڵێم تەواو جەماوەری بوو، و سۆڤیەت نەخشی نەبوو. بەڵام زۆر لە ئازەربایجان جەماوەریتر بوو. ئەرتەشی شا

ئەم کوشتارە دڕندانەی کرد.

قازی محەممەد وئەوانیتری ئیعدام کرد. مەلا مستەفا بارزانی زۆر جوان بە سەر چیا سەرکەشەکاندا خۆی گەیاندە ئازەربایجانی سۆڤیەتی. لە وێ زۆر خەراب لە گەڵی بزووتنەوە...» (٤٣)

سەرهەنگ غلامرضا نجاتی کە بە درێژی لە کتێبی خۆیدا لە مەسەلەی ئازەربایجانی کۆڵیوەتەوە دەنووسێ :«..... دەوڵەتی شووروی پاش ئەوەی مەجبور بوو ئێران چۆل بکا، پاش ڕێک کەوتن لە گەڵ دەوڵەتی قوام و بەستنی ڕێککەوتنامەی نەوتی شیمال، ئێتر لە سەر ئازەربایجان حیسابی نەدەکرد. بەڵکوو خەریکی باشکردنی پێوەندی خۆی لە گەڵ دەوڵەتی ئێران و لایەنگری ڕێکخستن و چارە سەر کردنی هێمنانەی مەسەلەی ئازەربایجان بوو بەو هیوایە کە مەجلیسی پازدەهەم لایحەی قەرار دادی نەوت پەسند بکا. ستالین پاش چوونە دەر لە ئازەربایجان ئێتر نەوتی دەویست نەک ئازەربایجان.

دەگوترێ کە ئەگەر دیموکراتەکان لە بەرانبەر هێزەکانی دەوڵەتی بڕیاری بەربەرەکانیان دابایە، هێزەکانی ئەرتەش بە هاسانی نەیاندەتوانی لە قافلانکو تێپەڕن. سۆڤیتیەکان بە پیشەوەریان گوتبوو بەربەرەکانی نەکەن. لە ڕۆژەکانی ١٦و١٧ی سەرماوەز، مەعموورەکانی نیزامی و سیاسی دەوڵەتی شوورەوی کە لە فیرقەی دێموکرات و دەزگای پێشەوەریدا خزمەتیان دەکرد، دەستیان کرد بوو بە خۆ کۆکردنەوە و چوونە دەر لە ئێران. پیشەوەری بەر لە هەموان ئێرانی بەجێهێشت. ڕۆژی ٢١ی سەرماوەز محەممەدی بیریا بەیاننامەی کومیتەی ناوەندی فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجانی سەبارەت بە بەرگری و بەربەرەکانی نەکردن لە بەرانبەر هێزەکانی دەوڵەتیدا بڵاو کردەوە. بە دوای ئەم بەیاننامەیەدا هەزاران کەس لە دێموکرات و لایەنگرانیان لە ڕێگای ئەرەند و جلفا وە، لە چۆمی ئاراز پەڕینەوە و ڕایانکردە خاکی شوورەوی.

گرنگترین هۆیەکانی شکانی فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان و تێکڕوخانی یەکشەوەی ئەو، بەستراوەیی بێ ئەملاولای پیشەوەری و ڕێبەرانی ئەو ڕێژیمە بوو

به دەوڵەتی شورەوی. ڕێبەرانی فیرقەی دیموکرات بۆ ئاسایش و بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی خەڵکی ئازەربایجان هەنگاوی گرنگیان هاویشتبوو. بەڵام توشی خەتا و هەڵەی گەورە ببوون. لە هەموانیان گرنگتر گوێ ڕایەڵی لە شورەوی و دروشمی جیا بوونەوەی ئازەربایجان لە ئێران بوو. ئەم ئاوازە شومە لە لایەن میللەتی ئێرانەوە قبوڵ نەدەکرا. هەر بۆیەش دوای ئەوەی شورەوی هێزی نیزامی خۆی لە ئێران بردە دەر و دەستی لە پشتیوانی فیرقەی دیموکرات هەڵگرت، سەرۆکەکانیان بە بێ کەمترین بەربەرەکانی لە بەرانبەر ئەرتەشی ئێراندا هەڵاتن و سەدان کادر و نیزامیان بە جێهێشت کە بە فەرمانی ئەوان لە مەتەرێزەکاندا ئامادەی بەر گری بوون. زۆر لەوانە و هەر وەها دەستەیەک لە ئەفسەر و دەرەجەدارانی نیشتمانپەروەری ئەرتەش کە بە مەبەستی ڕزگاری ئێران لە ژێر دەسەڵاتی ئیستعمار و خەبات دژی دەوڵەتی دەستنێژی ئینگلیز و شەریکەی نەوت چوو بوونە ئازەربایجان، کەوتنە داو، وبە حوکمی دادگای داتاشراوی نیزامی و بە فەرمانی شا ئیعدام کران.

ڕێبەرانی حیزبی تودەش بە پشتگرتنی بێ مەرج لە فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان و فەرمانبەرداری بێ ئەملاولای شورەوی، نیشانیان داکە دەیانەوێ چارە نووسی ئێران لە دەرەوەی سنوورەکانی نیشتمان دیاری بکرێت. بەم جۆرە بڕوای خەڵکیان لە دەست دا و تووشی شکانی گەورەی سیاسی و ئەخلاقی بوون. پاش هەرای ئازەربایجان، فیرقەی دیموکراتی کوردستانیش تووشی هەمان چارە نووس بوو. شاری مەهاباد، ناوەندی حیزبی (کۆمەڵە)خێرا لە لایەن ئەرتەشەوە گیرا. قازی محەممەد و سەدری قازی و سەیفی قازی لە سەرۆکانی فیرقە گیران وپاش محاکەمەیەکی کورت لە دادگای نیزامیدا، لە دار دران..» (٤٤)

ئەنوەرخامەیی لە لێکدانەوەی ڕووداوەکانی کوردستان و ئازەربایجاندادەنووسێ:

«.... لەو سەردەمەدا سیاسەتی دەوڵەتی سۆڤیێتی لەئێراندا لە دوو سەرچاوەی جیاوازەوە ئاوی دەخواردەوە. یەکیان وەزارەتی دەرەوە و دەزگای ناوەندی دەوڵەتی

سۆڤیێت لە مۆسکۆ، ئەوی دەکەیان حیزبی کۆمونیست و دەوڵەتی ئازەربایجانی سۆڤیێتی لە باکۆ. لە بارەی مەسەلە گرنگەکانی جیهانی وەزارەتی دەرەوە و کاربەدەستانی مۆسکۆ بڕیاریان دەدا، بەلام لە بارەی مەسەلەکانی دیکەی وەک ڕەوت و تەشکیلاتی حیزبە و ڕێکخراوەکانی سەر بە سۆڤیێت، وەک حیزبی تودە وفیرقەی دێموکرات و ... دام و دەزگای باکۆ و شەخسی جەحفەر باغرئۆف بڕیاردەری سەرەکی بوون...» (٤٥)

دوکتور قاسملو لە (چل ساڵ خەبات)داهۆیەکانی دەرەکی و خۆجێیی تێکچوونی کۆماری کوردستانی به بۆچوونی خۆی بە درێژی باسکردوە و دەنووسێ : «..... دەبێ ئەو ڕاستیە مێژوویيە بگوترێ کە دەوڵەتی قوام زۆر بە تاکتیک و ژیرانە مەسەلەی ئازەربایجان و کوردستانی چارە سەر کرد. ماوەیەکی زۆر وای نیشان دا کە بۆ ڕێک کەوتن ئامادەیە.... هەمووی ئەوانە بۆ وەدەست هێنانی وەخت بوو. بە تایبەت بۆ ئەوە بوو کە لە پێشدا لەشکری سووری ئێران بە جێ بێڵێ و دەوڵەت بتوانێ خۆی ئامادە بکا بۆ ئەوە لە کاتی لە باردا زەبری خۆی بوەشێنێ. بە خۆرایی نە بوو کە قوام پاش سەر کوتکردنی جوڵانەوەی دێموکراتی ئازەربایجان وکوردستان ناز ناوی حەزرەتی ئەشرەفی لە حەمە ڕەزاشا وەر گرت. بەلام سەیر ئەوە بوو کە هەر چەند زۆر دیاردەی بەر چاو نیشانەی فێڵبازی و درۆزنی کار بەدەستانی دەوڵەتی مەرکەزی بوون، بەڕێوە بەرانی حیزبی دێموکراتی کوردستان دیسان تا سەر باوەڕیان بە هێندێک بەڵێنییەکانیان هەبوو. بێگومان لە پێکهێنانی ئەم خۆش بینیە بێ جێیەدا سەبارەت بە سیاسەتی قوام بەڕێوەبەری حیزبی تودە دەستێکی باڵای هەبوو. قوام نیشانیدا کە پیاوێکی سیاسی زیرەکە. باش دەزانێ مانۆڕ بکا و بێ دژواری توانی بەڕێوە بەرانی ئازەربایجان و کوردستان بەوە قانیع بکا کە گویا دەیهەوێ گۆڕانێکی بنەڕەتی لە ئێراندا پێک بێنێ.

بە داخەوە بەڕێوەبەرانی حیزبی دێموکراتی کوردستان تا ڕادەیەکی زۆر فریوی مانۆڕەکانی قوام- یان خوارد و تەنانەت بۆ وێنە تا ئاخریش هەر چاوە ڕوانی ئەوە

بوون کە لەشکری ئێران دڵخوازانە بانە و سەردەشتیان بۆ بە جێ بێڵێ. کارێک کە هەر گیز نەکرا و چاوەڕوان بوونیشی بێجێ بوو. یان ئەوە کە پاش گەیشتنی لەشکر بە مەهاباد، نە خۆیان شاردەوە و نە خۆیان پاراست. بە راستی پێیان وابوو کە لەشکری شا بەم شێوەیە کە هومایونی ڕایگەیاند پوو کاری پێیان نابێ وهیچیان لێ ناکا.

پێویستە باسی هۆی دەرەوەی ئێرانیش بکرێ. هۆیەک کە لە دەسەڵاتی حیزبی دێموکراتی کوردستان بە دوور بوو. ئیمپریالیزمی ئینگلیس کە لە مێژ بوو نفوزێکی زۆری لە دەزگای دەوڵەتی ئێراندا وەدەست هێنا بوو. ئیمپریالیزمی تازە هاتووی ئەمریکا کە لە شەڕی دووهەمی جیهانی بە هێزتر هاتبوە دەر بە هەموو هێزیانەوە پشتیوانیان لە دەوڵەتی کۆنە پەرستی مەرکەزی دەکرد. هەر دوو دەوڵەتی ئیمپریالیستی دژی پەرە ئەستاندنی جوڵانەوەی رزگاریخوازی لە سەرانسەری جیهان و هەر وەها لە ئێرانیش بوون و پێکهاتنی کۆماری کوردستانیان بە دژی قازانجی خۆیان لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی نێوە راست دەزانی..... دەوڵەتانی ئەمریکا و ئینگلیز بە توندی پشتیوانیان لە دەوڵەتی کۆنە پەرستی مەرکەزی دەکرد. بەڵام بەرانبەر بەوە ئەو پشتیوانیە کە چاوە ڕوان دەکرا لە لایەن یەکێتی سۆڤیێتیەوە لە کۆماری کوردستان نەکرا. ئەمەش خۆی چەند هۆی هەبوو:

یەکەم – ئەوە بوو کە سیاسەتی ئەو دەمەی یەکێتی سۆڤیێتی راتە سیاسەتی سەر دەمی ستالین بە گشتی و لە رادەی جیهانیدا توشی هێندێک هەڵە و لێکدانەوەی چەوت بوو. ئەم سیاسەتە لە ئازەربایجان و کوردستان بە دەست باقیرۆفەوە بە رێوە دەچوو کە پیاوی جێی باوەڕی ستالین و هەمە کارەی ئازەربایجانی سۆڤیێتی بوو. لێکدانەوەی باقیرۆفیش لە سیاسەتی ئەو کاتەی ئێران و لە نیسبەتی هێزەکان دروست نەبوو. بێجگە لەوە هەر وەها کە دیتمان لە جەرەیانی کۆماری کوردستاندا ناکۆکی و ناتەبایی لە سیاسەتی یەکێتی سۆڤیێتی بەرانبەر بە ێیران بەر چاو دەکەوت. مولوتوف کە وەزیری دەرەوە بوو زیاتر قازانجی گشتی یەکێتی سۆڤیێتی وەک وڵاتێکی مەزن لە بەر چاو بوو. هەر بۆیەش مەسەلەی وەر گرتنی ئیمتیازی

نەوتی شیمالی پێ گرنگتر بوو لە دیفاع لە حکوومەتی میللی ئازەربایجان و کوردستان.......

هۆی دووەم ئەوە بوو- کە یەکێتی سۆڤیێتی لە شەڕێکی وێرانکەر رزگاری ببوو. بیست میلیۆن کوشتەی دابوو، سەدان شار وناوەندی سەنعەتی گەورەی خاپور کرابوون. بەرانبەر بەوە ئەمریکا نەک هەر بە هێزتر لە شەڕ هاتبوە دەر، بەڵکوو بە بۆمبای ئەتۆمیش پشت ئەستور بوو. لەو هەل و مەرجەدا یەکێتی سۆڤیێتی بۆ تێکهەڵچوونی نیزامی لە گەڵ ئەمریکا ئامادەیی نەبوو. ئاکامی هەمووی ئەمانە پاسیف و بێ ئەسەر بوونی سیاسەتی سۆڤیێتی لە ئێراندا بوو. بەمجۆرە وەزعێکی تایبەتی هاتە پێش، بەم مانایە کە لە حاڵێکدا ئەمریکا و ئینگلیز زۆر چالاکانە پشتی دەوڵەتی مەرکەزیان گرتبوو، یەکێتی سۆڤیێتی سیاسەتێکی بێلایەن و سەیر کەرانەی گرتە بەر و کۆماری کوردستانی لە پشتیوانی دەرەوەی خۆی بێبەش کرد. ئەمەش هۆیەکی حاشا لێنەکراوی تێکچوونی کۆماری کوردستان بوو. بەڵام هەر وەها کە گوتمان هۆی ئەسڵی نەبوو، ناشکرێ بە هۆی ئەسڵی دابنێین.

وادیارە ئەو کەسانەی کە یەکێتی سۆڤیێتی تاوانبار دەکەن بەوە کە کۆماری کوردستانی بە جێهێشتن چاوە ڕوانی ئەوە بوون کە دەبوا بە هێزی نیزامی دیفاعی لێکردبا. ئەگەر کۆماری کوردستان خۆی بەر بەرەکانی لەشکری کۆنەپەرستی ئێرانی کرد با و ماوەکیش ئەو بەر بەرەکانیە درێژەی هەبا، ئەو کات لە وانە بوو یەکێتی سۆڤیێتیش پشتی کۆماری کوردستان بگرێ و یارمەتی بدا. بەڵام کە کۆماری کوردستان هیچ بەر بەرەکانی و دیفاعێکی لە خۆی نەکرد، لەو حاڵەتەدا دەبوا یەکێتی سۆڤیێتی لەشکری سوور بنێرێتەوە ئێران و دیفاع لە کۆماری کوردستان بکا. بە کورتی دەبوا لەشکری سوور لە باتی پێشمەرگەی کوردستان بۆ ئازادی کوردستان شەڕ بکا. هەر چەند مێژوو ئەوەیە کە بوە، بەڵام ڕەنگە ئەگەر کۆماری کوردستان دیفاعی لە خۆی کرد با و ماوەیێکیش خۆی ڕاگرتبا وەزع گۆڕا با. لێرەدا پێویستە ئیشارە بە مەسەلەیەکی زۆر گرنگ بکرێ کە بۆ دوا ڕۆژی گەلی کورد ئەهمیەتێکی تایبەتی هەیە. ئەویش دیاریکردنی هێز یان عامیلی ئەسڵی

رزگاری خەڵکی کوردستانە. ئایا حیزبێکی شۆڕشگێڕ دەبێ پشت ئەستور بە کۆمەڵانی خەڵکی خۆی، بە هێزی ماددی و مەعنەوی وڵاتەکەی بێ، یان چاوە ڕوان بێ کە لەشکری وڵاتێکی دیکە بێ و رزگاری بکا.؟...... ئایا نە دەکرا بەرگری لە پێشڕەوی لەشکرێکی ئاوا بکرێ؟ باسی گیر وگرفتەکانی ئەو کاتەی کۆماری کوردستانمان کرد. بەڵام راستیەکی بەر چاو هەیە کە ناکرێ چاو پۆشی لێبکەین. بەریەرەکانی لە گەڵ لەشکری شا بۆ دیفاع لە دەستکەوتەکانی کۆماری کوردستان ئەگەر سەریش نە کەوتبا، هەر نەبێ ڕێ و ڕەسمی خەراپی ئاش بەتاڵی دانەدەمەزراند و گیانی خەباتگێڕیی بە هێز دەکرد و بێگومان ئاسەوارێکی شۆڕشگێڕانەی لە سەر دوا رۆژی جوڵانەوەی دیموکراتی و نەتەوەیی گەلی کورد بە جێ دەهێشت...» (٤٦)

وەک پێشتریش ئاماژەی بۆکرا هەرچەند لە شیکردنەوەی هۆیەکانی پاشەکشە و تێکچوونی کۆمارەکانی کوردستان و ئازەربایجان دا، سیاسەتی دژایەتیکردنی دەوڵەتانی ئینگلیز و ئەمریکا و بێ ئەولی و پشت تێکردنی دەوڵەتی سۆڤیێتی بە هۆی سەرەکی دادەنرێ، بەڵام ناکرێ لێنەهاتوویی و نە بوونی ئیرادەی شۆڕشگێڕی و بێ بڕیاری ڕێبەرانی بزووتنەوە لە بارەی بەرگری و ئامادەکردن و ماندانی خەڵک بۆ پاراستنی دەستکەوتەکان لەبەر چاو نەگیرێ.

ئەوەی بەسەر کوردستان و ئازەربایجان هات، هۆیەکەی هێز و توانای ئەرتەشی شپرێوی حکوومەتی تاران نەبوو، بەڵکوو دەکرێ بە بەرچەمی بێ ئیرادیی و لاوازی و خزر و کردەوەی ڕێبەرانی بزووتنەوە حیساب بکرێت.

لە کۆتایی ئەم باسە دا دەمەوێ تکای لێبووردن لە خوێنەرانی بە ڕێز بکەم لە وە کە مەبەستی سەرەکی ئەم بەشەی نووسینەکە، باسی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە کوردستانی ئێران و کۆماری کوردستان بوو. بەڵام بە قەولی نوشیروان مستەفا، کۆماری کوردستان رەها کەوتبوە سەبەتەی ئازەربایجانەوە» نە دەکرا وا بەهاسانی لەم سەبەتە بێتە دەر وبە جیا بکەوێتە بەر باس و توێژینەوە. هەر وەک لە توێی باسەکەدا هاتە گۆڕێ، بە ڕاستی کوردستان لە مەسەلەی ئازەربایجاندا توا

بۆوە، چـارو بار بە هەڵکەوت نەبا هـەر ناوی نەدەهات. هەر ئەوە وایکرد کـە دەوڵەتانی ئینگلیز و ئەمریکا بۆ داپۆشینی مەبەستی دوژمنکارانەی خۆیان لە گەڵ مەسەلەی کورد و کۆماری کوردستان ، مەسەلەی کورد ببەستنەوە بە ئازەربایجان و بیکەنە قوربانی سیاسەت و بەرژەوەندی خۆیان. بزووتنەوەی کورد و کۆماری کوردستانی ١٩٤٦ بوو بە گەمەی نێوان دەوڵەتانی سۆڤێت و ئینگلیز و ئەمریکا و خەبات و فیداکاری گەلی کورد بۆ ماوەیەکی نادیار لە کاروانی سەروەری و سەرکەوتن دوا خرا.

## سەرچاوەکان:


١-فەرهەنگی دیپلۆماسی، بەرگی یەکەم، رووسی، موسکو ٤٨٩١ ل، ٤١١-٤١٢

٢- بۆ ئاگاداری لە بار و دۆخی ژیانی خەڵکی کورد لە کوردستانی ئێران لە سەردەمی رەزا شادا، بڕوانە: کەریمی حسامی، کۆماری دێموکراتی کوردستان یا خود موختاری ، ١٩٨٦ و پێداچوونەوە بەرگی یەکەم ١٩٩٦

٣- گۆڤاری نیشتمان، ژمارە ١ گەلاوێژی ١٩٤٣، ل ٣

٤ - سەرچاوەی پێشوو

٥- بڕوانە کەریمی حسامی پێداچوونەوە، بەرگی یەکەم ١٩٩٦

٦- ئارچیبالد رۆزڤلت، بە نەقل لە درک کینان؛ کوردەکان و کوردستان، وەرگێرانی برایمی یونسی، ١٣٧٢ ل، ١٨٣- ١٨٦

٧- ئارشیڤی وەزارەتی دەرەوەی روسیای فیدراتیف:ئۆ٣د٣٢٧پ ٣٦٩، ل ٥٨-٥١. وەرگیراو لە گۆڤاری رابوون، ژمارە ٢٣- ١٩٩٨

٩- خاطرات آقابکوف، ترجمه دکتر حسین ترابیان تهران، ١٣٥٧، ل ١٣١-١٣٠

١٠- مرامنامەی حیزبی دێموکراتی کوردستان، ئازەری ١٣٢٤

١١- وتو وێژی پارلمان، تاریخ ٢٤ آزر ١٣٢٤

١٢- گۆڤاری هەڵاڵە، ژمارە ١ .١٩٤٦، ل ٧٠

١٣- ر. کوردستان. ژمارە ١٠، ١٣٢٤/١١/١٥ (١٩٤٦/٢/٤)

١٤- ر. کوردستان ، ١٥ی مارسی ١٩٤٦

١٥- درک کینان، کردها و کردستان، ترجمه ابراهیم یونسی، ١٣٧٢، ل ١٧٥

١٦- نامەی و.م. مۆلۆتۆف بۆ سیمیرنۆف باڵیۆزی سۆڤیت لە ئێران، ژمارە ١٤٢-م ٣١ ئاوگوستی ١٩٤٢ . وەرگیراو لە گۆڤاری (گزنگ) ژمارە ١١-١٩٩٦

١٧- نورالدین کیانوری. گفتگو با تاریخ، ١٣٧٥. ل ١٢٨

١٨- گۆڤاری کوردستان، ژمارە ١ ١٥ی سەرماوەزی ١٣٢٤ ( ١٩٤٥)

١٩- د، عبدالرحمن واسملو، چل ساڵ خەبات ، ١٩٨٥، ل ، ٨١:٨٢

٢٠- روانگەی پێشەوا، گردەوە کۆیی حەسەنی قازی، ١٩٩٤

٢١- ١٢ی شهریور، تاریخچه نهضت دمکراتیک أزربایجان، نشریه شعبه مرکزی تبلیغات تبریز، ١٣٢٥، ل ١٢١- ١٢٢

٢٢و٢٣- نیگلتون، کۆماری ١٩٤٦ کوردستان، وەرگێرانی سەید محەممەدی سەمەدی، ١٣٦٢، ل ١١٠- ١٢١

٢٤- خاطرات نورالدین کیانوری، تهران، ١٣٧١، ل ، ١١٢

٢٥- تلگرام ١٢٣ دوهر جرالد ف.پ. Dooher Gerald f.p. اسناد مهم سیاسی تاریخی، مهدی جعفر نیا، ١٩٤٦-١٩٤٥

٢٦-د. عبدالرحمن قاسملو، سەرچاوەی پێشوو. ل ٩١

٢٧- کەریمی حسامی، پێدا چوونەوە ١٩٩٦، ٢٠٢- ٢٠١

٢٨- د. قاسملو. سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٣-٨٢

٢٩- سرهنگ غلامرضا نجاتی،جنبش ملی شدن صنعت نفت درایران،١٣٦٨ ل ٥٥

٣٠- خاطرات نورالدین کیانوری، سەرچاوەی پێشوو، ل ، ١٣٦- ١٣٥

٣١- رۆژنامەی داد، ٢٦و ٢٨ و ٣٠ فروردین ١٣٢٥

٣٢- گیرالد ویلیار، صعود مقاومت ناپزیر، پاریس، ١٩٦٧ ص ١٥٦، به نقل له

سەرهەنگ غولامرەزا نەجاتی، ل٥٦،

٣٣- بەڵگەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا. سالنامە دنیا ١٣٥٢، ل ٣٦٠

٣٤- سرهنگ غلامرضا نجاتی. سەرچاوەی پێشوو. ل ، ٥٧

٣٥- Truman,HarryS.,Truman speaks,Colombia Press,1960. p.71

٣٦- خاطرات حسین فردوست، تهران، ١٣٧٠ ل ، ١٤٩-١٤٨

٣٧- سرهنگ غلامرضا نجاتی، سەرچاوەی پێشوو ل ٦٠

٣٨- رۆژنامەی رهبر، ٢٢ اسفند ١٣٢٥

٣٩- جعفر مهدی نیا، زندگی سیاسی قوام السلطنه، تهران ١٣٦٥ ل ٢٤٦

٤٠- رۆژنامەی رهبر، ٧ أزرماه ١٣٢٥

٤١- ئارچیبالد رۆزڤلت، میدل ایست جورنال ١٩٤٧، بە نەقل لە کریس کوچرا

٤٢- رۆژنامەی داد، ١١ی أزەرماه ١٣٢٥ تلگاف انجمن ایالتی ازربایجان به نخست وزیر

٤٣- کریس کوچرا، سەرچاوەی پێشوو، ل، ٢١٩

٤٤- نورالدین کیانوری، هەمان سەر چاوە، ل ، ١٣٠- ١٢٩

٤٥- سرهنگ غلامرضا نجاتی هەمان سەرچاوە ، ل ٨٠- ٧٠

٤٦- انور خامەای، خاطرات، جلد دوم،انتشارات هفته،تهران،١٣٦٢ ص٢٣٥

٤٧- د قاسملو، سەرچاوەی پێشوو ل ، ٨٨ -

## ڕیزی ناوەکان

## ز :



## ژ :



## س :



## ش :

## ع :



## ف :



## ق :

## ن :



## و :



## ە :



١٠

## بەرهەمە نووسراوەکانی نووسەر

١- کاروانێک لە شەهیدانی کوردستانی ئێران
٢- وەلامێک، کوردی و فارسی
٣- ڕێنوێنی شەڕی پارتیزانی
٤- ل دەوری ڕێکخراوی لاوانی حیزبی دێموکرات کۆبینەوە
٥- ڕەخنە ولێکۆڵینەوە لە سەر کتێبی حوسێنی مەدەنی
٦-چەن قسەیەک لە گەڵ خەبات
٧- کوردو فەرهەنگی بێگانە
٨- لێکۆڵینەوەی (کورتە باسێک لە سەر سۆسیالیزم) کوردی وفارسی
٩- تایبەتی کۆنگرەی شەشەم
١٠- کۆماری دێموکراتی کوردستان یاخود موختاری
١١- یادی هێمن
١٢- لە پێناو چی دا؟
١٣- یادانەوە
١٤- کروکاش
١٥- سەفەر بۆ کوردستان
١٦- لەبیرەوەری یەکانم بەرگی: ١-٢-٣-٤-٥-٦-٧-٨-٩-١٠
١٧- پێداچوونەوە(مێژووی بزووتنەوەی نیشتمونیی لە کوردستانی ئێران)
١٨- حکایەت کردن یا نووسینی مێژوو
١٩- پێداچوونەوە بەرگی دووەم
٢٠- گەشتێک بە نێو بیرەوەریەکاندا
٢١- کورد لە گەمەی دەوڵەتانی زلهێزو داگیرکەرانی کوردستاندا

## ئەو بەرهەمانەی نووسەر کردوونی بەکوردی

١- دایک - ماکسیم گۆرکی
٢- ژیان و کردەوەکانی لێنین
٣- ئەفسانە کوردی یەکان - ڕۆدینکۆ

٤- زەوی بچوک - برێژنێف
٥- کۆمەڵە چیرۆکی هەڵبژاردە لە ئەدەبی بێگانە
٦- مەسەلەی کورد لە پارلمانی سوید
٧- یسای بنچینەیی ئابوری سۆسیالیستی
٨-حەمە چکۆڵ - ئینجە مەمەدی یاشار کەماڵ
٩- نوسوڵی سەرەتاییەکانی فەلسەفە- ژۆرژ پۆلیستەر
١٠- نامەی گوڵە بارانکراوەکان
١١- رەوشی کوردون - مێژووی ئەردەڵان و بابان
١٢- ئازادی یامەرگ- کازانتزاکیس
١٣- مەسەلەو زارگۆتنی لوری
١٤- رۆژەکانی ئێران - ئارچیباڵد رۆزڤێلت.
١٥- لە کوردستانی عیراقەوە تا ئەوبەری ئاراز

لە کۆتاییدا پر بە دڵ سوپاسی ئەو دۆست و برادەرانە دەکەم کە بە خوێندەوە وراستکردنەوە وبژاری هەڵە و کەم و کورپیەکانی نووسین خۆیان ماندوو کردوە ویارمەتی برایانەیان داوە.